

# باوکان و کوڕان

ڕۆمان

## ئیڤان تۆرگنیێڤ

وەرگێڕانی

خالید فاتیحی

ڕۆمان

# باوکان و کوڕان

نووسینی

**ئیڤان تۆرگنێف**

وەرگێڕانی لەفارسییەوە

**خالید فاتیحی**

**خانەی  موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **باوك و كوڕان**
- **نووسینی: ئیڤان تۆرگنێف**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** خالید فاتیحی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- **تیراژ: ١٠٠٠** دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٩)ی ساڵی (٢٠١٤) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٩٧)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## (١)

ڕۆژی بیستی ئایاری ساڵی ١٨٥٩ بوو. پیرەمێردێکی سی وحەوت یان سی و هەشت ساڵە،کە پاڵتۆیەکی تەسك وخۆڵاوی و شەرواڵێکی دامەیی لەبەردابوو لەسەربالکۆنی پۆستەخانەیەك ڕاوەستابوو، بەسەری ڕووتەوە لە جادەکەی دەڕوانی.پاشان ڕووی بۆلای خزمەتکارەکەی وەرگێڕا، کە تاڵە مووەکانی ژێرچەناگەی سپی ببوون و دووچاوی وردوو گۆنا گۆشتن بوو، پرسی:

- چ بوو(پیووتەر) تا ئێستا هەواڵێك نیە؟

خزمەتکار بەگوارەی شۆڕابەوپرچی چەورکراویەوە، بە هەڵسووکەوتێك کە دەریدەخست کەسێکی بە ئەزموونە بە کورتی وای خۆدەواند کە بێ کەم و کوڕییە، بێ باکانە سەرنجێکی جادەکەی داو گوتی:

- نەخێر گەورەم، هەواڵێك نییە.

- هەواڵێك نییە؟

- نەخێر قوربان.

پیاوە دوای ئەوەی هەناسەیەکی هەڵکێشا، لەسەرنیوتەختێکی بچووك دانیشت و کەوتە بیرکردنەوە.خراپ نییە ئەوتان بەوحاڵەی کەهەیە بەخوێنەرانی خۆشەویست بناسێنم.پیاوە ناوی ( نیکۆلای پترۆڤیچ کیرسانۆف) ە، زەویەکی باشی هەیە، دووسەد جوتیار کە هەموویان ڕەعیەتی ئەون، لەو زەویەدا کاردەکەن.زەویەکەی دەکەوێتە شەست کیلۆمەتری ئەو پۆستەخانەیە.بۆخۆشی دەڵێت ئەو دووهەزاردۆنم زەویەی کە بەپێکهاتن لەگەڵ جوتیارەکاندا توانیویەتی وەدەستی بێنێ.

باوکیشی لە ماوەی شەڕەکانی ساڵی ١٨١٢دا توانیبووی بە پلەی ژەنەڕاڵی بگات،لەگەڵ ئەوەی تەمەنێکی بەکوێرەوەری و بەدبەختی بەسەربردبوو، بە پیاوێکی بیرتیژو خوێندەوار دانەدەنرا، وێڕای ئەوەش بە بنیادەمێکی بەدفەڕ لە قەڵەم نەدەدرا.ئەو بەشی هەرە زۆری دەورانی ژیانی لە ئەیالەتە جۆراوجۆرەکاندا بە فەرمانبەری پلە گرنگ تێپەڕاندبوو،سەرەتا بە پلەی فەرماندەیی تیپ و پاشانیش بە فەرماندەیی لەشکر دیاریکرا.

شوێنی لە دایکبوونی نیکۆلای پترۆڤیچ باکوری ڕووسیا بوو.ئەویش وێڕای براگەورەکەی پاڤێڵ کە دواتر دەربارەی دەدوێین،شێوازی پەروەردەو فێرکردن تا چواردەساڵی لەماڵێ فێرببوو.بە گشتی

دەوروبەری لە سەرپەرشتیارانی کۆلکە خوێندەوار و ئەفسەری بەردەستی ماستاوکەرو بێشەرم و باقی کەسانی لیواو لەشکر پێکهاتبوو.دایکیشی کە تاپێش شووکردنی(گاتا) یان پێدەگوت،لە بنەماڵەی (کولیازینا) بوو،کە دواتر لەگەڵ باوکی زەماوەندی کرد ناویان نا(ئاگاتا کوزمینشوا کیرسانۆڤا).دایکی بەزۆری کلاوێکی تەنك و بچووکی لە سەردەنا،جلوبەرگی ئاوریشمی گرانبەهای دەپۆشی و لە کلێساش لە هەموان زووتر لەخاچ نزیك دەبوەوە.بەدەنگی بەرز قسەی دەکردو کاتێك چەنەی گەرم دەبوو نۆرەی بەکەس نەدەدا.منداڵەکان هەموو بەیانییەك دەبوایە دەستی ماچ بکەن و هەموو شەوێکیش بەرلە نووستن گوێ لەدووعاکانی ڕابگرن.بەکورتی ژیان بەشێوەیەکی گشتی هەرئەوەبوو کە ئەو دەیویست.

نیکۆلای پترۆڤیچ کە بەکوڕی ژەنەڕاڵ لەقەڵەم دەدرا لەجیاتی ئەوەی کە ئازاو دلێربێ،بەلام بەترسنۆك و بێورە دەناسرا.ئەو کەدەبوایە وەکو براکەی (پاڤێل) بچێتەخزمەتی سەربازی،هەرکە نامەی چوونەسەربازیان دایە دەستی،بەهەر فرتو وفێڵێك بوو لاقی خۆی شکاند.بەرهەمی ئەو کارەشی دوومانگ کەوتن لەناو جێگاو شەل بوونی تا کۆتایی تەمەنی بوو. باوکی کە ئەوەی لێدیت لێی هیوابڕاو بوو،ڕێگەی دا لەجیاتی خزمەتی سەربازی بچێتەخزمەتی کاری دەوڵەتییەوە.کاتێك نیکۆلای پێی نایە تەمەنی هەژدەساڵی، باوکی بردی بۆ (پترۆس بۆرگ)و لە زانکۆ ناونووسی کرد.هەر لەهەمان کاتیشدا،پاڤێل قوتابخانەی سەربازی تەواوکرد و بەپلەی ئەفسەری گاردی لیوا دامەزرا. دووبرا پێکەوە لە خانوویەکدا نیشتەجێ بوون.

(ئیلیا کولیازین) کە مامی دایکیان بوو ، کاری گرنگیشی هەبوو،چاودێری ئەو دوو گەنجەی گرتە ئەستۆی خۆی. ژەنەڕاڵیش کە لەوبارەیەوە خەیاڵی ئاسوودە بوو گەڕایەوە شوێنی خۆی و لەگەڵ هاوسەرەکەی ڕۆژگاری دەبردەسەر.جارجاریش،نامەیەك لە باوکەوە دەگەیشتە کوڕەکانی،کە بە خەتێکی شکستە دەنووسراو لە کۆتایشدا واژۆ پڕ لەنەخش و نیگارەکەی (ژەنەڕاڵ پیوتەر کیرسانۆڤ) دەردەکەووت.

لە ساڵی ١٨٣٥نیکۆلای توانی بڕوانامەی دبلۆم لە زانکۆی پترۆس بۆرگ وەربگرێ.هەر لەهەمان ساڵیشدا ژەنەڕاڵ بەهۆی کەمتەرخەمی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکاندا لە سووپا بەخشراو خانەنشین کرا. ژەنەڕاڵ دەستی ژنەکەی گرت و هاتە پترۆس بۆرگ، تا دواساتەکانی تەمەنی لە لای کوڕەکانی بەسەربەرێ،بەلام هێشتا کاری بەکرێ گرتنی خانووی تازەی یەکلایی نەکردبۆوە کە لە یانەی ئینگلیزەکان کۆچی دوایی کرد. دوای ماوەیەك هاوسەرەکەشی کە

نەیتوانی ژیان لەشارێکی قەرەباڵغی وەك پترۆس بۆرگ بەتەنیایی بەسەربەرێ وخـەمی خانەنشـین کردنی مێردەکەشی زۆری ئازار دەدا،هەر دوای مێردەکەی کۆچی دوایی کرد.

لە سەردەمی ژیانی ژەنەراڵ وهاوسەرەکەی،سەرەڕای دژایەتی توونـدیان،نیکۆلای عاشـقی کچی (پریاڤیسکی) بوو. باوکی کچە کە خاوەنی خانووەکەیان بوو،لە فەرمانگەیەکی دەوڵەتیشدا کاری دەکرد.خۆشەویستەکەی نیکۆلای،کچێکی جوان بوو کە بەخوێندنەوەی گۆڤارە زانستییەکان بە یەکێك لە کیژە ڕۆشنبیرو نوێخوازەکانی ئەو سـەردەمە دەژمێردرا.هەرچـەندە لەتازیەباریشـدا بوون، دوو دڵدار پێکەوە زەماوەندیان کرد. دوای ئەوە نیکـۆلای کـە بـاوکی بـەو هـەموو تکـاو ڕاسپاردانەوە کارێکی بۆ پەیدا کردبوو،بە جێی هێشت و لەگەڵ هاوسـەرەکەی چـووە ناوچـەیەکی زۆزانی، لە دەورو بەری فێرگەیەکی پاراستنی دارستان.پاش ماوەیەك لەگەڵ (ماشا) گواسـتییەوە ئاپارتمانێکی بچووك کەمیوانخانەیەکی فێنك و پلیکانەکانی خاوێن بـوون. ڕۆژگـارێکی خۆشـیان دەبردەسەر، بەڵام دوای ماوەیەك نیکۆلای ناچاربوو بگەڕێتەوە گوندەکەی و هەرلـەوێ کوڕەکـەی (ئارکادی) لە دایك بوو.نیکۆلای و هاوسەرەکەی ژیـانێکی خـۆش و ئارامیـان هـەبوو، زۆربـەی کاتەکان بەیەکەوە بوون.پێکەوە کتێبیان دەخوێندەوە، بە چوار دەسـت پیانۆیـان لێـدەداو وێکـڕا گۆرانیان دەگوت. ژنە زۆر حەزی لە باخەوانی و پەلەوەر بەخێوکردن بوو،پیاوەش بەزۆری خەریکی کشتوکاڵ و ڕاوکردن بوو، لەوکاتەدا ئارکادیش وردە وردە گەشەی دەکرد.

دەساڵ بەوشێوەیە بەخێرایی تێپەڕی. لەساڵی١٨٤٧ماشا کیرسانۆڤ، کۆچی دوایی کـرد. ئـەو خەمە هێندە گەورەبوو،کە زۆر زوو قژەکانی نیکۆلای سپی کـرد، بڕیاریـدا سـەفەرێك بـۆ دەرەوە بکات، تا هەرنەبێ کەمێك لەخەمـەکانی کـەم بکاتـەوە، بـەڵام ڕووداوەکـانی سـاڵی ١٨٤٨لـە ئەورووپا وایکرد، لە سەفەرەکەی ژەوان بێتەوە. ناچـاربوو بگەڕێتـەوە گوندەکـەی و دوای ئـەوەی ماوەیەکی بە بێکاری بە سەربرد سەرەنجام دەستیکردەوە بەکاری کشتوکاڵی.

ساڵی ١٨٥٥ ئارکادی لەگەڵ خۆی برد بۆپترۆس بۆرگ و لەزانکۆی ئەوێ ناونووسی کرد.سـێ ساڵ زستانەکانی تەرخانکرد بۆ کوڕەکەی.لە هـاوڕێ کۆنـەکانی دابـڕاو تـەنیا لەگـەڵ کەسـانێك هەڵدەستاو دادەنیشت کە هاوڕێی ئارکادی بوون، بەڵام ئەو زستانەی دوایی نەیتوانی بـوو بچـێتە پترۆس بۆرگ. ئێمە ئێستا ئەو، لە مانگی ئایاری ساڵی١٨٥٩لە حاڵێکدا دەبیبیـنین کـە بەقـژی سپی و بالای تەقریبەن چەماوە چاوەڕێی ئارکادی دەکات.

خزمەتکارەکەی بە نیشاندانی ڕێزو ڕەنگە لەبەر ئەوەش بووبێ کە دوور لەچاوی ئاغـای بـێ، چـووە پشـت دەرگـاو سـەبیلەکەی داگیرسـاند.نیکۆلاّی پترۆڤـیچ سـەری بـەردابۆوەو چـاوی لەپلیکانەڕزیوەکانی باڵکۆنەکەوە بڕیبوو. لە سەر پلیکانەکان جووجەڵەیەکی خـاڵ خـاڵی گـەورە بەئارامی دەسووڕایەوەو بە پێکووتە لەسەر پلیکانەکان، بێدەنگی دەشکاند.پشیلەیەکی کوڵکن و چڵکن بە نیگایەکی دووژمنانەوە خۆی گەیاندە پلیکانەکان.خۆرەتاو گەرم بوو، لـە نێـوان ڕاڕەوی خانووەکەدا بۆنی نانی جۆی دەهاتە بەرلووت.

نیکـۆلاّی کـەوتبووە دەریـای بـیرو خەیاڵـەوە. هەمیشـە بـیری لـەوە دەکـردەوە کـە (کوڕەکەم...خاوەن بڕوانامە...ئارکاشا...). هەولێدا بیر لە شتێکی دیکە بکاتـەوە، بـەلاّم لـەو بیرەدا ڕێگای دەرباز بوون نەبوو، هەندێ جـار بـیری لـە هاوسـەری کۆچـکردووی دەکـردەوەو بـە پەژارەوە لە بەرخۆیەوە دەیگوت: (مخابن کە نەما، تا ئێستا ئارکاشای خۆی ببینێ.)

کۆترێـك لەسـەر زەوی نیشـتەوە و ڕووەو قووڵکـە ئاوێـك ڕۆیشـت کـە لـە پـەنا چـالاّوەکە بوو.دەنگی چەرخان هات، نیشانەی ئەوەبوو کە گالیسکەیەك نزیك دەبێتەوە...

خزمەتکارەکە لەپشتی دەرگا، کەوتە جووڵەو هەرای لێکرد:

گەورەم، دەڵێی جەنابیان هاتن.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ لە شوێنی خۆی دەرپەڕی و لە جادەوە ڕاما، گالیسکەیەکی سێ ئەسپی لـە دوورەوە دەرکەوت، قیافەی ئارکاشا بە کلاّو شەبقەی زانکۆییـەوە نیشـانەی کۆتـایی چـاوەڕوانی بوو.

کیرسانۆڤ بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد: ئارکاشا...ئارکاشا. دەستی ڕادەوەشاند.

دوای ماوەیەك لێوەکانی نیکۆلاّی پترۆڤیچ بەسەر روومەتە لـووس و خۆلاّویـەکانی ئارکـادی یەوە چەسپان.

ئارکادی بە هەناسە سوارییەوە و تێکەڵ بەشادمانی دیداری باوکی گوتی:

- باوکە،لانی کەم ڕێگەم بدە تۆزو خۆڵی جلکەکانم بتەکێنم.من کە سەرتاپای تۆشم پیس کرد!

بەڵام حەزی دیداری ڕۆڵە لەوە زیاتربوو کە نیکۆلای پترۆڤیچ لە بیری ئەوشتانەدابێ.

- گرنگ نییە کوڕم.هیچ گرنگ نییە.بە دەستیشی هەوڵیدەدا تەپووتۆزو خۆڵی یەخەو جلیقەی کوڕەکەی پاك بکاتەوە.پاشان کەمێك بۆ دواوە گەڕایەوەو گوتی:

- لێگەڕێ با تێر لەبەژن و بالآت ڕامێنم.

بە پڕتاو بەرەو کاروانسەرا ڕۆیشت و لە هەمان کاتدا هاواریکرد:

- زووتر ئەسپەکان ئامادەبکەن.

نیکۆلای پترۆڤیچ زیاتر لە کوڕەکەی شڵەژابوو.دەتگوت دەست و پێی خۆی ونکردوون.ئارکادی هێنایەوە سەرخۆی و گوتی:

- باوکەگیان،با هاوڕێکەمت پێبناسێنم.ئەوە هەمان (بازارۆف)ە کە لەنامەکانمدا باسم کردبوو،میهرەبانی ئەو بە ڕادەیەکە کە داوەتی منی قبووڵ کردو قەرارە میوانمان بێ.

نیکۆلای پترۆڤیچ بە پەلە گەڕایەوە لای گەنجێك کە کراسێکی قۆڵ درێژی لەبەردابوو و خەریکبوو لە گالیسکەکە دادەبەزی،چوو دەستە ڕووت و سوورەکانی میوانەکەی لە ناو دەستەکانی خۆیدا ڕێکگووشین:

- لە دیدارت زۆر خۆشحاڵم.زۆرسوپاسی لووتفت دەکەم.سەربەرزت کردین،هیوادارم کە...ئیزن دەفەرموون ناوی تەواوتان بزانم؟

بازارۆف یەقەی جلیقەکەی نووشتاندەوەو بە ڕاوێژێکی پچڕپچڕەوە گوتی:

- (یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ)

نیکۆلای پترۆڤیچ سیمای میوانەکەی لەبەر چاوان گرت.بازارۆف دەم وچاوێکی ئێسقانی و پرچێکی لووس و ناوچەوانێکی پان و چاو سەوزو لووتێکی باریکی هەبوو.بەگشتی ڕووخساری نیشاندەری بڕوابەخۆبوونی خاوەنەکەی دەردەخست.

نیکۆلای پترۆڤیچ خۆشحاڵی خۆی بۆدەربڕی وگوتی:

- هیوادارم کاتێکی خۆش لە ماڵەکەم بەریتەسەر.

لێوەکانی بازارۆف لێککرانەوە بەلاّم وەلاّمێك لەدەمی نەهاتەدەر.تەنیا بۆدەربڕینی ڕێز،کلاّوەکەی لەسەر داگرت.قژە خوورماییە پڕەکەی نەیتوانی ناوچەوانە پانەکەی بشارێتەوە.

نیکۆلای پترۆڤیچ دووبارە گەڕایەوە لای کوڕەکەی وگوتی:

- دەڵێی چی؟حەزدەکەی کەمێك بحەسێیتەوە، یان هەرئێستا وەڕێدەکەوی؟

- هەرئێستا،هەرئێستا...ئەرێ هۆی پیووتەر گوێت لێبوو یان نا؟زووتر پێیان بڵێ ئەسپەکان ئامادەکەن.ئێمە وەڕێدەکەوین،براله.

پیووتەر کەخزمەتکارێکی بەتەربیەت و تێگەیشتووبو بەمەبەستی نیشاندانی ڕێز بۆ کوڕی ئاغاکەی تەنیا لە دوورەوە دەستی بۆ بەسنگییەوە ناو بەوەندە ڕازیبوو و خۆی لە دەست ماچ کردن پاراست و لەپشت دەرگاوە بزربوو.نیکۆلای پترۆڤیچ کە هێشتا هەر شڵەژابوو گوتی:

- من بەداشقەی خۆم دەڕۆم بەلاّم بۆگالیسکەکەی تۆ سێ ئەسپی دابەستە لەو پۆستەخانەیە وەردەگرم.

کاروانسەرادار گۆزەئاوێکی دایەدەستی ئارکادی و ئەویش دەستیکرد بەخواردنەوەی.بازارۆفیش کە سەبیلەکەی داگیرساندبوو بەرەولای گالیسکەچییەکە ڕۆیشت کە خەریکی کردنەوەی ئەسپەکان بوو لە گالیسکەکە.نیکۆلای پترۆڤیچ درێژەی دایە:

- ئارکادی،ڕاستیت دەوێ گالیسکەکەی من دوو کەسیەو هاوڕێکەشت...

ئارکادی هاتە ناو قسەکانییەوە:

- ئەو بە گالیسکە دێت.ئەوەندە خەمی ئەوت نەبێ.ئەو کوڕێکی زۆر باشە.بە هیچ شێوەیەك گوێی لەو شتانە نییە.بۆخۆشت دەیبینی.

گالیسکە چی نیکۆلای پترۆڤیچ ئەسپەکانی هێنان، بازارۆف بەرەولای چوو گوتی:

- واباشە بجووڵێی سمێڵ زل.

گالیسکە چییەکەی دیکە کە لەولاتر ڕاوەستابوو و دەستەکانی خستبوونە ناو گیرفانی پاڵتۆ چەرمییەکەی بەگاڵتەوە گوتی:

- گوێت لێبوو (میتا)؟ کە ئاغا نازناوێکی باشی لێنای،سمێڵ زل!

میتا وەلاَمی نەدایەوە تەنیا بەداگرتنی کلاَوەکەی بـۆی سـەلماندو تەنگـەی ئەسـپەکانی توووندکردنەوە.نیکۆلاَی پترۆڤیچ بە خۆشحالَییەوە هاواریکرد:

- واباشە پەلە بکەین.پارەی عەرەقەکەشتان دەدەمێ.!

دوای کەمێك ئەسپەکان ئامادەبوون.باوك و کوڕە لەناو گالیسکە دانیشتن.پیووتەر لەپاڵ گالیسکەچـی دانیشـت.بازارۆف چـووە نـاو گالیسـکەکەو سـەری خسـتە سـەر سـەرینە چەرمییەکە.هەردوو گالیسکە وەڕێکەوتن.

## (٣)

- سەرەنجام تۆش خوێندنەکەت  تەواوکردو گەڕایەوەماڵێ،تۆ گەڕایتەوە.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ بە شەوقەوە دەستی لەسەر شـان و ڕانـی ئارکـادی دادەنـاو ئەوقسـانەی دووبارە دەکردنەوە.خۆشحاڵیەکی مندالاّنە ئارکادی داگرتبوو،بەلاّم واش حەزی دەکرد بابەتەکە بگۆڕێ:

- مامم چۆنە؟ تەندرووستی باشە؟

- زۆر حەزی دەکرد لەگەڵ مندابێتە پێشوازیت بەلاّم نازانم بۆ یەکسەر ڕایەکەی گۆڕی.

- زۆر چاوەڕوانیت کردم؟

- لانی کەم پێنج کاتژمێر.

ئارکادی بەپەلە بەرەولای باوکی وەرسووڕاو لەکاتێکدا ڕوومەتەکانی ماچ دەکرد، گوتی:

- باوکە،تۆچەندە میهرەبانی.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- خۆزگـە ئـەو ئەسـپانەی بـۆم دانـاوی دەتـدیتن.نازانی چـەندە ئەسـپی باشـن...دیواری ژوورەکەشت بەکاغەزی دیواری ڕەنگاوڕەنگ ڕازێنراوەتەوە.

- ئەدی بۆ بازارۆف؟ ژوورێکیشمان بۆ ئەوهەیە؟

- بۆ ئەویش ژوورێك پەیدا دەکەین.

- باوکە،تکات لێدەکەم زۆر بەباشی میوانداری لێبکە.نازانی هاوڕێیەتی ئەو بۆمن چـەندە بەنرخە.

- تازە یەکتریتان ناسیوە؟

- بەڵێ.

- هەربۆیەبوو کە زستانی پار نەمدیت.لە چ بەشێك خوێندوویەتی؟

- لە بەشی زانستی سرووشتی بەلاّم لانی کەم سەر لەهەموو شتێك دەردەکا.قەرارە سـاڵی داهاتوو دکتۆرا وەربگرێ.

- کەوایە بۆ پزیشکی دەخوێنیٚ.

نیکۆلاٚی پترۆڤیچ ماوەیەك بێدەنگ بوو،پاشان لە کاتێکدا بەدەست شوێنێکی نیشان دەدا گوتی:

- پیووتەر،ئەوانەی بەرەو ئێرە دێن،ڕەعیەتەکانی خۆمان نین؟

پیووتەر ڕووی بەرەو ئەولایە وەرسووڕاند کە ئاغا ئیشارەی بۆکردبوو.بەسەر جادەیەکی باریکدا کەبەرەو لای شاردەکشا، چەند گارییەك دەڕۆیشتن.گاریەکان ئەسپی بیٚ ڕێشمە ڕایان دەکێشا.لە هەرگارییەکدا دوو یان سیٚ جوتیاری بەرۆك ئاوەلاٚی تێدابوو.

پیووتەر وەلاٚمی دایەوە:

- بەڵیٚ گەورەم.خۆیانن.

- بۆ کویٚ دەچن؟بۆشار؟

- واپێدەچیٚ گەورەم.

پاشان ڕووی بەرەو گالیسکە چییەکە وەرگێڕا،واوێدەچوو بۆسەلماندنی قسەکانی داوای کۆمەگ بکات، گوتی:

- دەچنە مەیخانە.

بەلاٚم گالیسکەچی هیچ دژکردەوەیەکی نیشان نەدا.ئەو هیچ قسەیەکی تازەی خەڵکی پەسەند نەبوو.تەنیا ئەوشتانەی پەسەندبوون کەپەیوەندیان بە ڕابردووەوە هەبوو.

نیکۆلاٚی پترۆڤیچ ئاوڕی وەسەر کوڕەکەی دایەوەو گوتی:

- ئەمساڵ دەبیٚ دم بەدمەی زۆر لەگەڵ ڕەعیەتەکان بکەین.ئامادەنین ئیجارەی خۆیان بدەن.ڕاستی نازانم چیان لەگەڵ بکەم.

- ئەدی کرێکارەکانت؟ لەوان ڕازی؟

نیکۆلاٚی پترۆڤیچ لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڵیٚ،کێشەی سەرەکی لێرەدایە کە ئەوانیش فریودەدەن...ئەوانیش وەك ئەوەی پێویستە کاربکەن،نایکەن و زین و لغاوی ئەسپەکان خراپ دەکەن.ئەگەرچی خواهەڵناگریٚ زەویەکانیان زۆرباش کێلاٚوە.بەشێوەیەکی گشتی کارەکان دەچنەپێش.نازانم،تۆش حەزت لەکاری کشتوکاڵییە؟

ئارکادی وەلاٚمی ئەوپرسیارەی باوکی نەدایەوە بەلاٚم گوتی:

- تەنیا نیگەرانی من لە ئێستادا ئەوەیە کەتۆ ساباتێکت درووست نەکردووە.
نیکۆلای پترۆڤیچ گوتی:
- پێویست ناکا خەمی بۆبخۆی،چونکە لەسەر باڵکۆنەکە ساباتێکی گەورەم درووستکردووە.ئێستاش دەتوانی نانی نیوەڕۆ لەو هەوا پاکەدابخۆی.
- بەوشێوەیەی باسی دەکەی،خانووەکە بۆتە خانوویەکی هاوینەهەواری...هەرچەندە ئەوبابەتە هێندە گرنگ نییە.چوونکە ئاوو هەوای ئێرە لە کەم شوێنان هەیە.چ ئاسمانێك!چ هەوایەك...
ئارکادی قسەکانی خۆی بە نیوەچڵی هێشتنەوو ئاوڕێکی دایەوە.
نیکۆلای پترۆڤیچ گوتی:
- بێگومان،چوونکە تۆلێرە لەدایك بووی،دەبێ هەموو شوێنێکی ئێرەت پێباشتربێ.
- نا،باوکە.شوێنی لە دایك بوون هێندە گرنگ نییە.
- لەگەڵ ئەوەشدا...
- نا باوکە.زێد بە هیچ شێوەیەك گرنگ نییە...
هەردووك بێدەنگ بوون.نیکۆلای پترۆڤیچ لە ژێرەوە سەیرێکی کوڕەکەی کرد.دوای نیو کیلۆمەتر ڕۆیشتن، گفتووگۆکان دەستیان پێکردەوە.
- نازانم بۆم نووسیبووی کە دایە(یۆگۆرنا) مردووە یان نا؟
- بەڕاست؟ پیرەژنی بێچارە!...(پرۆکۆڤیچ) چۆنە؟هێشتا هەرزیندوویە.؟
- زیندوو سەری حاڵە.هیچ نەگۆڕاوە.ئێستاش وەکو جاران هەر پرتەو بۆڵەیەتی .بەشێوەیەکی گشتی ئاڵوگۆڕێکی وا لە(مارینا) دا ڕوووینەداوە.
- سەرکارەکەت نەگۆڕیوە؟
- تەنیاکارێك کە ئەنجامداوە گۆڕینی سەرکارەکەم بوو.بڕیارم وایە کەتەنیا جوتیارە ئازادەکان و ئەوکەسانەش کە لە ماڵێ کاردەکەن بگێڕمەوە.یان لانی کەم بەوانە نەبێ، کار بەکەسی دیکە نەکەم.
ئارکادی بە تیلە نیگایەك پیووتەری نیشاندا.نیکۆلای پترۆڤیچ بە زمانی فەرەنسی گوتی:
- لە ڕاستیدا ئەویش ئازادە.
پاشان بەزمانی ڕووسی درێژەی دایە:

- ئەو بەردەستی تایبەتی منە.سەرکارەتازەکەشم،خاوەن زەویەکی بچووکە.لەڕواڵەتدا لە کارەکەیدا شارەزایە.ساڵانە دووسەدو پەنجا ڕۆبڵم بۆداناوە.

نیکۆلای پترۆڤیچ دەستی بە ناوچەوانیدا هێنا،کە ئەوکردارەشی نیشانەی نیگەرانییەك بوو پاشان درێژەی دایە:

- پێم گوتی کە لە مارینا ئاڵوگۆڕێکی وای تێدا ڕوونەداوە،بەڵام باشتروایە ڕاستییەکانت پێ بڵێم...ئەگەرچی باشتر وایە....

بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو.دواتر بە زمانی فەرەنسی گوتی:

- بابای درێژدادڕ پێداگرە،کە ئەو پەیوەندییە گیانی بەگیانییەی منی بەلاوە زیادەو بە پێویستی نازانێ...ئەگەر سەرکۆنەشم کەی کە بەو تەمەنەوە...بەکورتی بڵێم کە...ڕەنگە بزانی کەدەمەوێ دەربارەی کچێك لەگەڵت بدوێم ....حەتمەن هەندێ شتت دەربارەی بیستووە....

ئارکادی زۆر بەڕاشکاوی گوتی:

- مەبەستت (فینیچکا) یە؟

نیکۆلای پترۆڤیچ کەمێك ڕەنگی هێنان و بردن و گوتی:

- تکات لێدەکەم بەدەنگی بەرز ناوی مەهێنە...بەڵێ مەبەستم...ئەولەلای منە.لەماڵەکەی مندا دەژیت.لەوێ دوو هۆدەی بچووکی لێبوون کە...دیارە هەموو ئەوشتانە دەکرێ بیان گۆڕین.

- بۆچی باوکە؟

- ئاخر تۆ هاوڕێکەت داوەت کردووە بۆ ماڵێ و باش نییە کە...

- نیگەرانی بازارۆف مەبە.ئەو زۆر لەوشتانە گەورەترە.

نیکۆلای پترۆڤیچ بە نیگەرانییەوە گوتی:

- لەلای تۆ...عەیبەکە لەوەدایە کە گۆشەیەکی ژوورەکە تەپیوە...

ئارکادی قسەکانی باوکی بڕی:

- تۆ بەردەوام داوای لێبووردن دەکەی.ئەوقسانەچین.!

نیکۆلای پترۆڤیچ لە جاران زیاتر سوور هەڵگەڕاو گوتی:

- بەڵام من پێم شەرمە کە....

ئارکادی بە میهرەبانییەوە بزەیەکی هاتیٚ و گوتی:
- تکات لیٚدەکەم باوکە گیان.ئەوە شتیٚك نییە کە خۆتانی پیٚوە نیگەران بکەن.
لە بەر خۆیەوە بیری کردەوە: لەبەرچی داوای لیٚبووردن دەکات؟
پاشان هەستیکرد لە هەموو کاتیٚك زیاتربـاوکی خـۆش دەویٚـت و هەسـتیٚکی زیـاتری بـۆ ئەوهەیە کە دلٚی خۆشدەکرد.وەك ئەوەی لەنقووم بـوونی ئەوبیرکردنەوەیـەدا چـیٚژیٚکی تایبـەت وەردەگریٚ،بۆیە جاریٚکی دیکە دووبارەی کردەوە:
- تکات لیٚدەکەم خۆتان نیگەران مەکەن.
نیکۆلاٚی پترۆڤیچ کە بەردەوام دەستی بە ناوچـەوانیدا دیٚنا،بـەناو پەنجەکانیـدا سـەیریٚکی ئارکادی کرد، لەناکاو دلٚی داخورپا بەلاٚم وەسەرخۆی نەهیٚناو دوای کەمیٚك، بیٚدەنگی شکاند:
- لیٚرە بەدواوە زەویەکانی خۆمانن.
ئارکادی پرسی:
- دەلیٚی دارستانەکە پیٚشتریش هی خۆمان بووە؟
- بوو،بەلاٚم فرۆشتم.قەرارە هەموو دارەکان ببڕنەوە.
- بۆچی فرۆشتت؟
پیٚویستی زۆرم بەپارە هەبوو.ئەگەر ئەوەم نەکردبا ئەوا سەرەنجام ئەوزەویانـە دەبوونـە هـی جوتیارەکان.
هەرئەو جوتیارانەی کە هەقی خۆت نادەنیٚ؟
- ئەوە ئیتر پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە.بەلاٚم ڕۆژیٚك دیٚ کە بەشی ئاغاش هەربدەن.
ئارکادی سەیریٚکی دەورو بەری خۆیکردو لە بن لیٚوانەوە گوتی:
- حەیف بۆ ئەو دارستانە.
دیمەنەکانی دەوروبەر جوانییەکی ئـەوتۆیان نـەبوو.تا چـاو بڕیـدەکرد خڕودۆلـٚی پـڕپیٚچ و گەوەبوو،دارستانی بچوك و دەشت و بیابان و لەناو دۆلٚەکانیشدا سەوزەگیا سەریان دەرهیٚنـابوو کە مرۆڤی بەیادی ئەوتابلۆیانە دەخستەوە کە لەدەورانی (کاترین) ی گـەورەدا لـەو مەلٚبەنـدە ویٚنەیان کیٚشرابوو.
هەندیٚ جاریش جۆگایەك بە شیٚلەگەی سـەرەو ژیٚـرو ئەسـتیٚرۆك و بـە بەنـداوی بچـوکەوە دەبینران.

هەندێ جاریش بەپەنا گوندی هەژار نشینەکاندا تێدەپەڕین کە بنمیچی زۆربەی کەوێڵەکان تێك تەپیبوون.سەوەی سەرئاوالاو خێچ و خواری ئەوگوندانە کەلە شوولی درەختەکان درووستکرابوون،بە بەتالی لە پەنا خەرمانەکان دانرابوون.کلێسای خشتی وداری کە یان گەچەکانیان لێ ببوونەوە یان خاچە خوارە کانیان لە حالەتی کەوتندابوون،بە دەوری گۆڕستانە وێرانەکەوە دەبینران.ئارکادی دلی داخورپا.دەتگوت ئەو جوتیارانەی کە لەسەر ڕێگا ڕاوەستاون بە ئەنقەست ئاوا ڕووت و ڕەجالن گاوگۆلە مردەلۆژەکانیان بە زۆری هانداوە لە گیای کەنار جۆگاکان بلەوەڕێن.دەتگوت جوتیارەکان و مالاتەکانیان تازە لە قاتو قڕیەکی گەورە ڕزگاریان بووە.سەرگەردانی ئەومالاتانە لەو ڕۆژە خۆشەی بەهاردا،تارمایی و خەفەتی ڕۆژانی زستانی دێناوە یاد.ئارکادی لەبەر خۆیەوە بیریکردەوە:

- نا،ئێرە سەرزەمینێکی پڕ لە بەرەکەت نییە.ئێرە ناتوانێ عەشقی کارکردن لە ناخی کەسدا بڕوێنێ...نابێ ئێرە هەروا پشت گوێ بخرێ...بەلام چۆن دەکرێ ئەوکارەبکەی و لەکوێوە دەستپێبکەی؟

ئارکادی بە قوولی کەوتبووە بیرکردنەوە...بەهاریش هێندە بێدەنگ و هەست نەبوو.لە دەورو بەر هەمووشتێك لە سەوزیدا دەبریسکایەوە.دەوەنەکان،گیاو درەختەکان بە شنەبا ڕادەژان.چریکەی بالندان دەهات.چۆلەکەکان بەجریوەجریو لەو تەپۆلکەوە بۆ ئەو تەپۆلکە هەلدەفڕین.لە ناو ئەو شیناوەردانەی کە لە پایزدا داچێنرابوون،قەلەڕشە دەهاتن و دەچوون و هەندێ جاریش لە ناو وێنجەکاندا بزردەبوون و بەدەگمەن سەریان لە ناو شەپۆلی ئەو سەوزە زارەدا دەر دێنا.

ئارکادی لە سەیرکردن تێرنەدەبوو.هەرزوو بیرە خەمگینەکەی فەرامۆش کرد...جلیقەکەی داکەندو بەنیگایەکی شادو مندالانە لەباوکییەوە ڕاما.نیکۆلای پترۆڤیچ لە باوەشیگرت و گوتی:

- ڕێگایەکی زۆرمان نەماوە.کە گەیشتینە سەرگردەکە، مالەکەمان دەبینی.ئارکاشای ئازیزم،بەیەکەوە ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەین.تۆ لەکارو باری کشتوکالێدا هاوکاریم دەکەی...دیارە ئەگەر ئەوکارە بێتاقەتت نەکا.ئێمە تەنیا کارێك کە دەبێ بیکەین ئەوەیە دانیشین و یەکتری باشتر بناسین.تۆش پێت وانییە؟

- ڕازیم.بەلام ئەوڕۆ چەندە ڕۆژێکی خۆشە.

- پێوقەدەمی تۆیە کە هەوا ئاواخۆشە.بەڵێ،بەهار بەهەموو جوانییەکانییەوە خۆی دەنوێنێ.منیش ڕای پۆشکینم هەیە...لەبیرتە لە کتێبی ((یۆگنی ئەنگین)) دا دەڵێت:

(( چ خەمهێنە دەرکەوتنت

ئەی بەهار...ئەی ڕۆژانی عەشق...))

دەنگی بازارۆف لە گالسکەکەی دیکەوە بیسترا کە هاواریدەکرد:

- ئارکادی شقارتەکەتم بۆ بنێرە تا جگەرەکەم داگیرسێنم.

نیکۆلای پترۆڤیچ بێدەنگ بوو،بەلاّم ئارکادی کە بەشێوەیەکی بەسۆزو سەیرەوە گوێی لە قسەکانی باوکی ڕاگرتبوو دەست بەجێ قووتوە زێوەکەی لە گیرفانی دەرهێناو دایە دەستی پیووتەر تا بیداتە بازارۆف.دووبارە دەنگی بازارۆف بەرز بووەوە:

- جگەرەت ناوێ؟

ئارکادی وەلاّمی دایەوە:

- دەمەوێ.

پیووتەر گەڕایەوە سەرەڕای قووتوە شقاتەکە،جگەرەیەکی گەورەو ڕەشی دایە. ئارکادی جگەرەکەی داگیرساند، دووکەڵی چڕی تووتن بەهەوادا بلاّو بۆوە.نیکۆلای پترۆڤیچ کە بە درێژایی تەمەنی لێوی لە جگەرەنەدابوو،بە هێمنی ڕووی وەرگێڕا،بەشێوەیەك کەئارکادی پێنەزانێ.

دوای چارەگێك،ئەسپەکان لە پێش خانوویەکی داری نوێی ڕەنگ خۆڵەمێشی ڕاوەستان کە شیروانییەکەی لە ئاسنێکی سوور دروستکرابوو.ئێرە هەمان مادینۆ یان(گوندە نوێ) بوو کە جوتیارەکان پێیان دەگوت(گوندی بێنەوا)

## (٤)

به پێچەوانەی پێشوو،هیچ یەك لە ڕەعیەتەكان یان خزمەتكارەكان بۆ پێشوازی  میوانەكان نەهاتبوونە بەر دەرگاو تەنیا كیژۆڵەیەكی چواردەساڵەو لە پشت ئەویشەوە گەنجێكی مێرمنداڵ كە زۆربە پیوتەر دەچوو جل وبەرگی تایبەتی خزمەتكاری لەبەردابوو،وا وێدەچوو پێش خزمەتی تایبەتی پاڤێل پترۆڤیچ بێ،لە ژوور هاتەدەر. لاوەكە بێئەوەی قسەیەك بكا دەرگای گالیسكەكەی كردەوەو بەپارێزەوە كشایە دواوە.

نیكۆلای پترۆڤیچ وێڕای كوڕو میوانەكەی،لە هۆڵەكەوە چوونە ژووری میوانان،كەلە پشت دەرگاوە ڕووخساری ئافرەتێكی جوان دەبینرا.ژوورەكە بە سەلیقەیەكی جوان ڕازێنرابۆوە.نیكۆلای پترۆڤیچ كلاوەكەی لەسەرداگرت،سەرێكی ڕاوەشاندو گوتی:

- ئەوەش ماڵ،سەرەنجام گەیشتین.بەرلە هەمووشتێك لە ئێستادا،نان خواردن و پاشانیش پشوودان.

بازارۆف بە باوێشكدانەوە خۆی هەڵدایە سەركورسییەك و گوتی:

- بەڵێ،باشترین شت نانخواردنە.

نیكۆلای پترۆڤیچ  لەخۆڕاپێی بە زەوی داداو گوتی:

- بەڵێ،بەڵێ،پێویستە نان بخۆین وهەرچی زووترە ئەوكارەبكەین...ئەرێ ئەوەش (پرۆكیف)ە.

پیرەمێردێكی شەست حەفتاساڵە بەقژی سپی وگەنم ڕەنگ ولەشولارێكی كزەوە هاتەژوور.پیرەمێرد جل وبەرگێكی قاوەیی دووگمەمسی لەبەردابوو،دەسماڵێكی پەمەیی لە ملی هالاندبوو.خەندەیەكی كردو چووەلای ئاركادی، دەستی ماچ كردو بەنیشاندانی ڕێزیش بۆ میوانەكەیان دەستی بەسنگییەوەنا.پاشانیش پاشەوپاش كشایەدواوە.دەستەكانی لە پشتەوە گرێدان ولە پەنا دەرگا ڕاوەستا.

نیكۆلای پترۆڤیچ گوتی:

- پرۆكیف،ئەوەش ئەو،سەرەنجام گەڕایەوە لامان...گۆڕاوە یان نا؟

پیرەمێرد دووبارە بزەیەکی هاتێ و وەڵامی دایەوە:

- زۆرباش بووە؟

بەڵام لە پڕێکدا برۆیەکانی وێکهێنانەوەو بە ڕاوێژێکی پچڕپچڕ پرسی:

- فەرمانتان لەسەرە، سفرە ڕاخەین.؟

- بێگومان،بێگومان،تکادەکەم.بەڵام یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ، تۆ حەزناکەی پێش نانخواردن،ژوورەکەت ببینی؟

- نا،سوپاست دەکەم.پێموایە پێویست ناکا.تەنیا زەحمەت نەبێ جانتا و جلکەکانم بۆ بەرنەئەوێ...

جلیقەکەی داکەند.

- زۆرباشە...پرۆکۆفیف جلیقەکەی لێوەرگرە.(پرۆکۆفیف بەسەرسووڕمانەوە دەتگوت ناتوانێ جلکەکە وەربگرێ بە دوودەست وەریگرت و بە لارەلار وەدەرکەوت.)

- تۆدەڵێی چی ئارکادی...دەتەوێ ژوورەکەت ببینی یان نا؟

- بەڵێ،منیش دەمەوێ خۆم خاوێن کەمەوە.

ئارکادی دەیویست لە ژوورێ بچێتەدەر کە دیتی پیاوێکی بەژن وباڵا مام ناوەندی کەجلوبەرگێکی مەیلەو ڕەشی شێوە ئینگلیزی لەبەر دابوو، بۆینباخێکی گرانبەهای بەستبوو و جووتێك پێڵاوی بریقەداری لە پێدابوو،هاتەژوور.ئەوکەسە پاڤێل نیکۆلایێڤیچ کیرسانۆڤ بوو.ڕووخساری چل وپێنج بەهاری نیشاندەدا.پرچە سپییەکورتەکەی دەترووسکایەوە.ڕووخساری تووندتەبیات و بەڵام بێ گنج ولۆچی کەدەتگوت وەستاکارێکی ماهیر کاری لەسەر کردووە،جوانییەکی لە ڕادەبەدەری هەبوو.بەتایبەت چاوەڕەشەکانی سەرنجی هەموو کەسێکی ڕادەکێشا.مامی ئارکادی توانیبووی بەوتەمەنەوە هەروا خۆش زەوق وگرووتینی دەورانی گەنجێتی ڕابگرێ.لە سەرتاپای ڕەسەنایەتی دەباری.پاڤێل پترۆڤیچ دەستە ناسکەکانی کە نینۆکەکانی درێژو پەمەیی بوون و ئەنگوستیلەیەکی گەورەپەنجەکانی ڕازاندبووەوە لە گیرفانی شەرواڵەکەی دەرهێناو خستییەدەستی برازاکەیەوە.دوای ئەوەی بەشێوەو دابی ئەورووپی تەوقەی لەگەڵ کرد،بەشێوەی روسەکانیش سێ جار ماچی کرد.یانی سێ جار گوێچکە بۆنخۆشەکانی خۆی بە ڕوومەتی ئارکادییەوەناو گوتی:

- بە خێرهاتی.

نیکۆلای پترۆڤیچ،میوانەکەی ئارکادی بە براکەی ناساند.پاڤێلْ پترۆڤیچ لەش و لارەچالاکو ناسکەکەی کەمێك خوارکردەوە،بزەیەکی هاتیْ بەلاّم دەستی درێژنەکردو بە پێچەوانە لە گیرفانی هاویشتنەوە.دوای ئەوە شوێنەکەی گۆڕی و شانەکانی هەڵتەکاندو لە کاتێکدا ددانەسپیی و جوانەکانی دەرخستن گوتی:

- پێموابوو ئەمڕۆ ناگەیە ئێرە.خۆهیچ ڕووینەدابوو.؟

ئارکادی گوتی:

- نا،هیچ شتێك ڕووینەدابوو.تەنیا کەمێك وەدرەنگ کەوتین و بەپێچەوانە ئێستا وەکو گورگی برسین...باوکە گیان فەرمان بدە پرۆکۆفیف دەستو بردی بکا.من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.

بازارۆف بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەسەر کورسییەکەی هەستاو گوتی:

- ڕاوەستە منیش دێم.

بە یەکەوە لە ژوورەکە چوونە دەرەوە.

پاڤێلْ پترۆڤیچ پرسی:

- ئەوە کێیە؟

- - هاوڕێی ئارکادییە.وەکو باسیدەکا کوڕێکی زۆر ژیرە.

- ئەویش لێرە دەمێنێتەوە؟

- بەڵیْ.

- هەمان کابرا پرچنە؟

- بەڵیْ،هیچ ناکریْ.

پاڤێلْ بە پەنجەکانی لە مێزەکەیداو گوتی:

- پێموایە ئارکادی لە جاران کاملْتربووە.لە هاتنەوەی زۆر خۆشحالْم.

لە کاتی نانخواردندا قسەوباسی زۆر نەکرا.بە تایبەتی بازارۆف هیچی نەگوت تەنیا خواردی.نیکۆلای پتۆڤیچ باسی کارو باری کشتووکاڵی وکێشەی ئیداری کرد.بە تایبەت سەندیکاکان و وەکیلەکان وپێویستی هێنانی ماشێن و ئاسنەوالْ.پاڤێلْ پترۆڤیچ لە ژوورەکە دەهات و دەچوو.(ئەو هیچ کات نانی شەوی نەدەخوارد) هەندیْ جار قوومێکی لەشەرابەکە دەداو بەدەگمەن قسەی دەکرد،ئەو وشانەی لە دەم دەردەچوون وەك (ئاها-ئائا-ئەهە-هم).

لەگەڵ ئەوەی ئارکادی هەواڵی تازەی پترۆسبۆرگی بۆ باوکی ومامی دەگێڕایەوە،دیاربوو لە شتێك نیگەرانە.لەوجۆرە نیگەرانیانەی تایبەت بەو گەنجانەی کەدێنە ژینگەیەك کە کەسەکانی ئەوێ تا ئێستاش بە چاوی منداڵی سەیری دەکەن.تا ئەو جێگایەی کە دەیتوانی وشەکانی درێژ دەکردنەوەو لە وشەی (باوکە گیان) خۆی دەبوارد.تەنانەت یەکجاریش بە وشەی (باوکە) لێدەگەڕا.زۆر بە ڕووقایمی شەرابی لە پەرداخ دەکردو یەکسەر هەڵیدەدا.

پرۆکۆفیف چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت و لێوی دەکرۆشت.یەکسەر دوای نانخواردن،هەرکەسەو چووە جێگایەك.بازارۆف کە جلی نووستنی لە بەرکردبوو لە پەنا ئارکادی لە سەر نیوتەختەکە دانیشت و پیپەکەی داگیرساند.

- چ مامێکی جوانت هەیە!لە گوندی بی وهێندەش بە خۆت ڕابگەی.!چ نینۆکێکی خاوێن وناسکی هەن،واباشە بیان بەیتە پێشانگایەك.

- ئەویش بۆ خۆی ڕۆژگارێکی هەبوو.شێرێك بوو بۆخۆی.کە هیچ ئاسکێکی چاوڕەش نەیدەتوانی لە دەستانی دەربازبێ.سەردەمانێك زۆر لە ژنان ئاشقی ببوون.

- ئاوا.بەڵام بەداخەوە ئێرە ژنێکی وای لێنییە کە بتوانێ دڵی ببا.ئەو یەخە توونەو شەقانە،دەڵێی لە بەرد درووستکراون.ڕیشیشی سفت تاشیبوو.ئارکادی بە ڕای تۆ ئەوکارانە کەمێك گاڵتەجاڕی نین.؟!

- ڕەنگە!بەڵام لە ڕاستیدا ئەو مرۆڤێکی زۆرباشە.

- بەڵێ،وەك کەل و پەلی عەنتیکە...تەنیا عەیبێکی کە هەیەتی زۆر شیعردەخوێنێتەوە.پێموانییە زۆریش لە مڵکداری و ئەوشتانە شارەزابێ،بەڵام لەسەریەك پیرەمێردێکی میهرەبانە.

- باوکم یەك پارچە گەوهەرە.

- پێتوانییە کەمێك شەرمنە.

ئارکادی سەرێکی ڕاوەشاند.بازارۆف گوتی:

- ئەوجۆرە مرۆڤانە بوونەوەرێکی سەیرن.مێشکی خۆیان بەوپەڕی شێتی وەکاردەخەن.بەهەرحاڵ واباشترە بڕۆم.تا لەبیرم نەچووە بڵێم لە ژوورەکەی مندا ئاودەستێکی غەربی لێیە،بەڵام دەرگاکە داناخرێ.بە هەرجۆرێکیش لێکی دەدەیتەوە بوونی ئاودەستێکی غەربی نیشانەی پێشکەوتن و شارستانەتە.

دوای ڕۆیشتنی بازارۆف هەستێکی خۆشی سەرتاپای ئارکادی داگرت.نووستن لە ماڵێکدا کە شوێنی لەدایکبوونت بێ و لەسەر قەرەوێڵەیەکی ئاشناو لێفەیەك کە دەستێکی میهرەبان بۆخۆی ڕێکی خستبێ،چەندە چێژبەخشە.ئارکادی کەوتەوە بیری یگۆرناو لەخودا پاڕایەوە بیبەخشێ بەڵام بۆخۆی دووعای نەکرد.

ئارکادی و بازارۆف زوونووستن بەڵام باقی خەڵکەکەی دیکە تا درەنگان دانیشتن.گەڕانەوەی کورەکەی،نیکۆلای پترۆڤیچی وەهەژان خستبوو.بێئەوەی مۆمەکە بکوژێنێتەوە،لەسەر جێگاکەی ڕاکشا،ئانیشکی داداو لەگژفکران ڕاچوو.براکەشی پاڤێل پترۆڤیچ لە نیوەشەوی دوێنێوە لەژووره جوان وڕازاوەکەی خۆیدا لەسەر کورسییەکی گەورە دانیشتبوو.لەبەردەمیشی سۆپا خەڵوزەبەردەکەی بە هێواشی و جوانی بڵێسەی دەسەند.پاڤێل پترۆڤیچ تەنیا پێڵاوەکانی داکەندبوو لە جیاتیان سەرپایەکی سووری لەپێکردبوو.دواژمارەی گۆڤارێکیشی بەدەستەوە گرتبوو،بەڵام لەجیاتی خوێندنەوە،لە بڵێسەی ئاگرەکەوە ڕامابوو.ئاگرێکی شین هەندێ جار بڵێسەی دەسەندو هەندێ جاریش کزدەبوو.تەنیا خودا دەیزانی پاڤێل پترۆڤیچ بیری لەچیدەکردەوە،بەڵام لە قیافەیڕا دەخوێندرایەوە کە تەنیا بیر لەڕابردوو ناکاتەوە،چوونکە شێوەی ئەوکەسانەی کەتەنیا بیر لە ڕابردوو دەکەنەوە هێندە گرژوو مۆن نین.

لە ژووره بچووکەکەی دواوە،ژنێکی جحێڵ کە چاکەتێکی شینی جوانی لەبەردابوو دەسماڵێکی سپی بە پرچە ڕەشەکانیدا دابوو لە سەر سندووقێکی گەورە دانیشتبوو.فینیچکا هەندێ جار وەنەوزی دەداو هەندێ جاریش سەرنجی لە دەرگایەکی نیوە کراوە دەبڕی.لە پشتیشیەوە لانکەیەکی بچووك دەبینرا کە لەناویدا دەنگی هەناسەی منداڵێکی نووستووی لێدەهات.

## (٥)

بەیانی،بازارۆف لە پێش هەموانـدا لەخـەو هەسـتاو لـە مـاڵ هاتەدەر.سـەیرێکی دەورو بەریکردو لە بەرخۆیەوە گوتی:

- ئێرەش تاریفێکی وا هەڵناگرێ.

کاتی دابەشکردنی زەوی وزار لە نێوجوتیارەکاندا،نیکۆلای پترۆڤـیچ بـەزۆری چـوار دۆنمـی دێمـی بۆخـۆی دابڕیبوو.لـەوێ باڵەخانەیەیـەکی بۆخـۆی وخزمـەتکارەکانی درووسـتکردو باقیەکەشـی کردبـووە کشـتوکاڵ.باخێکی درووسـتکردو چـالاوێکی لێدا.لـە گۆشـەیەکیش مەلەوانگەیەکی درووستکرد کە ئاوی زۆری ڕانەدەگرت.هەوڵی زۆری دابوو درەختی زۆر بڕوێنێ بەلاَم ئاوی چالاوەکە زۆر سوێربوو لەبەرهەمی کارەکـەی تـەنیا سـاباتێکی باشـی هـەبوو کـە ئەقاقیاو یاسی بنەوش دایان پۆشیبوو،کە زۆربەی کات ئەندامانی خێزان بـۆ چـای خواردنـەوە لێی دادەنیشتن.

چەند ساتێکی زیاتر نەکێشا تا بازارۆف تەواوی دەورو بەرەکـە بپێـوێ.دوای گـەڕان بـەناو حەوشەکەدا سەرێکی لە تەویلەشدا.پاشان لەگەڵ دوومنداڵی سەرو پێچـکەی مـاڵێ ئاشـنابوو لەگەڵ ئەوان چووە گۆماوێـك کـە فرسـەخێك لەماڵەکـە دووربوو،تالـە ڕاوکردنـی بۆقەکانـدا لەگەڵیان شەریك بێ.یەکێك لە منداڵەکان پرسی:

- کاکە،چی لە بۆقەکان دەکەی؟

بـازارۆف کـە هەمیشـە بەچـاوێکی سـووك سـەیری خـەڵکی دەسـتکورتی دەکـرد بـەلاَم لەبەرامبەر هەلسووکەوتی ئەوان بەرامبەر بەخۆی هەستێکی قووڵی هەبوو،وەلاَمی دایەوە:

- گوێ بگرە دەڵێم چی.زگی بۆقەکان هەڵـدەدڕم تـابزانم ناوزگیـان چـی تێدایـە ئـەوجار تێدەگەم کە لەناو زگی مرۆڤیشدا چی هەیە.ڕاستیت دەوێ من و تۆ وەك بۆقەکان وایـن تـەنیا جیاوازییەك کە هەمانبێ ئەوەیە کە ئێمە لەسەر دووپێ دەڕۆین.

- ئەو کارە چ سوودێکی هەیە؟

- سوودەکەی ئەوەیە کاتێك تۆ نەخۆش دەبی،من بێئەوەی دووچاری هەڵەیەك بم،چارەسەرتدەکەم.
- بۆ چما تۆ دکتۆری؟
- بەڵێ.
- واسکا،گوێت لێیە.ئەفەندی دەڵێ من و تۆ وەکو بۆقەکان واین.بەڕای تۆ ئەوە سەیرنییە؟
واسکای حەوت ساڵە بە پێی پەتی وسەرو پرچێکی وەك بەفر،کە جل وبەرگێکی قۆزاقی لەبەردابوو،لەوەڵامدا گوتی:
- من لە بۆقەکان دەترسم.
- ناکا لەوەبترسی گازت لێبگرن؟
بازارۆف قسەی منداڵەکانی بڕی و گوتی:
زۆرباشە فەیلەسووفەکان،خۆتان لە ئاوێ باوێن.
لەو ماوەیەدا نیکۆلای پترۆڤیچیش لە خەو هەستابوو،بەرەو لای ژووری ئارکادی چوو.کاتێك چووە ژوور،ئارکادی جلی لەبەرکردبوو.کوڕو باب چوونە هەیوانی ماڵێ و لەژێر هەورەبانەکە ڕاوەستان کە بەڕەنگێکی جوان نەخشێنرابوو.لە پەنا تانەکە مێزێك دانرابوو کە سەماوەرێك لە نێوان یاسە وەنەوشەییەکاندا دەکولا.کیژۆڵەیەك کە شەوی پێشوو هاتبووە پێشوازیان هاتە پێش و بەدەنگێکی ناسك گوتی:
- حاڵی (فیدۆ سیانیکایۆنا))زۆر باش نەبوو منی ناردووە تالێتان بپرسم بۆخۆتان چای تێدەکەن یان (دوونیا) بنێرێ؟
نیکۆلای پترۆڤیچ دەستبەجێ وەڵامی دایەوە:
- بۆخۆم ئەو کارە دەکەم...ئارکادی تۆ چای بەچی دەخۆیەوە،بەشیر یان بە لیمۆ؟
- بە شیر.
ماوەیك بێدەنگ بوو لەو کاتەدا سەرێکی لەقاندو گوتی:
- باوکەگیان؟
- بڵێ کوڕم.
ئارکادی کە هەروا چاوی لە پێش خۆیەوە بڕیبوو گوتی:

- بابەگیان ئەگەر پێتوایە پرسیارێکی نابەجێ دەکەم هیوادارم ببەخشی.بەڵام نیشاندانی دڵسۆزی تۆ، وام لێدەکا ئەوەت لێبپرسم...نیگەران نابی؟

- نا،قسەبکە.

- داوای لێبووردن دەکەم کە ئەوەت لێدەپرسم...ئایا ڤنیچ...ئەرێ ئەو لەبەر من لەوێیە و ئامادەنییە چای تێکا؟

نیکۆلای پترۆڤیچ کەمێك ئەولاو لای کردو پاشان گوتی:

- ڕەنگە...ئەو پێیوایەکە...شەرمێ دەکا.

ئارکادی سەیرێکی باوکی کردوو گوتی:

- ئەو لە خۆڕا شەرمێ دەکا.تۆ کەشێوەی بیرکردنەوەی من دەزانی(ئارکادی هەمیشە لە دەربڕینی ئەو وشەیە چێژی وەردەگرت)جیالەوەش،باوەڕبکە من هەتا بەئەندازەی سەرە دەرزییەکیش نامەوێ خۆم لە ژیانی تۆ هەڵقوورتێنم. من دڵنیام تۆ لە هەڵبژاردنتدا بەهەڵە ناچی.ئەگەر تۆ ئەو بە شایستەی ئەوەدەزانی لەگەڵ تۆدا بژیت ئەویش حەتمەن شایانی ئەوەیە.من دڵنیام کە هیچ کوڕێ ناتوانێ ڕێگا بۆ باوکی دابنێ.ئەویش کوڕێکی وەکو من بۆ باوکێکی وەکوتۆ کە هیچ کات کوڕەکەی لە چوارچێوەیەکدا لە قالب نەداوەو ئازادی لێ زەوتنەکردووە.

ڕاوێژی دەنگی ئارکادی سەرەتا دەلەرزی.چوونکە ئەوخۆی وەك ڕابردوو دەهاتە بەرچاو و دەیزانی کە ئەو قسانە بۆ نیکۆلای پترۆڤیچ حاڵەتی ئامۆژگاریان هەیە.بەڵام لەوەی کە ڕاوێژی دەنگی کاریگەری لە ڕادەبەدەری هەیە،ڕستەکانی کۆتایی بە توندی دەربڕین.نیکۆلای پترۆڤیچ دووبارە پەنجەکانی بە ناو چەوانیدا هێناو بە هێمنی گوتی:

- سوپاست دەکەم ئارکادی.قسەکانت بەتەواوی لە ڕووی ویژدانەوە بوون.ئەو بە ڕاستی کچێکی لایقە... ئەوکارەم لەڕووی هەواو هەوەسەوە نەکردووە...من ناتوانم لەو بارەیەوە بە ئاسوودەیی لەگەڵت بدوێم بەڵام تۆ دەرکی پێدەکەی کە هاتنی ئەو بۆ ئێرە بەڕاستی سەخت و دژواربوو...ئەویش لەیەکەم ڕۆژی هاتنتدا.

ئارکادی لە شوێنی خۆی هەستاو بە بەخشندەییەوە گوتی:

- کەوایە من دەچمەلای و ڕازیدەکەم کە هیچ پێویست ناکات شەرم بکات.

- نا،ئارکادی...ئەوکارەمەکە...ڕاستیت دەویّ...واباشتربوو کە پێشتر هەموو شتێکم پێگوتبای.

بەلاّم ئارکادی گوێی لە قسەکانی نەبوو لە هەیوانەکە تێپەڕیبوو.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ ڕۆیشتنەکەی دیت و بەشەرمەوە لە جێگاکەی خۆی دانیشت.دڵی توونـد لێیدەدا...شتێك ئەوی دووچاری شڵەژان کردبوو بەلاّم چ شتێك؟بەڕوونی دیار نەبوو.ئایا ئەو بیری لە ئایندەی هەڵسووکەوتی خۆی و کوڕەکەی دەکردەوە؟ ئایا بیری لەوە دەکردەوە کە ئارکادی هەمووشتێك بە خۆشی و میهرەبانی وەردەگریّ تادوایی؟ ئایا خۆی بۆ ئەوکارەی کردبووی سەرزەنشت دەکرد؟ بەدژواری دەیتوانی وەلاّمێك بۆ ئەوپرسیارە وەبینیّ.چوونکە لەو کاتەدا تەوای ئەوپرسیارانە بە مێشکیدا تێدەپەڕین.هێشتا لە بیرکردنەوەدابوو لێدانی دڵی خێراتر لە جاران لێیدەدا کە گوێی لە دەنگی پێیەکبوو بەدوای ئەویشدا ئارکادی لە هەیوانەکە دەرکەوت.لە ڕووخساریدا شادییەك دەخوێندرایەوە.

- باوکە،ئێمە بووینە ئاشنا.فدۆسیا نیکلاّیۆنا بە ڕاستی کەمێك نەساغە بەلاّم چاك دەبێتەوە.ئەریّ بۆچی پێتنەگوتبووم کە برایەکم هەیە تا ئەویشم دوێنیّ بەهەمان شێوەی ئەمڕۆ بە تامەزرۆییەوە ماچ کردباو لە باوەشم گرتبا.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ ویستی شتێك بڵیّ.ویستی کوڕەکەی لە باوەشبگریّ بەلاّم ئارکادی دەستپێشخەری کردو خۆی بەمللی باوکییەوە هەڵواسی.

- دووبارە چ باسە؟هەمیسان سەرگەرمی یەکتر ماچکردنن؟

ئەوە دەنگی پاڤێلّ پترۆڤیچ بوو کە لە پشتیانەوە دەنگی دەهات؟ نیکۆلاّی پترۆڤیچ و ئارکادی هەردووکیان لە دیتنی خۆشحالّ بوون.هەندیّ جار وادێتەپێش کە بەهەموو شیرینییەکانییەوە مرۆڤ حەزدەکا لێی دەربازبیّ.نیکۆلاّی پترۆڤیچ بە خۆشحالّییەوە گوتی:

- بۆ پێت سەیرە؟ من سالاّنێکە چاوەڕوانی ئارکادیم.لە دویّ شەوەوە تا ئێستا بۆم نەکراوە تێر تەماشای بکەم.

- نا،هیچ پێم سەیرنییە.منیش حەزدەکەم لە باوەشی بگرم.

ئارکادی بەرەولای مامی ڕۆیشت دووبارە عەتری سمێڵە بۆنخۆشەکانی لە سەرگۆنای خۆی هەستپێکرد.

پاڤێلْ پترۆڤیچ له پـەنا مێزەکـە دانیشت.بەشـێوەی ئینگلیزەکـان جـل وبـەرگێکی سـپی خاوێنی لەبەرکردبوو کە تایبەت بوو بـە نـان خـواردنی بـەیانیان و کلاۆێکـی سووریشـی لـە سەرنابوو.لە بەرهەمی ژیانی لەو گوندەدا یەکێکیان ئـەوکلاۆە سـوورەو ئـەوی تریشـیان ئـەو بۆینباخە نارێکەبوو کە لە ملی بەستبوو،بەلاّم یەخەی کراسەکەی هەروا ڕەق وڕاست ژێرچەناگە تراشاوەکەی ڕێکدەگوشی. لەئارکادی پرسی:

- هاوڕێ تازەکەت لەکوێیە؟

- لەماڵ نییە. واڕاهاتووە بەیانیان زوو لە خەو هەسـتێ و بچـێتەدەرەوە.هێندە بـیری لـێ مەکەوە چوونکە ئەو حەزی لەخولّق وخۆکردن و ئەوجۆرە شتانە نییە.

پاڤێلْ پترۆڤیچ کە خەریکی تێهەڵسوونی نان و ڕۆنەکەرە بوو گوتی:

- بەڵێ،دیارە.بۆماوەیەکی زۆریش لێرە دەمێنێتەوە؟

- با بزانین چۆن دەبێ.نیازی وایـە سـەرێك لـە بـاوکی بـداو چـەند ڕۆژێکـیش لای ئێمـە دەمێنێتەوە.

- ماڵی بابی لەکوێیە؟

- لە هەمان پارێزگای خۆمانە.هەشـتا فرسـەخ لێـرە دوورە.ئـەویش گونـدێکی بچـووکی هەیە.پێشتر پزیشك بووە.

- سەیرە...لەخۆڕانەبوو کـە لـەخۆمم دەپرسـی پێشـتر ئـەوناوەم بیسـتووە...بازارۆف... نیکۆلای، دکتۆر بازارۆف کە لە فەرماندەیی باوکتداخزمەتی دەکرد لە یادتە؟

- وەك دەڵێی وایە.

- دڵنیام خۆیەتی.ئەو کوڕی هەمان پزیشکە.

پاشان دەستی بە سمێڵەکانیدا هێناو بە ڕاوێژێکی پچڕپچڕەوە گوتی:

- ئەو هاوڕێیەی تۆ چ جۆرە بنیادەمێکە؟

- یانی چی،چ جۆرە بنیادەمێکە؟مەبەستت لە شێوازی بیرکردنەوەیەتی؟

- بەڵێ،گیانەکەم.

- ئەو یەکێکە لە (نیهلیست)[1]ەکان.

---

١ نەهلیزم: پووچ گەرا، پەیڕەوی ڕێبازی نەهلیزم، ئەو ڕێبازە لە سەدەی نۆزدە سەری هەڵداو ئامانجی لە ناوبردنی بڕواوو ڕێوشوێنە کۆمەڵایەتیەکان بوو.

نیکۆلای پترۆڤیچ بەسەرسوورِمانەوە گوتی:

- چی؟

پاڤێلْ پترۆڤیچ کە هەرخەریکی نان و کەرە خواردنبوو ساتێك وەستا.ئارکادی دووبارەی کردەوە:

- بەڵێ،ئەو یەکێك لە نیهلیستەکانە.

نیکۆلای پترۆڤیچ پاش کەمێك بیرکردنەوە گوتی:

- تا ئەوجێگایەی من بزانم بنچینەی ئەو وشەیە (نیهل) بە مانای هیچ دێت.بەو پێیە نیهلیستێك نابێ برِوای بە هیچ شتێك هەبێ.

پاڤێلْ پترۆڤیچ بۆ چاککردن و تەواو کردنی قسەی براکەی هەڵیدایە:

- بەڵێ:کە سێك کەرِێز بۆ هیچ شتێك دانانێ.

دەستی لە نانخواردن هەڵگرت.ئارکادی گوتی:

- مەبەستی ئەو وشەیە کەسێکە کە بۆ هەموو شتێك تەنیا لە دیدی رِەخنەییەوە سەیری دەکات.

پاڤێلْ پترۆڤیچ پرسی:

- چما ئەوە لەگەڵ ئەویان جیاوازی هەیە؟

- بێگومان.یەك نیهلیستی لە بەرامبەر هیچ هێزێکدا کرِنۆش نابا.ئەو ئامادەنییە هیچ بنەمایەکی نا واقعی قبووڵ بکا ئەگەر تەواوی خەڵکیش قبووڵیان بێ.

پاڤێلْ پترۆڤیچ گوتی:

- بابزانین،دەتوانی پێمانبڵێی باشی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لە کوێدایە؟

- تا بیرکردنەوە هەبێ.بەشێك لەو باوەرِدارانە پێیان خۆشەو بە شێکیشیان لێی بێزارن.

- بەڵێ،خاڵی سەرەکی لێرەدایە.دەبینم، ناتوانم ئەوبابەتە دەرك پێبکەم.ئێمەی خوێندەوارانی قوتابخانە کۆنەکان پێمانوایە کە بەبێ گەرِانەوە بۆ بنەما(پاڤێلْ پترۆڤیچ ئەو وشەیەی بەشێوەی فەرەنسییەکان زۆر بەنەرمی دەربرِی لە کاتێکدا ئارکادی بە رِاوێژی گەورەو درێژ دەری دەبرِی.) هەمان بنەمای کە تۆدەیلێی خەڵك باوەرِیان پێیەتی تەنانەت ناتوانی هەنگاوێکیش بۆ پێشەوە بنێی و هەناسەیەك بدەی.خودا ئێوە گەنجەکان بپارێزێ

وســـەرکەوتووتان بکا.ئێمـــە خۆڵـــەو کارانـــە هەڵناقوورتێنین.تـــەنیا لـــەدوورەوە تەماشـــاتان دەکەین.بەڕاست ئەو وشەیەی گوتت چی بوو؟

ئارکادی بە ڕاوێژێکی درێژ وەڵامی دایەوە:

- نیهلیست.

- بەڵێ،لە ڕابردوودا هگلیستەکان و ئێستاش نیهلیستەکان.زۆر حەزدەکەم بـزانم ئێـوە لـە جیهانێکدا کە هەوایەکی تێدانییە چـۆن دەژین.باشـە،نیکۆلای پترۆڤیچـی خۆشەویسـت بـرای ئازیزم واباشە زەنگ لێبدەی چوونکە ئێستا کاتی ئەوەیە کاکاوی خۆم بخۆمەوە.

نیکۆلای پترۆڤیچ زرینگەی لە زەنگەکە هێناو پاشان هاواریکرد:

- دوونیا.

بەڵام لە جیاتی دوونیا،فنیچکا لە هەیوانەکە دەرکەوت.ئافرەتێکی گەنجی بیست وسێ ساڵ تەمەن،سپی پێست،ئەندام ناسک،چاووقژ خۆڵەمێشـی،لێوئاڵ وپەنجـە ناسك.کراسـێکی چـیتی قاوەیی گوڵداری لەبەربوو دەسماڵێکی ڕەشی بەسەرشانیدادابوو.فنجانێکی گەورەی کاکـاوی لـە پێش پاڤێڵ پترۆڤیچ دانا.پەشۆکاوو نیگەران بوو.خوێنێکی گەرم لە ژێـر پێسـتە سـپییەکەیدا دەگەڕا.سەری نەوی کردوو لە پێش مێزەکە ڕاوەستا.پەنجەکانی دەستی لەسـەر لێـوی مێزەکـە داناو پـاڵی دایـەوە.دەتگوت لـەهاتنی هەسـتی بەپەشـیمانی دەکـردو لـە هـەمان کاتیشـدا ئەوهەقەی بەخۆیدەدا کە بێتـەئێرە.پاڤێڵ پترۆڤـیچ نێوچـەوانی تێکنـا.نیکۆلای پترۆڤیچـیش نیگەران دەهاتەبەرچاو.پاڤێڵ پترۆڤیچ لە سەرخۆگوتی:

- سلاو،فنیچکا.

فنیچکاش بە دەنگێکی لەسەرخۆو ڕەوان وەڵامی دایەوە پاشان بە تیلەنیگایەك سـەیرێکی ئارکادی کرد کەدۆستانە بە ڕوویەوە پێدەکەنی،پاشـان چـووەدەر.هەندێك هـەنگاوەکانی تێـك ئاڵقان بەڵام ئەوە هیچی لەجوانی ولەنجەولارەکەی کەم نەکردەوە.

بۆماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر هەیوانەکەدا کێشا.پاڤێڵ پترۆڤیچ دوای ئەوەی قوومێکی لە کاکاوەکەیدا،لەناکاو سەری بەرزکردەوەو گوتی:

- ئەوەش جەنابی نیهلیست  تەشریفیان هێنا.

بازارۆف کە ڕووپۆشێکی کەتانی لەبـەرکردبوو و شـەرواڵێکی خـۆڵاوی لەبـەردابوو لـەناو باخەکە دەرکەوت.قەوزەی گۆلاوەکە وەکـو تـۆڕێکی ناسـك لـە کلاوەکـەی هالابوو.بەدەسـتی

ڕاستی کیسەیەکی گرتبوو کە شتێك لەناویدا دەجوولا.بە هەنگاوی خێرا گەیشتە هەیوانەکە.سەرێکی ڕاوەشاندو گوتی:

- سلاّو برایان.هیوادارم لە دوا کەوتنم ببوورن.دەگەڕێمەوە.پێش هەمووشتێك دەبێ جێگایەك بۆ ئەو دیلانە بدۆزمەوە.

پاڤێلّ پترۆڤیچ پرسی:

- ئەوانەی هێناوتن زێروون؟

- نەخێر،بۆقن.

- ئەوانە دەخۆی یان بەخێویان دەکەی؟

بازارۆف کە بەرەو ژوورەکەی خۆی دەڕۆیشت بە خوێنساردییەوە گوتی:

- نا،تاقیکردنەوەیان لە سەردەکەم.

پاڤێلّ پترۆڤیچ بەگاڵتەوە بەلاّم بەئارامی گوتی:

- دەیەوێ شیکاریان لەسەربکا.باوەڕی بە هیچ شتێك نییە بەلاّم بڕوای بە بۆقانە.

ئارکادی لە ڕووی رەحم وسۆزەوە سەیرێکی مامی کرد.نیکۆلاّی پترۆڤیچیش شانەکانی هەڵتەکاند.پاڤێلّ پترۆڤیچیش هەستیکرد لاتاوێکی بێ جێی هاویشتووە هەربۆیە هەوڵیدا باسەکە بەبارێکی دیکەدا بگۆڕێ،باسی ملّکداری کردو گوتی کوێخای تازە شەوی ڕابردوو هاتۆتەلای وشکایەتی لە(فووما) ی کرێکاریکردووە کە هەرای ناوەتەوەو لە کۆتاییدا ئەوەشی گوت:

- فووما لەهەموو جێگایەك خۆی بە بنیادەمێکی خراپ دەردەخات،ئاقیبەتی ئەو کافرە باش نابێ.ئەو سەرەخەریانەی ئەو، شتێکی خراپ بەدوای خۆیدادێنێ.

**(٦)**

پاش کەمێك بازارۆف گەڕایەوە دوای دانیشتنی لە پشتی مێزەکە بەپەلە دەستیکرد بەنانخواردن.دووبرا بێجوولەو بێدەنگ چاودێری هەڵسووکەوتی ئەویاندەکرد.ئارکادیش بە نهێنی سەیری باوك ومامی دەکرد.سەرەنجام بێدەنگی نیکۆلای پترۆڤیچ شکاندی وپرسی:

- دوور ڕۆیشتبووی؟

لەو نزیکانە گۆماوێکی لێیە...پێنج کەوی کێویم بۆ ئەویێ هەڵفڕاندن.ئارکادی تۆ زۆرباش دەتوانی ڕاویان بکەی.

- بۆچما ئەتۆش ڕاوچی نی؟

- نا.

پاڤێل پترۆڤیچیش پرسیاریکرد:

- گۆیا زۆر هۆگری فیزیای؟

- بەڵێ،بە فیزیاو تەواوی زانستی سرووشتی.

- وەك دەڵێن(ژەرمەنەکان) ئەڵمانەکان لەو ڕێگایەوە بە سەرکەوتنی زۆر گەیشتوون.

بازارۆف بەبێ بایەخییەوە گوتی:

- بەڵێ،ئەڵمانەکان لەورووەوە بە مامۆستای ئێمە دەژمێردرێن.

پاڤێل پترۆڤیچ بەئەنقەست زاراوەی ژەرمەنی بە سووکایەتی بەکارهێنابوو لە جێگای ئەڵمانەکان،بەلاّم کەس لە مەبەستی ئەو تێنەگەیشت.بەرەبەرە هەستی بە نیگەرانی و تووڕەبوون دەکرد بە ڕاوێژێك کە دەریدەخست لە داب ونەریت شارەزایە گوتی:

- تۆ بەو ڕادەیە ڕێز بۆ ئەڵمانەکان دادەنێی.

خوو و خدە خانەدانییەکەی ئەو لە ڕادەبەدەر بازارۆفی ئازار دەدا.دەروونی کینەیەك دایگرتبوو.ئەو پزیشك زادەیە بێ پەروا نەك هەر نەدەترسا،ڕێو ڕەسمی وتووێژکردنیشی لەگەڵ لە خۆ گەورەتری لەبیر چووبووەوە،بە ئاشکرا لە دەنگیڕا تووڕەیی و ڕووهەڵمالاّوی دیاربوو.

بازارۆف گوتی:

- فەیلە سووفەکانی ئەویّ،خەڵکانی ماندوو نەناسن.

- بەڵیّ،ڕاستە.حەتمەن جەنابت دەربارەی فەیلەسووفەکانی ڕووس هەمان ڕات نییە.وانییە؟

- بەڵیّ،ئەگەر ڕاستیت دەویّ وایە.

پاڤێلّ پترۆڤیچ خۆی ڕاستکردەوە لە کاتێکدا سەری وەکورسییەکە دەدا گوتی:

- ئەو لە خۆبردووەی تۆ شایانی ڕێزە...بەڵاّم بەوشێوەویەی کە ئارکادی ماوەیەك پێش بەئێمەی گوت،تۆ بڕوات بە هیچ کەسێك و هیچ شتێك نییە.وایە؟

- بۆ دەبیّ بڕوایەکم هەبیّ؟ ئەگەر کەسێك قسەیەکی ڕاستیکرد قبوولّیدەکەم،بێجگە لەوە شتێکی دیکەت دەویّ؟

- بەوپێیە هەموو ئەڵمانەکان قسەی ڕاست و درووستدەکەن؟

قیافەی پاڤێلّ پترۆڤیچ حاڵەتێکی وای هەبوو کە دەتگوت هەرلێرە نییەو لە دنیایەکی دیکە دەڕوانیّ.بازارۆف کە بە ئاشکرا لە درێژەی بابەتەکە خۆی دەبوارد،زاربلاّویەکی کردو گوتی:

- هەموو ئەڵمانەکان نا...

پاڤێلّ پترۆڤیچ سەیرێکی ئارکادی کرد،دەتگوت پێیدەڵیّ کە بەڕاستی هاوڕێیەکی بە ڕەوشتت هەیە.پاش کەمێك بە بیّ بایەخییەوە گوتی:

- بەلاّم من هیچ خۆشیم لە ئەڵمانەکان نایەت.هەتا ئەڵمانە ڕووسەکانیش کە هەرقسەیان لەگەلّ ناکەم دیارە چ جۆرە جانەوەرێکن.مەبەستم ئەڵمانەکانی ئەلمانیایە.ڕەنگە لە کۆندا کەسانێکی وەك شیلەرو گۆتەیان هەبووبیّ.کە براکەم هۆگریانە بەلاّم حالّی حازر لەو سەرزەمینە زیاتر زانای مادیی وکیمیایی زان سەرهەڵدەدەن.

بازارۆف قسەکەی پاڤێلّ پترۆڤیچی بڕی وگوتی:

- لە حالّی حازردا زانایەکی کیمیایی لە سەد شاعیر بەنرخترە.

پاڤێلّ پترۆڤیچ بە حاڵەتێکی وا کە دەیویست خۆی ڕابگریّ گوتی:

- ڕاستە.دەڵێی لەگەلّ هوونەریش سەرو کارێکی وات نییە.

بازارۆف بە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزەوە گوتی:

- بۆچی،بەلاّم نەك هەموو هوونەرێك کە لەخزمەتی کۆکردنەوەی سەروەت وسامانداب‌یّ.

- بەڵێ،بەڵێ.دیارە ڕادەبوێری.دەردەکەوێ کە تۆ تەواوی ئەوانە ڕەتدەکەیەوە...زۆرباشە.کەوایە تۆ تەنیا باوەڕت بە زانست هەیە؟

- پێمگوتی،باوەڕم بە هیچ شتێك نییە.بەتایبەت زانست....زانستی خالیس چ مانایەکی هەیە.بە هەمانشێوە کە هوونەر جۆراوجۆرە،زانستیش جۆراوجۆرە. زانستی خالیس بە شێوەیەکی گشتی ناتوانێ وجوودی دەرەکی هەبێ.

- زۆرباشە.بەلاّم دەکرێ ڕای ئێوە دەربارەی بنەمایەك کە لەژیانی ڕۆژانەدا بەشێوەی یاساو ڕێسای قانوونی داڕێژراون بزانم؟ ئایا ئەوانیشت قبووڵ نین؟

- ئەرێ جەنابت دەتەوێ دادگاییم بکەی؟

پاڤێڵ پترۆڤیچ ڕەنگی ڕووخساری تێکچوو،نیکۆلاّی پترۆڤیچ بە ئەرکی خۆی زانی بێتە ناو گفتوگۆکەوە:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچی خۆشەویست.ئیشالّلاّ لە کاتێکی دیکەدا دەبێ لەو بارەیەوە بە شێوەیەکی کاملّتر گفتووگۆ بکەین تا هەم بیرو ڕای تۆ بزانین و هەم تۆش لە بیروڕای خۆمان ئاگادار بکەین.بە تایبەتی کە لەبەشی سرووشتیدا کاردەکەی زۆرخۆشحالّم.وام بیستووە کە (لیّبیخ) لە بواری کشتوکالّیدا داهێنانی زۆری کردووە...تۆ دەتوانی لەبواری کشتوکالّیدا یارمەتییەکی باشمان بکەی و ڕێنوێنی باشمان بکەی.

- بۆ خزمەتکردن ئامادەم.بەلاّم دەربارەی لیّبیخ کەفەرمووتان ئێمە لەکوێو ئەو لەکوێ!لە پێش هەمووشتێکدا دەبێ ئەلف وبێی کار فێربین تا پاشان بتوانین کتێبەکانی بخوێنینەوە.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە کە بە ڕاستی نیهلیستی پاشان بەدەنگێکی بەرز گوتی:

- لەگەڵ ئەوەشدا،ڕێگا بدەن کە لەیارمەتی ئێوە کەلّك وەربگرین...زۆرباشە برای ئازیز،دەڵێی کاتی ئەوەیە سەرێك لە سەرکارەکەم بدەین.

پاڤێڵ پترۆڤیچ لەسەر کورسییەکە هەستا بیێئەوەی تەماشای کەسبکا،گوتی:

- بەڵێ،بەڕاستی ئەوە بەدبەختییەکی گەورەیە کەماوەی پێنج ساڵ لەگوند بژی و لەبیروڕای گەوران بەدووربی،پێدەچێ لەوماوەیەدا بنیادەمێکی گێلت لێدەربچێ.مرۆڤ هەوڵدەدات ئەوەی فێری بووە لە بیری نەچێتەوەو کاتێك تێدەگات ئەوەی کەفێری بووە هەمووی پووچ و بێ بایەخە.خەڵکانی تر لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تۆدا دەڵێن: (تۆ بنیادەمێکی هیچ وپووچ و

نەزانی.ئیتر هیچ کەسێك ئامادەنییە لەگەڵ بیرکردنەوەکانی تۆدا بژیت. )چی بکەین؟ گەنجەکان لەئێمە ئاقڵترن.

پاڤێلّ پترۆڤیچ لەسەر پاژنەی پێی وەرسووڕاو بە ئارامی چووەدەر...نیکۆلاّی پترۆڤیچیش هەردوای ئەو وەدەر کەوت.لەگەڵ داخستنی دەرگاکە دوای چوونە دەرەوەی دووبرا،بازارۆف لە ئارکادی پرسی:

- ئەو بەردەوام ئاوایە؟

- یۆگینی گوێ بگرە.تۆ لەبەرامبەر ئەودا زۆر زیادە ڕۆیت کرد. ڕەنجاندت.

- کەوایە چۆن بیرت دەکردەوە؟پێتوابوو دەبێ ئەوخانەدانانە لەوەی کەهەن پێیان هەڵبڵێم؟ تەواوی ئەو لەخۆ ڕازیبوون وعاداتی خانەدانانەیە،گەمژانەیە.ئەگەر بەدوای شتگەلێکی واوەبوو ،باشتروابوو هەرلە پترۆسبۆرگ مابایەوەو وەدوای کاری خۆی کەوتبا...لە ڕاستیدا چ پەیوەندییەکی بەمنەوە هەیە؟..بەڕاست دەمویست بزانی کە نموونەیەکی دەگمەنم لە قالۆچەی ئاوی ناسراوبە (دیتیس کوس مارژیناتووس) دۆزیوەتەوە کە دواتر نیشانت دەدەم.

ئارکادی درێژەی بە قسەکانیدا:

- قەولم پێدابووی داستانی ژیانی ئەوت بۆ بگێڕمەوە:

- داستانی ژیانی قالۆچە.

- واز لە گاڵتەکردن بێنە.مەبەستم ژیانی مامەو ئەوسا دەبینی ئەوەندەی شیاوی گاڵتەپێکردن بێ،شایانی ڕێزە.

- من هیچ قسەیەکم نییە.بەلاّم پێم بڵێ بزانم تۆبۆچی هێندە لەبەرامبەر ئەودا دەمارگیری بەکاردێنی؟

- تۆزێك ویژدانت هەبێ.

- چ کەڵکێکی هەیە؟

ئارکادی داستانی ژیانی مامی گێڕایەوە کە خوێنەر لەبەشی داهاتوو دەیخوێنێتەوە.

## (٧)

پاڤێلّ پترۆڤیچ کیرسانۆڤیش هەروەك براکەی،سەرەتا لەماڵیّ شێوازەکانی پەروەردە فێربوو، دوای ئـەوە چـووە قوتابخانـەی سـەربازی .بـە منداڵی،جوان،بڕاوابەخۆ،شـۆخ وتووندەتـەبیات بوو.دوای وەرگرتنی پلەی ئەفسەری کەمتر کۆڕوکۆبوونەوە یەك هەبوو تێیدا بەشـدارنەبیّ. لـە هەمووشوێنێکدا پێشوازی لێدەکرا.ئەگەرچی هەندیّ جار هەڵسـوکەوتی منداڵانـەی دەنوانـد لەگەڵ ئەوەشدا لە خۆشەویستی کەم نەدەکردەوە.

ژنان شێت وشەیدای ببوون وپیاوان پاشەملە بە سووك وچرووك ناویان دەبرد، بەڵام لەناخـدا حەسوودیان پێدەبرد.هەروەکو پێشترباسمانکرد،لەگەڵ براکەی لە ماڵێدا دەژیان و لەناخی دڵەوە نیکـۆلاّی خۆشدەویست.هەرچـەندە ئـەو دوانـە هـیچ وێکنەدەچـوون.نیکۆلاّی لـە ڕۆیشـتندا دەلەنگی،هەرچەندە لەبەردڵاّن بوو بەڵام کەمێك پەشێو خـەمگین بوو.دووچـاوی گـەرەو ڕەش وپرچێکی نەرم و ناسکی هەبوو.تەمبەڵ بوو هۆگرییەکی زۆری بە خوێندنەوە هەبوو.هەوڵیدەدا کەمتر لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەرکەویّ.بەڵام پاڤێلّ پترۆڤیچ ڕێك بە پێچەوانەی ئـەوبوو.هیچ کاتێك شەوانە لە ماڵیّ نەدەمایەوە بە چووست وچالاك ناسراوبوو.ڕەنگە بەوهۆیـەوەبوویّ کـە جوومناستیکی لە نێوگەنجاندا ڕەواج پێدابوو.لە تەواوی تەمەنیدا زیاتر لـە پێـنج یـان شـەش کتێبی بە زمانی فەرەنسی نەخوێندبووەوە.لە تەمەنی بیست وهەشـت سـاڵیدا پلـەی نـەقیبی بەدەست هێنا،ئەوەش ئەوەی دەردەخست کـە ئایندەیـەکی پڕشـنگداری لـە پێشـە کەلـەناکاو دۆخەکە گۆڕا.

لەو سەردەمەدا شازادە خانمێك بەناوی (ڕ) کە تا ئێستاش لە بیری خەڵك نەچۆتەوە،ناوبەناو لـەناو خـەڵکی پترۆسـبۆرگدا دەردەکەوت.مێردەکەشـی پـەروەردەکراوبوو بـەڵام تـا ڕادەیـەك گێلۆکـەبوو و بـیّ پاشـەواربوون.هەندێجار کتـوپڕ شـازادەخانم سـەفەری دەرەوەی دەکـردو هەربەهەمان کتوپڕیش دەگەڕایەوە.بەشـێوەیەکی گشـتی ژیـانێکی پـڕ لـە نهێنـی و سـەیری

هەبوو.بە هەوەسبازو سەرسەری ناسرابوو،بەشەوقەوە حەزی لەچی بایە دەیکرد.وەك شـێتان تـا لە پەلوپۆ دەکەوت سەمایدەکرد.

پێش نیوەڕۆیان کوڕانی گەنجی لە میوانخانە تا ڕادەیەك تاریکەکەی دەهێشتنەوەو گەمـەی نا بەجێی لەگەڵ دەکردن و قاقا پێدەکەنی. بەلاّم شەوانە لەگەڵ دووعا خوێندندا دەگریا.بەزۆری تا بەیانی ئارام و قەراری نەبوو.بە ناو ژوورەکەیـدا دەهـات ودەچـوو دەسـتی خـۆی دەگەسـت وهەندێجاریش پەرێشانانە بەسەرکتێبی پیرۆزدا دەچەمایەوە.بەلاّم هەرلەگەڵ سـپێدەی بـەیانی دووبـارە دەسـتی پێدەکردەوە.دەچـووە میوانی.پێدەکـەنی و چـەنەی لێـدەداو هەرشـتێك کـە دەیتوانی سـەرگەرمی بکـا،خۆی پـێ سـەرگەرم دەکرد.لەشـوولارێکی لـە ڕادەبـەدەر جـوانی هەبوو.تاڤگـەی زێڕینـی کەزیـەکانی تـا سـەر ئـەژنۆیانی دەهات.جلوبـەرگی تـەنکوجوانی لەبـەردەکرد بـەلاّم لەسـەریەك ڕووخسـاری هێنـدەجوان نـەبوو تـەنیا چـاوەکانی دلّـڕفێن بوون.چاوەگچکەو کاڵەکانی،هەموانی گیرۆدەی خۆیدەکرد.نیگا قووڵ و بێباکەکانی تا ڕادەیەك خەمگین و تێڕامان بوون.نیگاکانی سیحراوی بوون.کە دەربـارەی بابـەتێکی بـێ مانـاو پـووچ قسەیدەکرد چـاوەکانی تیشـکێکی سەرنجڕاکێشـیان هـەبوو.پاڤێڵ پترۆڤـیچ بـۆ یەکـەمجار لـە میوانییەك دیتی و گەڕێك سەمای مازوورکـای لەگەڵـدا کردبـوو لەگـەڵ ئـەوەی لـە تـەواوی سەماکردنەکەدا جگە لەقسەی حەللەق مەللەق هیچی دیکەی لێنەبیستبوو،سەرەڕای ئەوانـەو لەهەمان کاتدا،زۆرسەیر گیرۆدەی بوو، بەو بڕوایەی کەبەخۆی بوو هەرزۆر زوو توانی بە ئامانج بگا.بەلاّم زووڕامبوونی یار ئاگری دڵی ئەوی خامۆش نەکرد بە پێچەوانە بڵێسەی ئەو عەشـقە زیاتر کڵپـەی سـەند.لەگەڵ خـۆ بەدەسـتەوەدانی ئەوژنـەش وەك پارچـەیەك لـە لەشـی خـۆی پاکوبێگەرد ڕایگرتبوو.لە دەروونی ئەو ئافرەتەدا چ ڕازێـك حەشـاردرابوو،خوادەزانێ.دەتگوت هێزێکی نادیار ئەوی ئەسیری خۆیکردووە کە تەنانەت خۆیشی شـتێکی وای دەربـارەی هێـزی ئەوسڕە نەدەزانی.تەواوی هەڵسووکەوتی سەیر دەهاتە بەرچاو.

تەنیا شتێك کە گومانی لای مێردەکەی پەیداکردبوو ئەو نامە نهێنیانەبوون کە شازادەخانم بۆ کەسێکی نادیاری دەنووسین.کەسێکی نادیار کـە خۆیشـی نەیدەناسی.عەشـقی ئـەو پڕبـوو لەخەم.لەگەڵ ئەوکەسە جۆرێکی دیکەبوو نەلەگەڵی پێدەکەنی و نە سووحبەتی لەگـەڵ دەکـرد تەنیا بە سووکایەتییەوە گوێی لێدەگرت و لـەو کاتانـەدا قیافـەی دڕندانـەی دەنواند،دەچـووە ژوورەکەی خۆی دەرگای دەادەخسـت و ئەگەرخزمەتکارەکـەی گـوێی بـەدەرگاوەنابا،دەیتوانی

دەنگی هەنیسکی ببیستێ.چەندین جارو بەردەوام،هەرکاتێك کیرسانۆف دەگەڕایەوەماڵێ،لە دەروونی خۆیدا هەستی بە تاڵییەکی لە ڕادەبەدەر دەکرد کە تەنیا دوای شکانە حەتمییەکان لەمرۆڤدا دەردەکەون.لەخۆیدەپرسی:بۆ مەگەر چیم دەویست کە پێی نەگەیشتووم،کە هەستێکی ئاوا لەوشێوەیەم هەیە؟بەلاّم نەیدەتوانی خۆی ڕازیبکا.

ڕۆژێك ئەنگوستیلەیەکی جوان کە سەری(ئیسفەنکس)ی لە سەر هەڵکەندرابوو بە دیاری دای بە شازادەخانم.شازادەپرسی:

- ئەوە چییە؟ئیسفەنکسە؟[1]

- بەڵێ،ئەو ئیسفەنکسە تۆی.

شازادە بە هێمنی سەیرێکی کردو گوتی:

- من؟

پاشان بەهەمان نیگای سەیرو بزەیەکی تەوساوییەوە گوتی:

- تۆ زیادەڕۆیی دەکەی.

هەرکاتێك شازادەخانم هۆگری خۆی پێدەبەخشی واش پاڤێڵ پترۆڤیچ هەستی بەنیگەرانی و عەزابی رووحی دەکرد.پاش ماوەیەکی کەم،شازادەخانم بەرامبەری ساردبوو ئەو بابەتەش کاری پاڤێڵ پترۆڤیچی گەیاندە ڕادەی شێت بوون.خۆی ئازاردەدا،زۆر ئیرەیی پێوەدەبرد.بۆ هەمووشوێنێك بەدوایەوە بوو بۆ ساتێکیش جێی نەدەهێشت.سەرەنجام شازادە لەدەستانی وەزاڵەهات و بڕیاریدا بۆ دەرەوەی ولاّت سەفەربکات.کیرسانۆف سەرەڕای ئەوەی هاوڕێ و گەورەکانی هەوڵیاندا لە بڕیارەکەی ژەوانی بکەنەوە،دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و وەدوای دڵدارەکەی کەوت.چوارساڵی ڕەبەق لەولاّتی بێگانەندا ژیا.هەندێجار وەکوسێبەر بەدوایەوەبوو هەندێجاریش ونیدەکرد.لەو هەڵسووکەوتەی خۆی بێزاربوو...بەلاّم هیچ شتێك نەیدەتوانی لەو داوەی کە تێیکەوتبوو ڕزگاریبکا.

هیچ شتێك نەیدەتوانی ڕووخساری لەبەردلاّن و لە هەمانکاتدا شاردراوەی ئەوژنەی لەبیر بەرێتەوە.سەرەنجام لە شاری (بادن) دووبارە لە خۆشەویستەکەی نزیککەوتەوەو وەکو دەڵێن شازادەخانم هیچ کاتێك ئەوی هێندە خۆشنەویستووە....بەلاّم دوای مانگێك تەواوی ئاگری سۆزو خۆشەویستی شازادەخانم کوژایەوە.پاڤێڵ پترۆڤیچ کە هەستی بەبێوەفایی یارەکەی

---

[1] - گیاندارێکی ئەفساتەییە کە لە ئەفسانەکانی یۆنان و میسردا باسی کراوە.

کردبوو هەولێدا لانیکەم هاوڕێیەکی باشبێ بۆی.بێئاگا لەوەی کە هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکی وادا بێسوودە... شازادەخانم بەشێوەیەکی کتوپڕ شاری بادنی جێهێشت و دوای ئەوە بەردەوام لەدەست کیرسانۆف ڕایدەکرد.

پاڤێڵ پترۆڤیچ گەڕایەوە ڕووسیاو هەولێدا ژیانی ڕابردوو لەبیر بەرێتەوە بەلاّم لەوکارەیدا سەرکەوتوونەبوو.وەك شێتان سەری بە هەمووجێگایەکدا دەکرد.بەردەوام سەفەری دەکرد هەولێدەدا تا، داب ونەریتی ئاغاواتییەك بەکاربێنێ.دەیتوانی بەدووسێ سەرکەوتنی سنووری خۆی بنازێ بەلاّم ئیدی نەلەخۆی و نەلە هیچ کەسێکیش داواو چاوەڕوانی نەبوو.

بە تێپەڕینی ڕۆژگارو سپی بوونی قژی،پیری دەرکەوت.شەوانە لەیانەکان لەگەڵ ڕەبەنەکان دادەنیشت (کە دیارە چەندەکارێکی خراپە) گفتوگۆو دانیشتن لەگەڵ ئەوانە ببووە پیشەی هەمیشەیی.دیاربوو بەهیچ شێوەیەك بیرلە ژنهێنان ناکاتەوە.دەساڵی بەوشێوەیە بردەسەر.دەسالێك کەبە چاوقووچانێك دەچوو.لە هیچ کوێی دنیادا کات زووتر لەڕووسیا تێناپەڕێ،ئەگەرچی واباوە کە تێپەڕینی کات لەزینداندا خێراترە.ڕۆژێك لە یانەیەکدا لە سەرمێزی نانخواردنی نیوەڕۆ هەواڵی مەرگی شازادە خانمی بیست.لەسەر مێزەکە هەستاو ماوەیك لە هەمان ژووردا هات و چوو پاشان لەپێش کۆمەڵێك ڕاوەستا کە خەریکی یاری وەرەق بوون.دەتگوت وشکبووە.تا ئەوکاتەی یاری بەردەوام بوو،لە هەمان جێگا ڕاوەستاو نەجوولا،پاشان کەمێك درەنگتر لەوادەی خۆی گەڕایەوە ماڵێ.دوای چەند ڕۆژێك زەرفێکی بە دەست گەیشت کە لەناویدا ئەنگوستیلەیەکی بینی هەمان ئەنگوستیلەبوو کە بە دیاری دابوویە شازادەخانم.شازادەخانم لەسەر ئیسفەنسەکە وێنەی خاچێکی کێشابوو ویستبووی بە پاڤێڵ پترۆڤیچ بڵێ کە ڕازی ئیسفەنسەکە،خاچە.ئەو ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆساڵی١٨٤٨یانی هەمان ساڵی کە نیکۆلای پترۆڤیچ هاوسەرەکەی لەدەستدابوو و گەڕابووەوە بۆ پترۆسبۆرگ.

پاڤێڵ پترۆڤیچ ئەوکاتی براکەی گەڕابۆوە بۆگوند،نەیدیتبوو.زەماوەندی نیکۆلاش لە زەمانێکدابوو کە ئەو ڕۆژانەی ئاشنابوونی لەگەڵ شازادەخانمدا تێدەپەڕاند.پاڤێڵ پترۆڤیچ چووەلای براکەی تا دوومانگێك میوانی بێت،بەلاّم لە هەفتەیەك زیاتر نەیتوانی لەلای وەمێنێ.هەمووشتێکی ئەودوو برایە لەیەك جیاوازبوون.

بەلاّم لەساڵی١٨٤٨ئەو نێوانە ڕووی لەکەمی کرد.نیکۆلای پترۆڤیچ هاوسەرو شەریکی ژیانی خۆی و پاڤێڵ پترۆڤیچیش بیرەوەری شیرینی ڕابروویان لەدەستدابوو.پاڤێڵ پترۆڤیچ

هەولێدەدا بیرلەشازادە خانم نەکاتەوەو نیکۆلاێ پترۆڤیچیش سەرەڕای ئەو هەموو خەم وئەندێشەیە زۆردڵخۆشبوو.پێیوابوو ژیانێکی خۆشی هەبووەو کوڕەکەشی ڕۆژ بەڕۆژ گەورەتر دەبێ.لە کاتێکدا پاڤێل ڕێك بە پێچەوانەی ئەو،تەنیاو بێکەس پێیدەنایە دەورانی تاریکی ژیانی خۆی.ئەو دەورانە بۆ پاڤێل پترۆڤیچ لە وانیدیکە سەختتربوو چوونکە ئەو بە لەدەستدانی ڕابردووی،هەمووشتێکی خۆی لەدەستدابوو.ڕۆژێك نیکۆلاێ پترۆڤیچ بە براکەی گوت:

- من ئێستا بۆ مارینۆ بانگهێشتت ناکەم (ئەو بەیادی هاوسەرەکەی مارینا،ناوی گوندەکەی نابوو مارینۆ.) چوونکە لەسەردەمی ژیانی هاوسەرەکەمدا لەوێ بێتاقەت دەبووی بەلاّم ئەگەر ئێستا بێیەوێ شێت دەبی.پاڤێل پترۆڤیچ بە هێمنی وەلاّمی دایەوە:

- ئەوکات گەنجێکی سەرکێش بووم و لەو کاتیشەوە تا ئێستا ئەگەر ژیرتر نەبووبم لانیکەم هێمنترم.ئەگەر ئیزن بدەن دەمەوێ بۆ هەمیشە لە ماڵەکەی تۆدا بمێنەوە.

لەجیاتی وەلاّم،نیکۆلاێ پترۆڤیچ براکەی لەباوەشگرت.بەوشێوەیە ساڵ ونیوێکی پێچوو تا پاڤێل پترۆڤیچ بڕیارەکەی خۆی گەیاندەسەر.بەلاّم کاتێك لە گوند گیرسایەوە هیچ کات ئەوێی جێنەهێشت.تەنانەت ئەوسێ زستانەش کە نیکۆلاێ پترۆڤیچ لە پترۆسبۆرگ لەلای کوڕەکەی بوو،ئەو لەجێگای خۆی نەبزووت.بەردەوام خۆی بەخوێندنەوەی کتێبی ئینگلیزیەوە خەریکدەکردو هەولێدەدا تا لەژیانیدا پەیڕەوی دابو ڕەسمی ئینگلیزەکان بکات.

کەمتر سەری لە دراوسێکان دەدا تەنیا هەندێجار بۆ کاتی هەڵبژاردن لەماڵ دەهاتەدەر.لەکاتی هەڵبژاردندا بێدەنگ ڕادەوەستا.هەندێ کاتیش ئاغاپیرەکانی بەکردارەسەیرەکانی خۆی نیگەراندەکردو ئەوانی دووچاری سەرسامی دەکرد.لەگەڵ نوێنەرە گەنجەکاندا هیچ چەشنە تێکەلاّویەکی نەبوو.هەم وەچەی کۆن وهەمیش وەچەی نوێ خۆشیان نەدەویست و لەهەمان کاتیشدا بە خاتری ڕەفتاری ئەشرافیانەی و پۆشینی جل وبەرگی جوان و نانخواردنی لە باشترین چێشتخانەکانداو بەیادی ئەوینەکەی و لێهاتوویی لە قوماری(ویست)دا پێیان هەڵدەگوت،هەرچەندە زۆربەی جارەکانیش دەدۆڕا.هەتا دەنگۆهەبوو کە لەماڵی لووئی فلیپ لەگەڵ ولینگتۆن نانیخواردووە.ژنان چەشنەخەمێکی سەرنجڕاکێشیان تێدابەدی دەکرد،بەلاّم ئەوگوێی نەدەدانێ.

* * *

ئارکادی لەکۆتایی چیرۆکی ژیانی مامیدا گوتی:

- یۆگینی،قبوولّتە کـە دەربـارەی مـامم بەویژدانـەوە داوەریـت نـەکرد؟من هێشـتا پـێم نەگوتووی کەئەو چۆن وچەندین جار سەروەت وسامانی خۆی خستۆتە بەردەستی بابم تانـەجاتی بدات...تەنانەت ناشزانی کەئەو دووبرایە هێشتا میراتیان بەشنەکردووە.مامم لەیارمەتیـدانی خەڵکی دریغی ناکا هەتا ڕەعیەتەکانیش،ئەگەرچی لە کاتی قسەکردن لەگەڵیانـدا ناوچـەوانی تێکدەنێو بۆنی ئۆدکلۆن لە خۆیدەدا...

بازارۆف هاتەناو قسەکانی هاوڕێکەیەوەو گوتی:

- هەڵبەتە ئەوکارانە دەکات چوونکە مێشکێکی ئاڵۆزی هەیە.

- ڕەنگە قسەی تۆبێ.بەلاّم بەڕاستی مرۆڤێکی دلّپاکە.بنیادەمێکی بەئەزموونـەو نـازانی دەتوانێ چ ڕاسپاردەوپێشنیارێکی باش بکات.بەتایبەتیش دەربارەی ئافرەتان...

- ڕاستە،ئەو کەسێکی کاملّەو هەولّدەدات خەڵکانی دیکـە لـە سـووتانی ژنانـدا وەئاگـا بێنێتەوە.

- بەهەرحالّ،باوەڕبکە کەسێکی بەدبەختەو ڕق لێبوونەوەی بەڕاستی گوناهە.

بازارۆف ناڕازیبوو:

- کەس ڕقی لێنابێتەوە.من تەنیا دەڵێم مرۆڤێك کە تەواوی تەمـەنی بـەدوای عەشـقێنی لەگەلّ ژنێکدا بەسەربردبێ و چوونکە نەتوانێ دریژەی پێبدا،خۆی بەبێچـارە بزانـێ ئەومرۆڤـە پیاو نییەو تەنیا دەکرێ لە ڕیزبەندی گیانلەبەرە نێرینەکان بژمێردرێ.تۆپێتوایە ئەو مرۆڤێکـی بەدبەختە،ڕەنگەحەقت بێ.بەلاّم هێشتاش هەندێك تایبەتمەنـدی خراپـی لـە ناخداهەن.بـەهۆی ئەوەی کە گۆڤاری زانستی دەخوێنێتەوەو هـەرمانگی جاێـك جووتیارێـك لـە شـەللاق لێـدان دەبەخشێ،خۆی بەگەورە دەزانێ.

- بەلاّم دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگری ئەو لە چ دەورانێکدا پەروەردە کراوە.

- پەروەردە!...هەرکـەس پێویسـتە مامۆسـتای خـۆی بێـت.بۆ مەگـەرمن چـۆن خـۆم درووسـتکرد؟...ئەوانیدیکەش دەتـوانن و پێویسـتە ئەوکارەبکەن.بـەلاّم بەنسـبەت زەمەنەوە،بۆدەبێ گرفتار و ئەسیری زەمەن بین؟ واباشترە زەمەن بەئارەزووی ئێمە بسووڕێ نەك ئەوەی ئێمە بە ئارەزووی ئەو .نا هاوڕێ ئەوانە هەمووشـتێك نـین بێجگـە لـە فەسـادو هـیچ وپووچی.دەربارەی پەیوەندی نێوان پیاوو ژنـیش کەباسـیدەکەی،ئێمە باشـتر دەزانـین کـە ئـەو

پەیوەندییە چ جۆرە پەیوەندییەکە.تۆ پێکهاتەی چاو لەبەرچاوبگرە،لەکوێ دەتوانی لەو نیگا سیحراویانە ئەسەرێك وەبینی.بابڕۆین سەرێك لە قالۆچەکانی خۆمان بدەین.

دووهاوڕێ بەرەو ژووری بازارۆف وەڕێکەوتن.

ژوورێك کە تێیدا بۆنی دەرمانی پزیشکی و تووتنی هەرزان بەهای لێدەهات.

## (٨)

پاڤێلْ پترۆڤیچ ماوەیەك بێدەنگ ڕاوەستاو گوێی لە براکەی دەگرت کە لەگەڵ سەرکارەکەی دەدوا.سەرکارەکەی پیاوێکی بالاّبەرزی دالّەگۆشت بوو کە دەنگێکی شیرین وچاوێکی فێلاّوی هەبوون و بە وشەگەلی وەکوو(بەلّیّ قوربان) (فەرماندەکەی قوربان) (ئاشکرایە قوربان) وەلاّمی دەدایەوە.هەولّیدەدا تا ڕەعیەتەکان بە دزوو ئارەق خۆر لەقەلّەم بداو هەموو خەتاکان بخاتە ئەستۆی ئەوان.کاری کشتووکالّی کە ماوەیەکبوو بەشێوازی نویّ کەوتبووەگەڕ وەکوو چەرخێك دەچوو کە باش چەورنەکرابیّ، یان وەك قەنەفەیەك کەلە داری تەڕ درووستکرابیّ باش نەدەچووەپێش.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ هەستی بەنیگەرانیدەکردو خەمی دەخوردو ئاخی هەلّدەکێشاو لە گژفکران رادەچوو.هەستیدەکرد ژیانی بەبیّ پارە ناڕواتەپێش وپاشەکەتەکەشی بەرەو تەواوبوون بوو.ئارکادی ڕاستیدەکرد کە پاڤێلْ پترۆڤیچ چەندین جار بە پارەکانی یارمەتی براکەی داوە.چەندین جار کاتێك نیکۆلاّی پترۆڤیچ لە سەروکەللەی خۆیدەدا تا ڕێگاچارەیەك وەبینیّ،پاڤێلْ پترۆڤیچ دەهاتە بەرپەنجەرەو بەزمانی فەرەنسی پێیدەگوت: من دەتوانم قەرزت لەگەلّدابکەم.پارەی دەدایە.بەلاّم ئەمرۆ ئەویش هیچی بە بەرەوە نەمابوو هەرلەبەر ئەوەشبوو هەولّیدەدا تا لەو بارەیەوە خۆ تێهەلّنەقورتێنیّ.کێشەی زەویوزار هەمیشەماندووی دەکرد پێیوابوو کە نیکۆلاّی پترۆڤیچش بە باشی ناتوانیّ ئەوکارە ڕاپەڕێنیّ.بەلاّم ئەگەر لێیان پرسیبا نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەکوێدا بەهەلّە چووە،وەلاّمێکی نەبوو بیداتەوە لەبەر خۆیەوە بیریدەکردەوە کە:

- کاکم هێندە لە کارەکاندا شارەزانییە...فێلّی لێدەکەن.

بەلاّم نیکۆلاّی پترۆڤیچ ڕێك بە پێچەوانەی براکەی پێیوابوو کە پاڤێلْ پترۆڤیچ مرۆڤێکی زیرەك و شارەزایەو لە تەواوی کارەکانیدا پرس و ڕاوێژی پێدەکردو دەیگوت:

- من بنیادەمێکی لاوازم کە زۆربەی تەمەنم لە دێداگوزەراندووە لە کاتێکدا تۆ لەگەلّ خەلّکدا ژیاوی و ئەوان باشدەناسی.تۆ وەك هەلّۆیەکی چاوتیژوای.

پاڤێلّ پترۆڤیچ لەبەرامبەر قسەکانی براکەیدا تەنیا سەری وەردەگێڕاو هەولّێنەدەدا بیروڕای بگۆڕێ.

پاڤێلّ پترۆڤیچ دوای ئەوەی لە ژوورەکەی نیکۆلاّی پترۆڤیچ چووەدەر،لە ڕاڕەوەکە، کە هەیوانەکەی لە پاشخانەکە جیادەکردەوە دەڕۆیشت و کاتێك گەیشتە بەردەم دەرگایەکی بچووك ڕاوەستاو لەفکرەوەچوو.پاشان دەستی بەسمێلّەکانیدا هێناو لە دەرگایدا.

دەنگی فنیچکا لەودیو دەرگاکەوە بیسترا:

- کێیە؟ فەرموو وەرە ژوورێ.

پاڤێلّ پترۆڤیچ گوتی:

- منم.

دەرگاکە کرایەوە.فنیچکا کە لەسەر کورسییەك دانیشتبوو منداڵەکەی بە باوەشەوەبوو لە جێگاکەی هەستا.منداڵەکەی دایەدستی قەرەواشەکەو قژەکانی خۆی ڕێککرد.

پاڤێلّ پترۆڤیچ بێئەوەی تەماشای بکا گوتی:

- لەوەی کاتم گرتووی دەمبووری.بیستوومە قەرارە کەسێك بچێتەشار.تکادەکەم بفەرموون هەندێك چای سەوزم بۆ بکڕن.

- لە خزمەتدام.بفەرموون چەندی بکڕن؟

- پێموایە نیوکیلۆ بەسە.

چاوێکی بەدەوروبەردا گێڕاو دواتر بەرەولای فنیچکا گەڕایەوەو گوتی:

- دەلّێی ئێرەگۆڕانی بەرسەرداهاتووە.

کاتێك زانی فنیچکا لەمەبەستەکەی نە گەیشتووە،گوتی:

- پەردەکان دەلّێم.

- بەلّێ،ڕاستە،مەبەستی جەنابت پەردەکانن.ئەوانە نیکۆلاّی پترۆڤیچ کڕیونی.ماوەیەکە هەلّمواسیون.

- بەلّێ،ماوەیەکیشە من نەهاتوومە ئێرە.لێرەڕازی؟

- لە سۆزی نیکۆلاّی پترۆڤیچەوە،خراپ نییە.

پاڤێلّ پترۆڤیچ بەڕێزەوەو بیٚ پێکەنین پرسی:

- ئێرەت باشترە یان ئەوجێگایەی کە پێشتر لێیدەژیای؟

- بێگومان،ئێرە.
- ئێستا کێ لەوێ دەژی.
- جل شۆرەکان.
- ئاوا.

پاڤێلێ پترۆڤیچ بێدەنگ بوو،فنیچکا لەو بیرەدابوو کە هەر ئێستا دەڕوات بەلاّم پاڤێلێ پترۆڤیچ نەڕۆیشت و فنیچکا لەشوێنی خۆی وەستابوو یاری بەپەنجەکانیدەکرد.

پاڤێلێ پترۆڤیچ دووبارەپرسی:

- بۆ منداڵەکەت دانێ بیبەن.من منداڵم خۆشدەوێن.ئیزن دەدەن بیبینم.

فنیچکا لەخۆشیان و لەشەرمان سوورهەڵگەڕا.ئەو لە پاڤێلێ پترۆڤیچ دەترسا،بۆیە کەمترقسەیدەکرد.

- دوونیا،میتیای بێنە(فنیچکا هەموانی،بەئێوە ناودێنا)...نا پەلەی مەکە با جلوبەرگی لەبەربکەم.

هەرلەوکاتەدا چووە دەرەوە.

-پێویست ناکا تۆبڕۆی.پێویست ناکا منداڵەکە بگۆڕی.

فنیچکا بەپەلە چووە دەرەوەوگوتی:

- هەرئێستا دەگەڕێمەوە.

پاڤێلێ پترۆڤیچ بەتەنیا مایەوەو ئەوجار بەدیقەتەوە لە دەوروو بەرەکەوە ڕاما.ژوورەکە بچووك وخاوێن بوو،بۆنی گوڵە بابوونەی لێدەهات.دەوران دەوری ژوورەکە بەکورسی گیرابوو کە پشتە کەیان بەشێوەی کەوانەیی دروستکرابوون.ئەو کورسیانە مەرحومی ژەنەراڵ لە کاتی هێرشەکەی سەرپۆڵۆنیا لەوێی هێنابوون.لە سووچێکی ژوورەکە سندووقێکی ئاسنی سەرئاوالاّی لێبوو تەختەیەکی بچووك کە ڕووپۆشێکی حەریریان بەسەر هەڵکێشابوو لە سووچێکی تر دانرابوو.لەبەردەم وێنەی نیکۆلاّی بۆ چاوەزار هێلکەمریشکێکی ڕەنگ کراوی پێداهەڵواسرابوو،مۆمێکیش دەسووتا.

لەسەر پەنجەرەکان مرەبای ساڵی پار بەشێوەیەکی ڕێکوپێك هەڵچنرابوون کە تیشکێکی سەوزیان تێدا دەبینرا.لەسەر شووشەکان فنیچکا بەخەتی خۆی و بەئیملایەکی هەڵە نووسیبووی:هەنگوینی فەرەنگی.نیکۆلاّی پترۆڤیچ زۆری حەز لەومرەبایەبوو.قەفەسێك بە

پەتێکی درێژەوە هەڵواسرابوو کە(سەیرەباڵسوورەیەك)ی بچوك لەناویدابوو دەیخوێندو هەڵبەزو دابەزی دەکردو قەفەسەکەی دەجولاند.لەمابەینی نێوان پەنجەرەکاندا،لەسەروی دۆلابەکە چەند وێنەیەکی نیکۆلای پترۆڤیچ دەبینران ئەو وێنانە وێنەگرێکی گەڕۆك کێشابوونی.وێنەیەکی فنیچکاش لەوێ دەبینرا کە ئەویش زۆرخراپ کێشرابوو.لە سەرووی ئەو وێنەیەشەوە وێنەیەکی ژەنەراڵ یەرمۆلۆف دەبینرا کە پاڵتۆیەکی بە شانیدا دابوو،نیگا تووڕییەکەی لە کێوەکانی قەفقازوە بڕیبوو.لە سەرووی وێنەی ژەنەراڵ پێلاوێکی بچووکی ئاوریشمی هەڵواسرابوو کە فنیچکا وەکو دەرزیدان کەڵکی لێوەردەگرت.پێلاوەکە وێنەی ژەنەراڵ یەرمۆلۆفی داپۆشیبوو.

دوای تێپەڕینی پێنج شەش دەقیقە،دەنگی خشەخشی جلوبەرگ و دوای ئەویش ورتەورتێك هات.پاڤێل پترۆڤیچ لەسەر دۆلابچەکە کتێبێکی تۆزاوی و بەرگدڕاوی دەستدایە.کتێبەکە لە کتێبەچەند بەرگیەکانی(نیشانە شکێنەکانی مالسکی)بوو.پاڤێل پترۆڤیچ کتێبەکەی هەڵدایەوە....دەرگا کرایەوەو فنیچکا وەژوورکەوت.منداڵەکەی بە باوەشەوەبوو.منداڵە کراسێکی سووری یەخەگوڵوزی کراوی لەبەردابوو.منداڵەکە پرچی داهێنرابوو،ڕووخساری خاوێن و هەناسەکانی قوورسبوون.بەشێوەیەك هەرکاتێك هەناسەی دەدا لەشیدەجولا،وەك تەواوی منداڵە ساغەکان،ئەویش ئارام وقەراری نەبوو بەردەوام دەست وپێی ڕادەوەشاند.جلوبەرگی جوان ونوێ دەوری خۆیان هەبوو،لەبەرئەوەی منداڵەکە لەوەی کەهەبوو جوانتر دەهاتەبەرچاو.فنیچکا لەگەڵ ئەوەی پێویستی بەوەنەبوو،پرچی شانەکردبوو دەسماڵێکی نوێی بەسەری خۆیدا دابوو.ئەرێ دەکرێ لە دنیادا شتێکی جوانتر لەو دایکە ببینی کە منداڵێکی لەش ساغی لەباوەشدایە.؟

پاڤێل پترۆڤیچ بەپەنجەی دۆشاومژە،گەرووی منداڵەکەی ختووکە داو گوتی:

- ئەی،خەپەتۆڵە.

منداڵەکە چاوێکی لە باڵندەکەکردوو پێکەنی.

- ئەوە مامەگیانە.

لەوکاتەدا دوونیا مۆمێکی داگیرساندبوو لەپەنا پەنجەرەکەی داناو بۆئەوەی بەرنەبێتەوە شتێکی لەژێردانا.

پاڤێل پترۆڤیچ پرسی:

- چەند مانگەیە.

- شەش مانگە.یازدەڕۆژی دیکە دەبێتە حەوت مانگ.
دوونیا بێئەوەی هەست بەشەرم بکا هاتەناو قسەکانیانەوەو گوتی:
- خانم،وەك ئەوەی دەبێتە هەشت مانگە.
- نەخێر،حەوت مانگە.
منداڵە دووبارە پێکەنی و ئەوجار سەیری سندووقەکەیکرد پاشان بەهەر پێنج پەنجەکانی چنگی لە دەمولێوی دایکی گیرکرد.فنیچکا بێئەوەی ڕووی وەرگێڕێ گوتی:
- ئەی شەیتان.!
- زۆر وەك کاکم دەچێ.
فنیچکا لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:
- ئەدی دەبێ وەك کێی دیکەبچێ.
پاڤێڵ پترۆڤیچ وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێ:
- بەڵێ،زۆر وەویدەچێ.
پاشان بەنیگایەکی خەمگینانە سەیری فنیچکایکرد.فنیچکا دووبارە ورتەورتی دەکرد:
- ئەوەمامە گیانە.
دەنگی نیکۆلای پترۆڤیچ دەهات:
- پاڤێڵ.تۆلێرەی؟
پاڤێڵ پترۆڤیچ بەپەلە گەڕایەوەو نێوچەوانی تێکنا بەلاّم ڕووخسای براکەی هێندە درەوشاوەبوو کە ئەویش ناچاربوو خەندەیەك بکاو لەگەڵ تەماشاکردنی کاتژمێرەکەی دەستی گوتی:
- منداڵێکی زۆرباشت هەیە...بۆ ڕاسپاردنی چای سەوز هاتبوومە ئێرە.
دەست بەجێ چووەدەر.نیکۆلای پترۆڤیچ لە فنیچکای پرسی:
- بۆخۆی هاتبوو یان بانگت کردبوو.
- بۆخۆی هات.لە دەرگایداو هاتەژوور.
- زۆر باشە.بزانم ئارکادی نەهاتۆتەوەئێرە.
- نەخێر...نیکۆلای پترۆڤیچ ئایا باشترنییە من بچمەوە جێی پێشووم.
- بۆچی؟

- ڕەنگە ئەویێ باشتربێ ئەوچەند ڕۆژەش هەرلەوێبم.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ دەستێکی بەناوچەوانیدا هێناو ماوەیەك لەگژفکران ڕاچوو:

- ن...نا...دەبێ پێشتر...

لەناکاو بەخۆشحالّییەوە بەرەو لای مندالّەکەی ڕۆیشت.ماچیکردو گوتی:

- سەلام خرتۆلّە.

دواتر کەمێك داهاتەوەو دەستەکانی فنیچکای ماچ کرد،کە لەسەر کراسەسوورەکەی میتیا وەك شیر سپی دەچوون.

فنیچکا بەشەرمەوە گوتی:

- نیکۆلاّی پترۆڤیچ چیدەکەی؟

پاشان نیگاکانی شۆڕکردنەوە.کاتێك سەری بەرزکردەوە چاوەکانی هەروا جوان و سەرنجڕاکێشی تایبەتی خۆیان هەبوو.

* * *

داستانی ئاشنایی نیکۆلاّی پترۆڤیچ و فنیچکا بەوشێوەیە.

سێ سالّ لەمەوبەر،ڕۆژێك نیکۆلاّی پترۆڤیچ بە ناچاری شەوێك لە میوانخانەی شارێکی بچووك ڕۆژی کردەوە.لە پاکوخاوێنی ژوورەکەو ئەو نوێنو بانەی کە دابوویانێ سەری سووڕمابوو لەبەرخۆیەوە گوتبووی کە خاوەنی میوانخانە حەتمەن دەبێ ژنێکی ئەلّمانی بێ،بەلاّم بەپێچەوانەی ئەوەی کەپێیوابوو،خاوەنەکەی ژنێکی پەنجاسالّەی خەلّکی ولاّتەکەی خۆی بوو کە زۆر پاکوخاوێن جلی دەپۆشیو خاوەن بیرێکی باش و هەلّسوکەوتێکی سەنگین بوو.نیکۆلاّی پترۆڤیچ لە کاتی چای خواردنەوەدا باسەکەی لەگەلّ کردەوەو دلّی گرتی.بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە ڕێك ئەو ڕۆژەبوو کە نیکۆلاّی پترۆڤیچ کەلوپەلی بۆ ژوورەکەی دەگواستەوەو حەزیشی نەدەکرد کەس لەخزمەتکارەکۆنەکانی لەلای خۆی بگێڕێتەوە،بڕیاریدابوو کەسێکی تازە دامەزرێنێ.لەلایەکی دیکەشەوە خاوەن میوانخانەکەش گلەیی لە بێ مشتەری و کزی کارەکەی هەبوو، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە نیکۆلاّی پترۆڤیچ پێشنیار بەژنەبکا بۆ بەڕێوەبردنی مالّەکەی،ژنەش ئەو پێشنیارەی پەسەندکرد چوونکە ماوەیەك بوومێردەکەی مردبوو تەنیا یادگاری کچێك بوو ئەویش فنیچکابوو.

دوای سێ هەفتە،خانمی پەنجاوچوارساڵە،ئارینا ساڤیشنا لەگەڵ کچەکەی گواستیانەوە بۆ مارینۆ.نیکۆلای پترۆڤیچ هەڵبژاردنێکی باش و بەجێیکردبوو.ئارینا ماڵەکەی بەڕێوەدەبردو کیژەحەڤدە ساڵەکەشی کەمتر دەهاتەبەرچاو و هیچ کات باسینەدەکرا.کیژە ژیانێکی سادەوئارامی هەبوو.تەنیا هەندێجارو ڕۆژانی یەکشەممە نیکۆلای پترۆڤیچ کاتی دووعاکردن لە کلیسا بە تیلەی چاو دەیبینی کەجوان ولەبارە.ساڵێك بەوشێوەیە تێپەڕی.ڕۆژێك بەیانییەکەی ئارینا هاتەژووری نیکۆلای پترۆڤیچ دوای سڵاوکردن داوای لێکرد یارمەتی کچەکەی بدات.کە لەگەڵ هەڵکردنی سۆپادا زیلکی ئاگر کەوتبووە چاوی فنیچکاوە.نیکۆلای پترۆڤیچیش وەك تێکڕای ئاغاکان خۆی ئەرکی چارەسەرکردنی خزمەتکارو ڕەعیەتەکانی لە ئەستۆ دەگرت،هەربۆیە داوودەرمانی تایبەتی لەماڵێ هەڵدەگرت. فەرمانیدا هەرچی زووترە کیژەی ئامادەبکەن.فنیچکا لە ئامادەبوونی بەرامبەر ئاغاکەی ترسا بەڵام بەناچاری لەگەڵ دایکی ڕۆیشت.نیکۆلای پترۆڤیچ بردیە بەردەم پەنجەرەکە،سەری بەرز کردەوەو لەناو دەستی خۆیگرتن دوای تەماشاکردنی چاوەسوورو ئاوساوەکەی فەرمانیدا مەڵحەمێك ئامادەبکەن.دەستبەجێ بۆخۆی خەریکی دروستکردنی بوو.دوای دروستکردنی مەڵحەمەکە دەستەکانی خاوێنکردنەوەو شێوازی دەمانکردنی چاویشی فێرکرد.فنیچکا فەرمانەکانی نیکۆلای پترۆڤیچی بە سەرنجەوە گوێ لێگرت ویستی لەژوورەکە بچێتەدەر کە دایکی پێیگوت:

- دەستی ئاغات ماچکە،گێلە.

نیکۆلای پترۆڤیچ ڕێگای پێنەدا ئەو کارەبکاو لەبەرامبەردا کە کیژە سەی بەردابۆوە،سەری ماچکرد.زۆرزوو چاوی فنیچکا چاکبووەوە بەڵام یادی ئەوڕۆژە تا درەنگ مێشکی ئاغاکەی بەخۆیەوە خەیککرد.ڕووخساری ناسك و سپی فنیچکا بەردەوام لەیادی نیکۆلایدا مایەوە.قژەخاوەکەی لەناو دەستانیدا هەستپێدەکردو ددانەکانی کەلەژێر تیشکی خۆردا وەکومرواری دەدرەوشانەوە هیچ کات لەبەر چاوی لانەدەچوو.لەوە بەدواوە،نیکۆلای پترۆڤیچ لە کلیسا کەمتر چاوی لەسەر هەڵدەگرت و هەوڵیدەدا سەری قسەی لەگەڵبکاتەوە.

سەرەتا فنیچکا لێیدەترساو تەنانەت ڕۆژێك نزیکی خۆرئاوابوون لە ڕێگایەکی تەنگەبەردا لەگەڵ نیکۆلای پترۆڤیچ تێکهەڵنگوت و بۆئەوەی ئاغا نەیبینێ،لە پشت گوڵەشینەکان و گژوگیادا خۆی حەشاردا.کیرسانۆف کەسەری ئەوی لەودیو هێشوە زەردەکانەوە دیتبوو بەدەنگێکی دڵگیرەوە گوتی:

- سلاۆفنیچکا،مەترسێ ناتگەزم؟

فنیچکا بێئەوەی لەجێگای خۆی بجوڵێ بەهێمنی وەلامی سلاوی دایەوە.

بەرەبەرە کیژە خووی بە نیکۆلای پترۆڤیچەوە دەگرت بەلام لە ئامادەبوون لە بەرامبەریدا دەترسا تا ئەوەی کە ئارینا بەهۆی تووشبوونی بە نەخۆشی کۆلێرا گیانی لەدەستداو کیژەی لەودنیایە بەتەنێ جێهێشت.فنیچکا دەیتوانی بچێتەکوێ وپەنا بۆکوێ بەرێ؟ هەموو خوو ئاکارێکی جوانی لە دایکیەوە بۆ مابۆوە،تاکو تەنیا...گەنج وجوان...نیکۆلای پترۆڤیچیش زۆرمیهرەبان بوو...پاشماوەی داستانەکەش ئاشکرایە.

* * *

نیکۆلای پترۆڤیچ دووبارە پرسیاریکرد:

- کاکم بێ ئاگاداری هاتەلات و لە دەرگای داو هاتەژوور.

- بەڵێ قوربان.

- زۆرباشە.ئێستا میتیام بدەیە با کەمێك یاری لەگەڵدا بکەم.

نیکۆلای پترۆڤیچ منداڵەکەی لە دایکی وەرگرت و هەڵیداویشت.منداڵەشادو خۆشحاڵبوو.لە کاتێکدا دایکە زۆر نیگەرانبوو لەگەڵ هەر هەلاویشتنێکی لەخۆڕا دەستەکانی بەرەولای منداڵەکە درێژدەکرد کەنەکا خوای نەکردە بکەوێ.

* * *

پاڤێل پترۆڤیچ هاتەژوور.ئەوژوورەی کە بەکاغەزی شینی جوان دیوارەکەی ڕزابۆوە.بەسەر دیوارەکەوە قالیچەیەکی جوانی ئێرانی هەڵواسرابوو،چەند چەکێکیش بەوێوە هەڵواسرابوون.مۆبلێکی لەداری گوێزو مەخمەرێکی سەوزو کتێبخانەیەکی لەداربەڕووی ڕەش لە شێوەی دەورەی ڕێنسانس لەژوورەکەدا دەبینران.پەیکەرێکی بچووکی برۆنز لەسەر مێزی نووسین وسۆپایەکیشی لێبوو....پاڤێل پترۆڤیچ هەرکە هاتەژوور،خۆی هاویشتە سەرکورسییەکەو دەستەکانی وەبن سەریداو بێجوڵە لەبنمیچی ژوورەکە ڕاما.پاش کەمێك هەستاو دوای ئەوەی پەردە قورسەکانی کێشان دووبارە لەسەرکورسییەکە دانیشتەوە.دەتگوت دەیەوێ بیرکردنەوەکانی کەلە ڕووخسایدا دەردەکەوتن،هەتا لەدیوارەکانیش بشارێتەوە.

**(٩)**

بازارۆفیش هەمان ڕۆژ لەگەڵ فنیچکا یەکتریان ناسی.لەگەڵ ئارکادی لە ناوباخەکەدا، دەگەڕان بازارۆف هۆکاری بەرنەگرتنی هەندێ لەداربەڕوەکانی بۆ شیکردەوە.دەبوایە سەرەتا هەندێ کودی کیمیاییان بە زەویەکە وەر کردباو دوای ئەوە لەجیاتی داری بەڕوو،سپیدارو کاجیان چاندبا.ئەگەر دەبینی ساباتەکە باش ماوەتەوە بەو هۆیەوەیە کە ئەقاقیاو یاسی وەنەوش منداڵی باشن و هێندەیان پێویستی بەئاگا لێبوون نییە،بڕوانە،دەڵێی کەسێك لەساباتەکە دانیشتووە.

فنیچکا لەگەڵ دوونیاو میتیا لەوێ دانیشتبوون.بازارۆف ڕاوەستاو ئارکادی وەك هاوڕێیەکی کۆن سەرێکی بۆ فنیچکا ڕاوەشاند.کاتێك لەساباتەکە دوور کەوتنەوە،بازارۆف پرسی:

- ئەوژنە کێیە؟چەندەش جوانە.

- کامەیان دەڵێی.

- دیارە کامەیان دەڵێم.ئەوەیان کە زۆرجوانبوو.

ئارکادی بەکەمێك شەرمەوە چیرۆکی فنیچکای بۆ باسکرد.

- بەو پێودانگە دەردەکەوێ کە بابێکی سەلیقەخراپت نییە.بێ هۆنییە کە خۆشمدەوێ.

بازارۆف لە کاتێکدا بەرەوساباتەکە دەگەڕایەوە گوتی:

- دەمەوێ بیناسم.

ئارکادی بەسەرسووڕمانەوە پاڕایەوە:

- توخوا ئاگاداربە.

- مەترسێ.من مرۆڤێکی دنیادیدەم ولەشار گەورەبووم.

کاتێك گەیشتەلای فنیچکا کلاوەکەی داگرت،کەمێك داهاتەوەو بەڕێزەوە گوتی:

- ئیزن بفەرموون خۆمتان پێبناسێنم.من بازارۆفم هاوڕێی ئارکادیم کە هیچ کەسێك ئازارنادەم.

فنیچکا لەجێی خۆی هەستاو بێئەوەی قسەیەك بكا تەماشایكرد.بازارۆف درێژەیدایە:
- چ منداڵێکی جوانە!نیگەران مەبە چاوپیس نیم...بۆ هێندە ڕوومەتەکانی سوورن؟ ددانی دێن؟
- بەڵێ قوربان،تا ئێستا چواردادنی هاتوون و ئێستاش پووکی ئاوساوە.
- باسەیری بکەم.مەترسێ من دکتۆرم.
بازارۆف منداڵەکەی لە باوەشکرد،فنیچکاو دوونیا بەسەرسوورِمانەوە سەیریان دەکرد.منداڵە هیچ هەستی بە نیگەرانی نەدەکرد.
- بەڵێ...بەڵێ...هیچ شتێکی وای نییە.ددانەکانی باشن.ئەگەر هەستی بەنارەحەتیکرد ئاگادارم بکەوە.بۆخۆتان باشن؟
- بەڵێ،وایە.هەرلەبەرئەوەیە میتیا ناچێتە باوەشی هەمووکەسێك.
- سوپاس بۆخوا.خراپنیم.
بازارۆف بەرەولای دوونیا وەرسووڕاو لە هەواڵی ئەویشی پرسی.دوونیا هەمیشە لەماڵێ ڕەفتاری سەنگین بوو تەنیا لەچۆڵیدا قاقای دەکێشا.لەجێگای وەلاّم تەنیا بزەیەکی هاتێ.بازارۆف گەڕایەوەلای فنیچکاو گوتی:
- باشە،ئەوەش پاڵەوانەکەی تۆ.
فنیچکا منداڵەکەی وەرگرت و لەسەرخۆگوتی:
- لەباوەشی تۆدا چەندەئارام بوو.
- هەموومنداڵەکان لەباوەشی مندا هێمنن.ئاخرمن شتێك لەو بارەیەوە دەزانم.
دوونیا گوتی:
- منداڵەکان زۆرباش دەزانن کێ خۆشیدەوێن.
فنیچکاش قسەکەی بۆسەلماند.
- بەڵێ،وایە.هەربۆیە میتیا ناچێتە باوەشی هەمووکەسێك.
ئارکادی تا ئێستا تەنیا لەدوورەوە سەیریدەکرد،نزیکبۆوەو گوتی:
- ئەدی باوەشی من؟
باوەشی بۆ میتیا کردەوە.بەلاّم میتیا خۆی کێشایەوەو زریکاندی.ئارکادی بە ساردییەوە گوتی:

- جارێکی دیکە کە باشتر لەگەڵ یەك ڕاهاتین،بۆخۆی دێت.

پاشان هەردووك هاوڕێ دوور کەوتنەوە.بازارۆف گوتی:

- ناوی چیبوو؟

- فدۆسیا نیکلاێۆنا.

- لەبەرئەوەی زۆرشەرمێون نەبوو خۆشمویست.ڕەنگە کەسێکیدیکە ئەوە بەعەیب بزانێ بەلاّم هەڵەیە.بۆدەبێ شەرمێ بکا.ئەودایکەو هەقیەتی.

- بێگومان ئەوهەقیەتی...ئەدی باوکم...

بازارۆف قسەکەی پێبڕی وگوتی:

- ئەویش هەقیەتی.

- نا،من وابیرناکەمەوە.

- بەوپێیە شەریکی لەمیراتدا شتێکی باش نییە.

ئارکادی تووڕەبوو.

- دەبێ شەرم لەخۆت بکەی کەبەوشێوەیە دەربارەی من دەدوێی.من لەبەرئەوەنییە کەدەڵێم باوکم هەقی نییە،بەڵکو هەق وابوو لەگەڵ کەسێکی دیکەدا هاوسەرگیری کردبا.

- ڕاستە،دەردەکەوێ زۆرلێبووردەی.تۆ ئێستاش بۆ هاوسەرگیری ڕێزی تایبەتت هەیە،لە کاتێکدا من چاوەڕوانی زیاترم لەتۆهەیە.

دووهاوڕێ بەبێدەنگی چەند هەنگاوێك چوونەپێش.

بازارۆف گوتی:

- تەواوی مولّکی باوکتم پێوا.مالاّت و ئەسپەکانی بەکەڵك نایەن.خانووەکانی ڕووبەوێرانین.جوتیارەکانی خۆیان لەکار دەدزنەوە.سەرکارەکەشی یان زۆرگێلە یان زۆر زیرەکە،ئەوەیان باش تێنەگەیشتووم.

- ئەمڕۆ زۆر بەجدی قسەدەکەی،ئاغای بازارۆف.

- دێهاتییە بێنەواکانیش کلاّو لەسەری باوکت دەنێن.ئەوە تەقریبەن پەندێکیشە کەدەڵێ دێهاتی ڕووس هەتاخوداش هەڵدەخەڵەتێنن.

- منیش بەرەبەرە لەگەڵ مامم هاوڕادەبم.دەڵێی تۆش لەگەڵ هەموو ڕووسەکان بەرقداچووی.

- ئەوەندەگرنگ نییە،چوونکە تایبەتمەندی کەسێکی ڕووسی ئەوەیە کەبڕوای بەخۆیشی نییە.تەنیا شتێك گرنگە،کە دوو دوو دەکاتەچوار ئەوەیدیکە قسەی هیچە.

ئارکادی چاوی لە ئاسۆ و ئەوچیمەنە پڕو سەرسەوزە بڕیبوو کە تیشکی خۆر بەسەریدا دەڕژا دوای کەمێك ڕاوەستاو گوتی:

- ئایا سرووستیش قسەی هیچە.

- سرووشتیش بەو مانایەی کەتۆ بیری لێدەکەیەوە لەشتێکی گاڵتەجاڕ زیاترنییە.سرووشت جێگەی پەرستن وپەرستگا نییە.سروشت کارگەیەکە مرۆڤ کاری تێدادەکات.

لەوکاتە ئارامەدا دەنگی وێلۆنێك هاتەبەرگوێ.کەسێك بەهەستەوە بەلاّم ناشیانە پارچەی(چاوەڕوانی) بەرهەمی شۆبەرتی دەژەنی.ئاوازی دڵگیری مۆسیقا بەهەوادا بلاّو ببوەوە.بازارۆف بەسەرسووڕمانەوە پرسی:

- چ کەسێکەدەیژەنێ؟

- باوکم.

- باوکت وێلۆن لێدەدا.

- بەڵێ.

- بۆباوکت تەمەنی چەندە؟

- چل وچوارساڵ.

بازارۆف پێکەنی.

- بۆ پێدەکەنی.

- بۆ پێنەکەنم؟ ئایا ئەوە بەڕای تۆ سەیرنییە پیاوێکی چل وچوارساڵەی کە سەرۆکی خێزانێکیشە،لە گوندێکدا وێلۆن لێبدا؟

بازارۆف هەروا پێدەکەنی و قاقای دەکێشا.بەلاّم ئارکادی کە هەمیشە وەك مامۆستایەك سەیریدەکرد،ئەوجارە تەنانەت بزەیەکیشی نەهاتێ.

## (١٠)

دووهەفتە تێپەڕی.لەوماوەیەدا لە مارینۆ ژیانی ئاسایی تێدەپەڕی.بازارۆف کاری دەکردو ئارکادیش دەسووڕایەوە.تەواوی خەڵکانی ماڵێ بە هەڵسووکەوت و قسەکورت و ئاڵۆزەکانی بازارۆف ڕاهاتبوون.فنیچکا بە ڕادەیەك لەگەڵیدا هەستی بەدۆستایەتیدەکرد کەشەوێك بەخاتری میتیا کە قوڵنجی هاتبوو، دەستووریدا وەخەبەری بێنن.بازارۆف بە باوێشکدانەوە بەڵام هەروا دەم بەبزەوە دووسێ کاتژمێر لەلای فنیچکا دانیشت و هەوڵیدا یارمەتی منداڵەکەی بدات.بەڵام پاڤێل پترۆڤیچ چارەی نەدەویست.چوونکە ئەوی بەئازاو،بەهانەگیرو لەچینی خوارەوەی کۆمەڵگای دەزانی.گومانی نەبوو کە بازارۆف لە هەڵسووکەوتکردن لەگەڵیدا ڕێزی بۆ دانانێ.بۆئەو.یانی بۆ پاڤێل پترۆڤیچ کیرسانۆف.نیکۆلای پترۆڤیچ لەوگەنجە نهلیستە کەمێك دوودڵبوو دەترسا کاریگەری خراپ لەسەر ئارکادی دابنێ.بەحەزەوە گوێی لەقسەکانی ڕادەگرت وهەندێجاریش لە تاقیگەی کیمیایی یان فیزیاییەکەی ئامادە دەبوو.بازارۆف میکرۆسکۆپێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو کەچەندان کاتژمێر کاری پێدەکرد.لەگەڵ ئەوەی بازارۆف گاڵتەی بەخزمەتکارەکان دەکرد،واش خۆشیان دەویست.ئەویان وەکو ئاغای خۆیان سەیردەکرد.دوونیا کە قسەی لەگەڵ دەکرد لەناخی دڵەوە پێدەکەنی و دەتدیت وەك پشیلەیەك بەتەنیشتیدا تێدەپەڕی و تیلەنیگایەکی تێدەگرت.پیووتەری لەخۆڕازی و گێلیش کە بەردەوام ناوچەوان گرژبوو جیالە نیگایەکی ڕێزدارانە هیچ هوونەرێکی دیکەی نەدەزانی و لەکاتی خوێندنەوەدا بەزەحمەت و بەحینجە دەیتوانی شت بخوێنێەوەو بەردەوام جلوبەرگی بەپەڕەمووچ پاکدەکردەوە،هەرکە تەماشای بازارۆفی دەکرد بزەیەك دەکەوتە سەرلێوانی.کوڕوکاڵەکە هەمیشە لە دەورەیبوون.تەنیا پراکفیچی پیربوو کە وێڕای پاڤێل پترۆڤیچ خۆشی نەدەویست و لەسەرسفرە بەمۆنییەوە فەرمووی دەکرد.ئەو بازارۆفی بەسووك وچرووك و زیانبەخش دەزانی و بەو ڕیشەیەوە پێیوابوو ئەو بەرازەیە کەلەبن دەوەنەکاندا خۆی پەناداوە.پراکفیچیش لەڕووی خانەدانییەوە خۆی لەڕیزی پاڤێل پترۆڤیچ دادەنا.

لەخۆشترین ڕۆژەکانی ساڵدا،یانی ڕۆژەکانی سەرەتای تەمووز هەوا زۆر خۆشبوو،ئەگەرچی خەتەری نەخۆشی کۆلێرا لە دوورەوە خەڵکی هەراساندەکرد لەگەڵ ئەوەشدا،خەڵکی ئەوپارێزگایە لەگەڵی ڕاهاتبوون.بازارۆف بەیانیان زۆرزوو لەخەو هەڵدەستاو دووسێ کیلۆمەتر بە پێیان دەڕۆیشت.بۆهەڵمژینی هەوای پاك ئەوەی نەدەکرد چوونکە مەبەستی لەو سەفەرەدا،پەیداکردن و کۆکردنەوەی ڕووەك و جڕووجانەوەربوو.هەندێجاریش ئارکادی لەگەڵ خۆی دەبرد.لەکاتی گەڕانەوەشدا وەك هەمیشە لەنێوانیاندا گفتوگۆ دەستیپێدەکرد ئەگەرچی ئارکادی زیاتر لە بازارۆف قسەی دەکرد سەرەڕای ئەوەش لە کۆتاییدا تەسلیم دەبوو.

ڕۆژێك لە ڕۆژان کەمێك دواکەوتن.نیکۆلای پترۆڤیچ بەدوایانداچوو بۆ ناوباخەکە.هەرکە گەیشتە ساباتەکە هەچەندە ئەوانی نەدەدی بەلاّم گوێی لە دەنگیانبوو.ئارکادی گوتی:

- تۆ،باوکم وەکوخۆی ناناسی.

نیکۆلای پترۆڤیچ خۆی لەپشت دەوەنێکدا شاردەوە.

بازارۆف گوتی:

- باوکت پیاوێکی زۆرباشە بەلاّم ئیدی پیروخانەنشین بووە.

نیکۆلای پترۆڤیچ بەسەرنجەوە گوێی ڕاگرت...ئارکادی وەلاّمێکی نەدایەوە.

پیاوە پیروخانەنشینەکە ماوەیەك بێجوولە لەشوێنی خۆی وەستاو پاشان ڕێگای ماڵەوەی گرتەبەر.

بازارۆف گوتی:

- دووسێ ڕۆژپێشتر دیتم بەرهەمێکی پۆشکینی دەخوێندەوە.تکات لێدەکەم پێیبڵێ ئیتر ئەوجۆرە شتانە بەکەڵك نایەن.پێویستە هەموو ئەوشتە پڕووپووچانە وەلابنێ.ئاخربۆچی تا ئەوڕادەیە ئەو بەرهەمە هەستیارانەی پێخۆشن؟ شتێکی وای بدەیە بەکەڵکی بێت تا بیخوێنێتەوە.

ئارکادی پرسی:

- بۆنموونە چ کتێبێك؟

- پێموایە بۆسەرەتای دەستپێکردنی کتێبی(ماددەو وزە)ی نووسینی (بووخنەر)[1] کتێبێکی باشبێت.

---

١- بوخنەر: فەیلەسوف و پزیشکی ماتریالیستی ئەڵمانی سەدەی نۆزدە.

ئارکادی ئەوبیرۆکەیەی پەسەندکرد:

- منیش پێموایە ماددەو وزە لە بەرئەوەی بەزمانێکی سادە نووسراوە کتێبێکی باشـبێت بۆدەستپێکردن.

*　*　*

هەمان ڕۆژ دوانیوەڕۆیە،نیکۆلای پترۆڤیچ لە ژوورەکەی پاڤێل پترۆڤیچ دانیشـتبوو قسـەی لەگەڵ دەکرد:

- ئیدی زەمانی من و تۆ تێپەڕیوە.هیچیش ناکرێ.ڕەنگە بـازارۆف لـەو بارەیـەوە هـەقی بێت،بەلاّم شتێك کە نیگەرانم دەکات ئەوەیە دەمـەوێ پەیوەنـدی نێـوان مـن و ئارکـادی لـە ئایندەشدا هەروا باشبێت.بەلاّم تازەتێگەیشتووم کە لە کـاروانی پێشـکەوتندا دواکەوتووم،لـە کاتێکدا ئەو زۆر لەمن لەپێشترەو بۆمن زۆردژوارە بیگەمێ.

پاڤێل پترۆڤیچ هاواریکرد:

- کێ ئەوقسەیەی کردووە؟ بەچی ڕادیارە کە لەئێمە لە پێشترە؟ هەموو ئەوقسانە کـابرای نیهلیست لە مێشکی ئەوی هاویشتوون.من لەوکوڕە (بەچکەپزیشکە) بێـزارم.من دەڵـێم ئـەو کابرایەکی فێڵبازە.من دڵنیام ئەو بەوهەموو بۆقانەوە هەتا ئەندازەی سـەرە دەرزییـەکیش لـە زانستی فیزیا سەرکەوتوو نەبووە.

- نا،برای خۆشەویست،ئەوقسانەمەکە.بازارۆف پیاوێکی ژیروئاقڵە.

- ئەو بنیادەمێکی لەخۆباییی و روح زلە.

- بەڵێ،لەوبارەیەوە هەقتە.ناتوانێ لەوەی باشـتربێ.بەلاّم شـتێك کـە نـایزانم ئەوەیـە زۆر هەوڵمداوە تالە دەورانی خۆم دوانەکەوم.بە کاروباری جوتیارەکان ڕادەگەم زەویەکم پێکـەوەناوە کە لەپارێزگای خۆماندا نازناوی سووریان داومێ،کتێب دەخوێنمەوە،بـەکورتی هەوڵـدەدەم تـا لەگەڵ خەڵکانی تربچمەپێش بەلاّم ئەوان دەڵێن من دواکـەوتووم.دەبێ چـیبکەم بـرای ئـازیز؟! بۆخۆشم کەم کەمە خەریکە باوەڕدەکەم کە لەزەمانە دابڕاوم.

- بۆچی؟

- چـــوونکە ئەمڕۆدانیشـــتبووم کتێبێکـــی پۆشـــکینم دەخوێنـــدەوە...پێموابێ (قەرەجەکان)بوو...لە ناکاو ئارکادی هاتەپێش و بزەیەکی هاتێو کتێبەکەی لەدەست دەرهێنام

و لەجیاتیان کتێبێکی ئەڵمانی دامێ..پاشانیش بەخەندەوە کتێبەکەی پۆشکینی لەگەڵ خۆی برد.

- بەڕاست،چ کتێبێکی دایەی؟

- ئەوە.

نیکـۆلای پترۆڤـیچ لـەبن هەنگڵیـدا چـاپی نوێـەمی بەشـە بەناوبانگەکـەی بووخنـەری دەرهێنا.پاڤێل پترۆڤیچ لەناو دەستانیدا هەڵگێڕو وەرگێڕیکردو گوتی:

- بەوشـێوەیە ئارکـادی دەیـەوێ تـۆ ڕێنـوێنی بکا.تۆچـیت لەکتێبەکـەکرد؟ دەسـتتکرد بەخوێندنەوەی؟

- بەڵێ.

- چۆن بوو.

- یـان ئەوەیـە مـن سـەر لەوکتێبـە دەرناکـەم یـان ئـەوەی کـە نووسـراوە بەتـەواوی پڕوپووچە.بەلام دەڵێی عەیب لەخۆمە.

- ئەڵمانیت لەبیرنەچۆتەوە؟

- نا،هێشتا ئەوەی نازانم.

نیکـۆلای پتـۆڤیچ دووبـارە کتێبەکـەی ئـەو دەسـتاو دەسـتکردو تەماشـایەکی براکـەی کرد.هەردووکیان بێدەنگ بوون.نیکۆلای پترۆڤیچ دیاربوو دەیەوێ باسەکەبگۆڕێ:

- ئەرێ لە کۆلیازینەوە نامەیەکم بۆهاتووە.

- لە ماتۆی ئیلیچ؟

- بەڵێ،هاتۆتەوە شار تا سەرلەمەڵبەندەکەی خۆیبدات،ئێستا ئەو بۆخۆی بۆتـە کەسـێکی گرنگ.نووسیویەتی حەزدەکا من و تۆو ئارکادی ببینێ.بانگهێشتی کردووین بچین بۆشار.

- ئەرێ بانگهێشتەکەی قبووڵ دەکەی؟

- نا،ئەدی تۆ؟

- منیش ناچم.دەیەوێ بەوکارەی خۆمان لێنزیك بکاتەوە.هەمان ئـەو ماستاوچـیانەی لـە دەورووبـەرنی بەسـنی،لەوەزیاتر پێویسـت ناکا.ڕاوێـژکاری نهێـی هێندەشـتێکی گـرنگ نییە.ئەگەرمنیش لەوکاتەی کە لە سووپابووم ویستبام ببمەشتێك تا ئێستا لانیکـەم سـەرتیپ دەبووم.لەوەبەدواش،من وتۆ ئیدی لەکار کەوتووین وخانەنشین بووین.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

- وەك ئەوەی کاتی هاتووە ڕاسپێرین تابووتمان بۆبکەن وخۆشمان دەستەونەزەر چـاوەڕوانبین تابمانخەنە ناوتابووتەوە.

- من یەکێکم لەوانەی کە بەو زوانە مەیـدان چـۆڵناکەم.بڕیامداوە کەلەگـەڵ ئەوپزیشـکە منداڵە یەکلای بکەمەوە.

یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوە هەمان ڕۆژ ئێواریْ ڕوویـدا.پاڤێلْ پترۆڤـیچ بەحاڵـەتی ئامـادەو بڕیاردەرانە بۆچایخواردنەوە چووە ژووری پێشوازی.تەنیا لـە بیانوویـەك دەگـەڕا تـا هەرایەکـە دەستپێبکا بەلاّم ئەو بەهانەیە زۆردرەنگ وەدەستیکەوت چونکە بـازارۆف وەك هەمیشـە لـە بەرامبەر کیرسانۆفەپیرەکاندا هێندەی قسەنەدەکرد.ئەوڕۆژە هەندیْ هەستی بە نەخۆشـیدەکردو لێکدا لێکداش چایدەخواردەوە.پاڤێلْ پترۆڤیچ زۆر بەبیْ سەبری چاوەڕێما تا سەرەنجام بەئاواتی گەیشت.کاتێك باسی یەکێك لەزەوی دارەکانی دراوسیْ هاتەگۆڕیْ،بازارۆف ئەوی لەپترۆسبۆرگ دیتبوو بەبیْ گرنگی پێدانەوە گوتی:

- پیاوێکی هیچ وپووچە...خانەدانانە خۆیدەنوێنیْ...

پاڤێلْ پترۆڤیچ کە لەتووڕەییان لێوی خۆیدەکرۆشت گوتی:

- ئیزن دەفەرموون لێتان بپرسم کە ئایا بەڕای ئێوە وشەی هیچ وپووچ وخانەدان مانایەکی یەکسانیان هەیە؟

بازارۆف بەهێمنی قوومێکی لەچایەکەداو وەلاّمی دایەوە:

- من گوتم ئەوانەی واخۆیان دەنوێنن کەخانەدانن.

- بەڵیْ،فەرمووت ئەوانەی خۆیان وەك خانەدان دەنوێنن.بەلاّم من پێموایە تـۆ خانـەدان و ئەوانەی خۆیان پێخانەدانە وەکویەك سەیردەکەی.بەئەرکی خۆمی دەزانم بـیروڕای ئێوەپەسـەند نەکەم.دەبیْ بزانی کەهەموان من بەپێشکەوتووخوازو لایەنگری پێشکەوتن دەزانن و هەرلەبـەر ئەوەشە،من ڕێزی تایبەت بۆخانەدانەکان دادەنێم.کاکی بەڕێز...

بـازارۆف سـەری بـەرزکردەوەو چـاوی لەچـاوی پاڤێـلْ پترۆڤیچـەوە بڕی.پاڤێـلْ پترۆڤـیچ بەڕاوێژێکی زبرترەوە درێژەیدایە:

- کاکی بەڕێز،خانەدانەکانی ئینگلسـتان لەبەرچـاوبگرە کـە تۆزقاڵێـك لەهـەقی خۆیـان خۆشنابن و هەروەها ڕێز لەهەقی خەڵکانی دیکەش دەگرن.ئەوان بەهەمانشێوە کە چاوەڕوانیان

لەخەڵك هەیە تا كارێكیان بۆبكا،ئەركی خۆشیان بەتەواوی ئـەنجام دەدەن.ئـازادی ئینگلسـتان خانەدانەكان پەست دەكا كەچی پشتیوانیشی لێدەكەن.

بازارۆف گوتی:

- ئێمە زۆرمان لەوبارەیەوە بیستووە...ئێستا مەبەستی تۆ لەوقسانە چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە كەبەبێ ڕێزگرتن لەخۆت و لەنەفسی خـۆت هـیچ پایەیـەكی پتـەو بـۆ كۆمـەڵگاو ئاسایشـی وڵات دانانرێ...كـاكی پایەبـەرز تێبگـە كەسـایەتی لـە هەمووشـێك گرنگترە.كەسایەتی هەركەسێك دەبێ وەك بەردی نەقارِ قایمبێ چوونكە هەمووشتێك لەسەرئەو پایە بنیات دەنرێ.من زۆرباشدەزانم هەمووشتێكی من لـەپاكوخاوێنی ڕابگـرە تـا چـۆنییەتی پۆشینی جلوبەرگیش بەگاڵتە وەردەگری، بەڵام من ئەوكارانەدەكـەم چـوونكە ڕێزلەكەسـایەتی خۆمدەگرم...بەڵێ،كاكی بەڕێز،ئەگەرچی لە گوندێكی دوورە دەستیش دەژیم لەگـەڵ ئەوەشـدا لەبیری ناكەم كە دەبێ ڕێز لەكەسایەتی خۆت بگری.

بازارۆف گوتی:

- ئیجازە بفەرموون پاڤێل پترۆڤیچ.تۆ ڕێز بۆخۆتان دادەنێیـو كارێـك ناكەی.ئاخرئـەوە چ كەڵكێكی دەتوانێ بۆخەڵكی هەبێ.تۆ دەتـوانی ڕێـز لـەخۆتان بگـرن و بـۆ دەوروو بەریشـتان سوودمەندبن.

پاڤێل پترۆڤیچ ڕەنگی بزركاو گوتی:

- ئەوەشتێكی دیكەیە.ئەوە ئەركی مـن نییـە بەجـەنابتان بڵـێم خۆتـان گوتـەنی دەسـتم لەسەردەست داناوە.تەنیا ئـەوە دەڵـێم كـە لـەزەمانی ئێمـەدا خانەدانـەكان هێشـتاش وەكـو ڕەچەڵەكێكی گرنگ سەیردەكرێن و تەنیا كەسانێك كە ژیانێكی باشیان نییە ڕەچەڵەك دەخەنـە ژێرپێیان.هەرئەو ڕۆژەی كەهاتن ئەوەم پێگوت.وانییە نیكۆلای؟

نیكۆلای پترۆڤیچ بەنیشانەی سەلماندن،سەری ڕاوەشاند.بازارۆفیش درێژەی بەقسەكانیدا:

- من تێناگەم ریزكردنـی وشـەگەلی خانەدان،ئازادیخوازی،پێشـكەوتن و... چ فایدەیـەكی هەیە.بۆ تاكە كەسێكی رووسی ئەوانە هیچ بەهایەكیان نییە.

- كەوایە بەڕای تۆ كەسێكی ڕووسی پێویستی بەچی هەیـە؟ تۆپێتوایـە رووسـەكان دوورن لەیاساكانی پێشكەوتن،ئەو یاسایانە ئەوان ناگرێتەوە.ئەگەر بەراوردی مەنتیقی مێژووش...

- ئێمە هیچ پێویستیمان بەمەنتیقی مێژوویی نییەو بەبێ ئەویش دەتوانین کارەکانمان ئەنجام بدەین.

- چۆن شتێکی وادەکرێ.؟

- بابەتەکە زۆر ئاشکراو ڕوونە.ئایا بووە تا ئێستا لەحاڵەتی برسێتیدا بۆ قووتدانی پارووە نانێك پێویستیت بەو مەنتیقە هەبێ؟ ئێمە پێویستیمان بەو فەلسەفە بازیەنییە.

پاڤێلێ پترۆڤیچ لە تووڕەییان دەستەکانی ڕاوەشاندو گوتی:

- من لەقسەکانی تۆ تێناگەم.تۆ ئیهانە بەڕووسەکان دەکەی. تێناگەم چۆن کەسێك ناتوانێ یاساوڕێساکانی قبوڵنەبێ.کەوایە چ شتێك وات لێدەکا خەبات بکەی؟

ئارکادیش هاتە ناو باسەکەوە:

- مامە گیان پێشترگوتبووم کە ئێمە باوەڕمان بە بنەماکان نییە.

بازارۆف لێی زیادکرد:

- ئێمە بە پێی پێویستی و ئەوەی کەچ شتێك بەسوودە کارەکانمان ئەنجام دەدەین.پابەندبوونتر لە هەرشتێك لەحاڵی حازردا ئەوەیە کە تێکڕای بنەما بێ کەڵکەکان ڕەتبکەینەوە.ئێمەڕەتی دەگەینەوە.

- هەمووشتێك؟

- بەڵێ،هەمووشتێك.

- چۆن؟ نەتەنیا شیعرو هونەر تەنانەت....گوتنی سەختە...

بازارۆف بەخوێنساردییەوە دووبارەی کردەوە:

- هەمووشتێك.

پاڤێلێ پترۆڤیچ زەق تێیەوەڕاما.چاوەڕوانی قسەیەکی دیکەی نەدەکرد.ئارکادی ڕەنگی ڕووخساری لەخۆشیان کرابۆوە.

نیکۆلای پترۆڤیچیش هاتە ناوباسەکەیانەوەو گوتی:

- ئێوە هەمووشتێك ڕەتدەکەنەوە یان بەگوتەیەکی تر هەموو شتێك خراپدەکەن...بەلاّم تەنیا خراپکردن نابێتەکار.دەبێ شتێکیش درووستبکەی.

- ئەوەیان ئیدی ئەرکی ئێمەنییە.ئێمە تەنیا ڕێگا هەمواردەکەین.

ئارکادی کەپێیوابوو قسەیەکی گرنگ دەکات گوتی:

- ئێمە کارەکانمان لەسەر بنەمای نیازێك کە گەلی رووس هەیەتی ئەنجامدەدەین.ئێمە هەقمان نییە وەدوای ئارەزووی تایبەتی خۆمان کەوین.

بازارۆف دەربڕینی ڕستەی ئاخری پێخۆش نەبوو چونکە بۆنی ئیحساساتی لێدەهات.بەلاّم بە پێویستی نەزانی وتەی مریدە گەنجەکەی ڕەتبکاتەوە.

پاڤێڵ پترۆڤیچ بە تووڕەییەوە هاواریکرد:

- نا،نا،من باوەڕناکەم ئێوە گەلی رووسیتان ناسیبێ...ئێوە ناتوانن نوێنەری خواستەکانیان بن...نا،گەلی رووسیا بەوجۆرەنییە کەئێوە ناسیوتانە.رووسەکان ڕێز لەدابونەریتی باوکانی خۆیان دەگرن و ئەوانە بەپیرۆز دەناسن.رووسیا ناتوانێ بەبێ پابەندبوون بە بنەماکان بژیت....

بازارۆف هاتە ناو قسەکانییەوەو گوتی:

- من نامەوێ لەو بارەیەوە دم بەدمەت لەگەڵ بکەم ئەگەر ڕای منت دەوێ لەو بارەیەوە دەڵێم هەقی تۆیە.

- ئەگەروایە من هەقم هەیە...

- لەگەڵ ئەوەشدا شتێك جێگیرنابێ....

ئارکادی وەك شەترەنج زانێکی ماهیر کە دەستی بەرامبەرەکەی خوێندبێتەوەو لەجووڵەی مۆرەکانی سەری سووڕنامێنێ بەڕاوێژێکی دڵنیاییەوە قسەی هاوڕێکەی دووبارەکردەوە:

- بەڵێ،جێگیرنابێ.

پاڤێڵ پترۆڤیچ بە سەرسووڕمانەوە پرسی:

- چۆن هیچ شتێك جێگیرنابێ؟ لە قسەکانی ئێوەدا دەکرێ بەوئەنجامە بگەین،کەئێوە بەدژی داواکانی گەلی رووسیا هەنگاو هەڵدێننەوە.

بازارۆف هاوایکرد:

- گریمان وابێ.بۆچما چ گرفتێکی تێدایە؟ ئەوە هەمان گەلە کەزەمانێك لەگەڵ بیستنی دەنگی هەورەتریشقەدا پێیان وابوو پێغەمبەرێك بەگالیسکەکەی بەئاسماندا دەگەڕێت.تۆدەڵێی چی؟ ئایا پێتوایە دەبێ منیش ڕێز لەهەمان بیروباوەر بگرم؟ ئەگەر ئەوانەی بەوشێوەیەی بیردەکەنەوە گەلی رووسن کەواتە من چیم؟

- لە رووسی بوونی تۆ دەبێ بەگومان بین.من باوەڕناکەم تۆ رووسی بی.

بازارۆف بە ئەنقەست و ڕاوێژێکی لە خۆباییانەوە گوتی:

- باپیرانم لەسەر ئەوزەویە کاریانکردووە.لەهەر رەعیەتێکی خۆتان بپرسن کاممان لـەخۆیان بەنزیکتردەزانن.من یان ئێوە؟ تەنانەت تۆ ئامادەنی قسەشیان لەگەڵدابکەی.

- تۆش ئەگەرچی قسەیان لەگەڵ دەکەی بەلاَم بەسووك و چروکیان دەزانی.

- ئەگـەر بەراسـتی ئەوانـە سـووك وچروکن،چـیدەکریَ؟ تـۆرای مـن ڕەتدەکەیـەوە بـەلاَم چۆندەتوانی لافی ئەوەلێبدەی کـە ئەورایـە خـۆی لەخۆیـدا وەك کـارگ هـەڵتۆقیوەو دەربـڕی خواستەکانی گەلی رووسی نییە.

- بەوپێیە ئێوە نیهلیستەکان زۆرلەخۆتان ڕادەبینن.

- ئەوباسـە کەڕووسـیا پێویسـتی بەئێمـە هەیـە یـان نا،داوەریەکـەی لـە دەسـتەلاَتی ئێمەدانییە،بەلاَم بۆچی ئێوەی خانەدانیش بوونی خۆتان بۆ کۆمەڵگا زۆربە پێویست دەزانن.؟

نیکۆلاَی پترۆڤیچ لەشوێنی خۆی هەستاو هاواریکرد:

- برایان،تکاتان لێدەکەم هێرش مەکەنەسەر تایبەتمەندیەکانی خۆتان.

پاڤێل پترۆڤیچ بزەیەکی هـاتیَ و دەسـتی لەسەرشـانی براکـەی دانـاو داوایلێکـرد لەسـەر جێگاکەی دابنیشێتەوەو گوتی:

- نیگەران مەبە براکەم من بەهای خـۆم دەزانم.بەتایبـەت هـەمان هەسـتی لێوەشـاوەیی کەکاکی دکتۆر هەیەتی منیش لەخۆمدا هەستی پێدەکەم.

پاشان بەرەولای بازارۆف گەڕایەوەو گوتی:

- ڕەنگە تۆپێتوابیَ کە بیرو باوەڕی تۆ ئایدۆلۆژیایەکی تازەیە.ئەوماتریالیزمەی کەجەنابت بانگەشەی بۆدەکەی زۆرلەوەی پێش باسکراوەو ڕەتکراوەتەوە.

- دووبارە قسەی حەللەق مەللەق...

بازارۆف کە بەتووڕەیی قسەکانی بەرامبەرەکەی خۆی بڕیبوو درێژەیدایە:

- سەرەتا ئێمە بانگەواز بۆهیچ شتێك ناکەین چوونکە خوومان پێوەنەکرتووە.

- کەوایە چیدەکەن؟

- چیدەکەین؟ ئەگـەر لـەبیرتان بێـت ماوەیـەك لەمەوبـەر دەربـارەی بـەرتیل وەرگرتنـی کارمەندانی دەوڵەتی و نەبوونی جادەی باش و،کەموکوڕی لەکەلو پەلی بازرگانی و باروودۆخی خەفەتباری دادوەری و....قسەمانکرد.

- بەڵێ،لەبیرمە.کاری ئێوە تەنیا بڵاوکردنەوەیە.منیش لەگەڵ زۆرلەو تانانەی دەیانڵێی هاوڕام.بەڵام...

- دوایی تێگەیشتین کەتەنیا بەگوتە هیچ دەردێك دەرمان ناکرێ.دەرخستن تەنیا کارێکە لەرادەی خۆنواندن و هیچی تر.ئێمە تێگەیشتین کە گەورەکانمان،هەمان ئەوانەی کە زۆرهۆشمەندن هیچ کارێکی باشیان لەدەست نایەو تەنیا خۆیان لەگەڵ کۆمەڵێك هەڵێتوپەڵێت سەرگەرم کردووە.هەمووشی لەهوونەر،لە پارلەمانتاریزم ولەشت گەلێکی واکە سەری لێدەرناکەن وخوادەزانێ لەچیتریش قسەدەکەن.لەکاتێکدا کەباسوخواسی دەردە ئەساسەکانی خەڵك لەئارادایە.قسەلەسەر نانی شەوی خەڵکەو ئەوەش کە ئێمە تابینە قاقا لەگێژاوی خورافات ڕۆچووین.داموودەزگا هاوبەشەکانی بازرگانیمان بەهۆی نەبوونی کەسی شیاو لەحاڵی دارِماندان.ئێمەش لەوئازادیەی کەحکومەت دەهۆڵی بۆدەکوتێ هیچ لێی سوودمەندنین.هۆکارەکەی دەزانی؟چوونکە جووتیاری رووسی بۆسەر بەمەیخانەداکردن و هەڵدانی یەك پەرداخ عەرەق حازرە لەماڵی خۆشی بدزێ...

پاڤێڵ پترۆڤیچ قسەکەی بازارۆفی بڕی وگوتی:

- ئاوا...تۆ لەتێڕوانینی ئەو باروودۆخە بەوئەنجامە گەیشتووی کەنابێ دەست لەهیچ کارێك بدەی.

بازرۆف بە ناوچەوان گرژییەوە دووبارەیکردەوە:

- بەڵێ،بڕیارمانداوە دەست لەهیچ کارێك نەدەین.

پاشان ڕقی لەخۆی هەستا کە تا ئەورادەیە هەوڵدەدا بیروباوەڕی خۆی بۆئەو خانەدانزادەیە شیبکاتەوە.پاڤێڵ پترۆڤیچ قسەکانی بازارۆفی تەواوکردو گوتی:

- بەردەوامیش قسەی ناشایستە بلێن.

- بەڵێ،قسەی ناشایستە بڵێین.

- ئەوکاتیش ناوی ئەوکارە دەنێن نیهلیسم؟

بازارۆف دووبارە بەڕووقایمیەوە گوتی:

- بەڵێ،ناوی ئەوکارەش دەنێین نیهلیسم.

پاڤێڵ پترۆڤیچ چاوی لەسەریەکداناو بەدەنگێکی ئارامەوە گوتی:

- ڕاستە،نیهلیسم دەرمانی هەموودەردێکی بێدەرمانـەو ئێـوەش پاڵـەوانانی ڕزگارکـەری ئێمەن.بەلاّم بۆچی ئێوەش وەك ئەوانیدیکە تەنیا قسەدەکەن؟

بازارۆف بەهێمنییەوە گوتی:

- هەمووشتێکمان پێوەدەلکێ تەنیا ئەوەنەبێ.

- یانی دەتەوێ بڵێی دەست بەکاریش دەبن؟

بـازارۆف بێـدەنگ بوو،پاڤێـلّ پترۆڤـیچ لـە تووڕەییـان خـەریکبوو بتـەقێ بـەلاّم دانـی بەخۆیداگرت و گوتی:

- بەڵێ،...کاری ئێوە تەنیا تێکدانە...بەلاّم موۆڤ دەیەوێ بزانێ کە چ شتێك تێکدەدەن و لەناوی دەبەن و بۆ وادەکەن...

ئاکادی گوتی:

- ئێمە تێکدەشکێنین،چوونکە بەهێزین.

پاڤێلّ پترۆڤیچ سەیرێکی برازاکەی کردوو بزەیەکی هاتێ.ئارکادی ڕێك ڕاوەستاو گوتی:

- بەڵێ،ئێمەبەهێزین.هەرکارێك پێمـان خۆشـبێ دەیکـەین و هـیچ کەسـێکیش نـاتوانێ پێشمان پێبگرێ.

پاڤێلّ پترۆڤیچ نەیتوانی دان بەخۆیدابگرێ وهاواریکرد:

- بێچارە!خۆزیا بیرت دەکردەوە کە کوێی ئەوبیرە چەپەڵەت بەکەڵکی ئەو سەرزەمینە دێ؟ هەرکەسێك لەجێی من با بەبیستنی ئەوقسانە دەرهەڵدەبوو.نەتـەوە دڕەنـدەو مەغۆڵـەکانیش زەبروو زەنگو هێزیان هەیە،بەلاّم ئەو زەبروو زەنگوهێزە بەچ کەڵکی مرۆڤایـەتی دێـت؟ ئێمـە تەنیا پێویستیمان بە دەرەنجامەکانی شارستتانیەت هەیە. بەڵێ، بەڕێزەکان.شارسـتانییەت بـۆ ئێمە بەنرخترین شتە.بەمن مەڵێن ئەوانە بێ بەهان. دەستکورترین کەس،تەنانەت ئەو گـۆرانی بێـژە گەڕۆکـەی لەبـەرخاتری چـەند دراوێـك گـۆرانی دەڵێـت بـەبڕوای مـن زۆرلـەئێوە بەنرخترە.ئەولانیکەم نوێنەری شارستانیەتە ئێـوەش نوێنـەری تـۆقین و بەربەریـەتن.ئێوەخۆتان بــەمرۆڤی پێشــکەوتوو دەزانــن لەکاتێکــدا شــوێنی ڕاســتەقینەی ئێــوە کــۆڵێتی وەحشییەکانە.هێز!کەوایە باش گوێبگرن ئەفەندییە ملـهووڕەکان! ئێـوە چـوار پیتـوو لـەتێك زیاترنین بەلاّم لەبەرامبەرتان ملیۆنـان کـەس بـەڕیز ڕاوەسـتاون،ئێوە لـەژێرپێی ئەوانـدا پـان دەبنەوە.

بازارۆف گوتی:

- ئەوەگرنگ نییە.هەرچەندە ئەوکارەش هێندە ئاسان نییەو ژمارەی ئێمەش ئەوەندەنییە کە تۆ پێتوایە.

- بەڕاستی ئێوەپێتان وایە دەتوانن لەبەرامبەر تەواوی خەڵکی رووسیەدا بووەستنەوە؟

- دەزانی مۆسکۆیان بەیەك مۆم گڕتێبەردا؟

- بەڵێ،بەڵێ،سەرەتا لەخۆبایی بوون و شەیتانی وپاشانیش دەستتێوەردان و گاڵتەپێکردن.کاری ئێوە تەنیا ئەوەیەوبەس.ئەوە تاکە شتێکە کە ئێوە گەنجەکان دڵتان پێی خۆشەو هەربەو ڕیگایەشەوەیە کە گەنجەکان بەلاڕێدا،یانی بەڕێگای خۆتاندا پەلکێش دەکەن،یەکێکیش لەوانە هەرئێستا لەپەنای تۆ دانیشتووە.تۆ پەرستتوی ئەوی و ئەویش ئامادەیە لەبەرامبەرتۆدا کڕنۆش بەرێ ولاقت ماچ بکا.(ئارکادی ڕووی وەرگێڕاو ناوچەوانی تێکنا). بۆگەنیوی قسەکانتان لەزۆر شوێنان هەستپێدەکرێ.دەنگۆیە کە نیگارکێشانی رووسی لە ڕۆما ئامادەنین بچنە ڤاتیکان.ئەوان ڕافائیلیان پێ کەسێکی گێل و نەزانەو تەنیا لە بەرئەوەی کەسێکی هەڵکەوتوو بووە.لە کاتێکدا ئەوان بوونەوەرێکی تەمبەڵ و سستن کە هیچ جۆرە سەلیقەیەکی هونەریان نییەو هونەرەکەشیان لەسنووری (کیژان لەسەرکانی)یە یانی لەسەرەتایی ترینی تابلۆکان زیاترنین.خۆزیا ئەو کارەشیان باش ئەنجام دابا.تۆ چ ڕایەکت دەربارەی ئەوکۆمەڵە خەڵکە هەیە؟

بازارۆف گوتی:

- بەڕای من نەڕافائێل و نەهیچ یەکێك لەو نیگار کێشانەی باسیان دەکەی هیچ بەهایەکیان نییە.

- زۆرباشە!ئافەرین!ئارکادی گوێت لێیە هاوڕێکەت دەڵێ چی؟!لاوەکانی ئەمرۆش دەبێ ئاوا بیربکەنەوە!ئەوانە ڕێنوێنی کەری گەورەن!لە دەورانی ڕابردوودا ئەو گەنجانەی بۆ ئەوەی بە نەخوێندەوارو نەزان لەقەڵەم نەدرێن ناچاربوون کۆشش بکەن و دەرس بخوێنن بەلام ئەمرۆ پێویست بەوە ناکا،چونکە تەنیا بەڕەتکردنەوەی هەمووشتێك و گوتنەوەی ئەو وشەیە کە هەمووشتێك هیچ وپووچە،دەگەنە گەورەترین ڕادەی زانیاری.لەڕابردوودا لاوەکان گەمژەبوون و ئێستاش بوونەتە نیهلیست.لە چاوە توورەییەکانی ئارکادییەوە بریسکەیەك هەڵدەستا بەلام بازارۆف بە ئارامی وەلامی دایەوە:

- دیتت ئەوخۆپەرستییە،تۆی گەیاندە کویٚ...واباشترە واز لەو بگرەوبەردەیە بێنین.

لەکاتێکدا لەجێگاکەی خۆی هەڵدەستا،گوتی:

- کاتێـك دەتـوانم بیروبـاوەڕی ئێـوە قبوولٚبکـەم کـە لـەژیانی ڕۆژانـەدا ڕێساویاسـایەکم نیشانبدەی کە بەتەواوی ڕەتنەکرابێتەوە.

پاڤێلٚ پترۆڤیچ هاواریکرد:

- ملیۆنان نموونەت نیشاندەدەم...بۆنموونە هەمان ئەنجوومەنی گوندەکەی خۆمان.

بازارۆف بزەیەکی هاتیٚ وگوتی:

- دەربارەی ئەنجوومەنی گوندەکەتان واباشترە لەگەلٚ براکەتان قسەبکەی.چوونکە پێویسـتە بەکردەووە تێبگەی کەئەو ئەنجوومەنانەو گردبوونەوانـە تـاچ ڕادەیـەك گرەنتـی کۆمەلاٚیـەتیان هەیە...

- زۆرباشە،خێزانەکان لەبەرچاوبگرە.هەمان یاساوبنەمای کە لەنێوان خێزانـەکانی دێدایـە ڕمێنی هەیە.

- پێموایە هەرچی کورتووپووختتری پرسیارەکەتان وەلاٚم بدەمەوە لەهەمووی باشترە،ڕەنگە تۆش باسی ئەو خەزوورانەت زانبیبیٚ کـە لەگـەلٚ بووکـەکانیان دەسـت تێکەلاٚودەکەن.واباشـە بەونموونەیە کۆتایی پێبێنم...ئاغای کیرسانۆف تۆ دووڕۆژی تەواو بیربکەیەوەو تـەواوی چـینی کۆمەلاٚیـەتی و ڕێسـا باوەکـانی نێـوان ئەوانـە وەبیرخۆبێنیـەوەو پاشـان نموونـەیان بـۆمن بێنیەوە.ئێستا من وئارکادی دەڕۆین و...

- گالتٚە بەهەمووشتێکدەکەن.

- نەخێر قوربان.ئێمە ورگی بۆقـەکان هەلـٚدەدڕین...ئارکادی وەرە بابڕۆین.بـەڕێزان خـودا ئاگادارتان بیٚ.

دووهاوڕیٚ ڕۆیشتن و دووبراش بەیەکەوە مانەوەو تێکەوە ڕامان.سـەرەنجام پاڤێـلٚ پترۆڤـیچ گوتی:

- لاوەکانی رووسیەت بینی؟ ئەوانە دەبنە جێگرەوەی ئێمە.

نیکۆلاٚی پترۆڤیچ کە دەتگوت لە تەواوی گفتوگۆکەدا لەسەر ئاگردانیشتووە نیگـەران بـوو تەنیا لە ژێرەوە سەیرێکی ئارکادی دەکردوو هەناسەی هەڵدەکێشا،لە وەلاٚمی براکەیدا گوتی:

- جێگرەوانی ئێمە!دەزانی چیم وەبیرهاتۆتەوە؟رۆژێك لەگەڵ دایکی خوالێخۆشبوومان هەرامان بوو.ئەو هاواریدەکردو ئامادەنەبوو گوێ لەقسەکانی من بگرێ...منیش لەکۆتاییدا پێمگوت کەئەو ناتوانێ لەمەبەستەکانی من تێبگات ئێمە دوو وەچەی جیاوازین.ئەوقسەیەی منی زۆرپێناخۆشبوو.چی دەکەی؟ دەرمان هەرچەندە تاڵبێ ناچاری دەبێ بیخۆیەوە.جێنشینانی ئێمەش پێماندەڵێن کە لەوەچەی ئێوەنین.هیچ چارەیەك نییە،دەبێ دەرمانەکە بخۆینەوە.

- تۆ لەرادەبەدەر سادەو دڵسافی.من بەپێچەوانەی تۆ پێموایە کە لەوانە زیاتر دەزانین.رەنگە ئەو دەربڕینەی بەکاری دێنین کەمێك کۆن بن و ئەوجەسووریەی گەنجەکان هەیانە ئێمە نەمانبێ بەلاّم بەهەرحاڵ لەوان زیاتر سەرمان لێدەردەچێ...ئەو وەچە نوێیە چەندە پڕخواستن...ئەگەر لە یەکێکیان بپرسی لە شەرابی سووروسپی کامەیان هەڵدەبژێری،وا خۆی نیشاندەدا کە دەڵێی تەواوی دنیا سەیری دەکات وەلاّم دەداتەوە کە(من بەشێوەیەکی گشتی شەرابی سوورهەڵدەبژێرم)

فنیچکا تائەوکاتەی کە دەنگوهەرای لەژوورەوە گوێ لێبوو نەیویست بێتەژوورو هەربۆیە سەرێکی بەژوورێداکردوو پرسی:

- حەزتان لەچای نییە؟

نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەشوێنی خۆی هەستاو بەرەولای ڕۆیشتو گوتی:

- نا،پێیان بڵێ سەماوەرەکەی بەرنەوە.

پاڤیڵ پترۆڤیچ بەزمانی فەرەنسی ماڵئاوایی لە براکەی کردوو ڕۆیشت.

## (١١)

نیوکاتژمێر دواتر نیکۆلاێ پترۆڤیچ چووە ناوباخەکەی تاسەرێك لەساباتەکەی بدات کە زۆری خۆشدەویست.هێرشی بیرێکی خەمناك لە هەموولاوە سەری هەڵدابوو.بۆیەکەمین جاربوو پەی بەنێوانی خۆی وئارکادی دەبرد.مەودایەك کە هەررۆژ زیاتر بەربلاۆدەبوو.چ زستان گەلێکی سەختی لە پترۆسبۆرگ بێهوودە بەخوێندنەوەی کتێبی تازە بەسەربردبوو.چەندە کاتی لەرادە بەدەری لەگەڵ گەنجەکان بەسەربردبوو گوێی بۆ قسەکانیان شلکردبوو لەگەڵ تێکەڵبوون بە گفتوگۆکانیان هەستی بەشادی وشەوق کردبوو.لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە کە:

- کاکم دەڵێ ئێمەلەسەر هەقین.منیش راستگۆیانە بیردەکەمەوە کە هەقی ئێمەیە.بەلاّم ئەوان شتێکیان هەیە کە ئێمەنیمانە...ئایا ئیمتیازی ئەوان گەنجێتییە؟ نا تەنیا گەنجێتی نییە.رەنگە لەسەرووی ئەوەشەوە، ئەوەبێ کە ئەوان کەمتر پابەندی داب ورەسمی خانەدانین.

نیکۆلاێ پترۆڤیچ دەستێکی بەناوچەوانیداهێناو دووبارە لەگژفکران راچوو:

- ئەرێ بنیادەمێك چۆن دەتوانێ ئینکاری شیعربکا؟چۆن دەتوانێ هوونەر رەتبکاتەوە؟

سەیرێکی دەوروبەری خۆیکرد.حەزیدەکرد بزانێ چۆن گەنجەکان ئەو هەموو جوانییەی سرووشت رەتدەکەنەوە.شەو بەئارامی نزیکدەبۆوە.خۆر دەچوو لەپشت باخچەسپیدارە کانەوە کە نیوکیلۆمەتر ئەولاتربوو،خۆیبشارێتەوە.سێبەری درەختەکان هێدی هێدی بەدوای خۆر دەکەوتن.کابرایەکی دێهاتی هەولێدەدا بارگینە مردەلۆخەکەی لەکوێرە رێگا تاریکەکە،وەچوار ناڵەبخا.لەگەڵ ئەوەی ئەوپیاوە دێهاتییە بەبن سێبەردا دەرۆیشت بەلاّم تەواوی ئەندامی و هەتا پێنەکانی سەرشانیشی بەجوانی دەبینران.هەنگاوەکانی بارگینەکە بەروونی دەبینران.تیشکی خۆر لەلا بەلای سپیدارە کانەوە تێدەپەری و توێکڵەکانی رەنگی داربەروویان دەنواند.گەلاّی درەختەکان شین شین دەدرەوشانەوە.ئاسمان بەرەنگی شینی ئەرخەوانییەوە لە سەرووی باوە وەستابوو.پەرەسێلکەکان هەڵدەفرین.سروەی با وەستابوو،هەنگەکان کە درەنگتر بۆ پوورەکانیان دەگەرانەوەو هێشتا هەر لەناو گولاّندا دەهاتن و دەچوون.مێشوولەکان لەسەر درەختێکی تەریك نیشتبوونەوە.

- خودایە،سرووشت چەندەجوانە.

بۆ ماوەیەك حەزیکرد تا ئەوشیعرانەی لەبەری کردبوون وخۆشیدەویستن بخوێنێتەوە،بەلاّم کەوتەوە بیری ئارکادی و کتێبی ماددەو وزە،بێدەنگ بوو.لەهەمان شوێن ڕاوەستاو لە بێدەنگیدا بەناو خەمەکانیدا شۆڕبۆوە.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەخەیالّ پلاّوان چێژی وەردەگرت و ژیانی گوندی ئەوبەهرەیەی زیاتر کردبوو.هەرئەو چەند ڕۆژەی پێشیّ کەچاوەڕوانی ئارکادی دەکرد لە حەساری کاروانسەراکە ڕاوەستابوو دووچاری هەمان خەیالاّت ببوو.بەلاّم لەو ڕۆژەوە تا ئەمرۆ زۆرشت گۆڕابوون.ئێستا زۆر لەخالّە تاریکەکان،ڕووناك ببوونەوە.ئەویش بەچ حالّێك؟ دووبارە کەوتەوە بیری هاوسەرە کۆچکردووەکەی بەلاّم نەك وەك ئافرەتێکی مالّدارو کەیبانوو.ئەوی وەك کچێکی جوانی لەش و لار ناسك و نیگا پاك هێنایەوە بەرچاوی خۆی.یەکەم ڕۆژی دیتنی هاتەوەیاد.ئەوسەردەمە نیکۆلاّی پترۆڤیچ قوتابی زانکۆبوو.لە پلیکانەی ئەوخانووەی تێیدا دەژیا،لەگەلّی ڕووبەڕووبوو نەیزانی چۆن بوو شانی وەشانی کەوت.گەڕایەوەو بەزمانی فەرەنسی داوای لێبووردنی لێکردو گوتی: ببوورە.بەلاّم کیژە تەنیا زەردەخەنەیەکی هاتیّ وپاشان دەتگوت ترساوە تیژ تێپەڕی بوو لەپێچکردنەوەی پلیکانەکاندا ئاوڕێکی لە نیکۆلاّی پترڤیچ دابۆوەو سوورهەلّگەڕابوو...دوای ئەوە کەوتەوە یادی دیدارەخۆشەکان و گفتوگۆ کورت و خەندەکان،شادی،خەمەکان، شلّەژانەکان و بەکورتی تەواوی ئەودنیا شیرینە...ئەوانە بۆکویّ چووبوون؟ دوای ئەوە نیکۆلاّی پترۆڤیچ زەماوەندی لەگەلّداکردبوو.ئەو یەکێك لە خۆشبەختترین کەسانی دنیابوو.ئێستاش بیری لەوە دەکردەوە بۆچی ئەوکات و بیرەوەریە شیرنانە ئەمرۆ ئەبەدی نین.هەولّینەدەدا تەواوی ڕابردوو وەبیربێنێتەوە بەلاّم حەزی دەکرد کاتە لەدەست چووەکان بەهێزلە مێشکیدا بەزیندوویی بهێلّێتەوە.حەزیدەکرد دووبارە ماریا لەدەوری خۆیببینیّ و هەست بەگەرمای لەشی بکات.وەك ئەوە وابوو لەپشت سەری خۆیەوە دەیدیت...گوێی لەدەنگی فنیچکابوو:

- نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەکوێی؟

لەشی کەوتەلەرزین.نە هەستی بەئازارێك دەکردو نە شەرمیشی دەکرد...هەتا حەزیشی نەدەکرد فنیچکا لەگەلّ ماریادا بەراورد بکات.بەلاّم دەنگی ئەوژنە ئەوی بەیادی پیری وسپی بوونی قژەکانی خستەوە.بۆچی فنیچکا بانگی کردبوو؟خۆزیا وای نەکردبا.ئەو دنیایەی لەناویدا دەژیا لەگەلّ ئەودنیایەی ئێستادا زۆجیاواز بوون.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ هەستا سەرپێ و وەلاّمی دایەوە:
- لێرەم.تۆبڕۆ ئێستا دێم.
بیریکردەوە:
- ئەوانە هەمووی ئاسەواری خانەدانین.

فنیچکا سەیرێکی دەورووبەری ساباتەکەی کردو بێئەوەی قسەیەك بکا دوورکەوتەوە.نیکۆلاّی پترۆڤیچ پێی سەیربوو.تێگەیشت کە لەو ماوەیەی لەخەیاڵدابووە شەو داهاتووە.تاریکی هەموولایەکی داگرتبوو.ڕووخساری فنیچکا لەبەرچاوی بچووك و ڕەنگ بزرکاو دەهاتە بەرچاو.هەستا سەرپێ دەیویست بچێتەوە ماڵێ بەلاّم لە دەروونیدا شتێك ئارامی لێهەڵگرتبوو.کەوتە پیاسەکردن بەناو باخەکەدا.جارێك لە خوارێ وجایێکیش لەسەرێی دەڕوانی.ئاسمانی دەبینی کە ئەستێرەکان لەبەرچاوی چاوشارکێ دەکەن.هێندەڕۆیی تا هەستی بەماندووبوون کرد بەلاّم تا ئێستا ئارام نەببۆوە.ئای ئەگەر بازارۆف پێ بزانێ کە چی لەدەروونیدا ڕادەبرێ بێگومان سەرکۆنەی دەکات.لەوانەیە ئارکادیش سەرزەنشتی بکات.فرمێسك بە مژۆڵەکانی ئاغای چل وچوارساڵە دەهاتنەخوار.فرمێسکێك کە خراپتر لەو ئەشکانەبوون کەیۆلۆن لەچاوەکانی دەباراند.نیکۆلاّی پترۆڤیچ هەروا پیاسەی دەکردو لەگەڕانەوەی بۆلانەکەی کەپەنجەرە رووناکەکان بانگیان دەکرد دوودڵبوو.

نەیدەتوانی لەباخەکەو لەتاریکی ولەو هەوا فێنکەی کە لەرووخساریدەداو لەو خەمەی کەلە دەروونیدابوو جیابێتەوە...

لە پێچی باخەکە،لە پاڤێل پترۆڤیچ هەڵەنگوت،براکەی لێی پرسی:
- چی بووە؟ بۆوا ڕەنگت پەڕیوە؟ ناکا نەخۆشبی؟ بۆ ناچی کەمێك پشووبدەی؟

نیکۆلاّی پترۆڤیچ بەچەند وشەی کورت وپووخت حاڵی خۆی تێگەیاندو ڕۆیشت.

پاڤێل پترۆڤیچ کە گەیشتە کۆتایی باخەکە کەوتەوە بیرکردنەوە.لە ئاسمان ڕاما،بەلاّم لە چاوەکانیدا جگە لەرووناکی ئەستێرەکان هیچی دیکە نەدەبینرا.ئەو خەیالاّتی نەبوو.روحی وشك و پرلەکێشەو هەوەسبازو پەروەردە فەرەنسییەکەی نەیدەتوانی خەیالاّتی بێت.

هەمان شەو بازارۆف،بە ئارکادی گوت:

- بیرێکی باشم بۆهاتووە.ئەمڕۆ لە باوکتم بیست کە ئەو دۆستە بەناو بانگەتان بانگی کردووی بچی بۆشار بۆلای...باوکت ومامت ناچن.کەوایە با من و تۆبچین.هەوای ئێرە زۆر ناخۆشبووە.دەچین سەرێکی شار دەدەین و دووسێ ڕۆژان لەوێ دەمێنینەوە.

- تۆ جارێکی دیکەش دێیتەوە بۆئێرە؟

- نا،لەوێوە دەچمە سەردانی دایکم و باوکم.ئەوان لەسی کیلۆمەتری شاردا دەژین.ماوەیەکی زۆرە نەمدیتوون.دەبێ بیرێکیش لەوان بکەمەوە.بنیادەمی باشن.بەتایبەتی باوکم پیاوێکی رووخۆش و قسەخۆشە جگەلەوەش،من تاقانەی ئەوانم.

- زۆرلەوێ دەمێنیەوە؟

- پێموانییە.چوونکە زۆرمانەوەم لەوێ،ماندووم دەکات.

- لەگەڕانەوەتدا دێیەوەلامان؟

- نازانم.بزانین چی دێتەپێش...باشە،نەتگوت.دێی بچینەشار.

ئارکادی بەئارامییەوە گوتی:

- هەرچی تۆپێت باشبێ.

ئارکادی لەناخەوە بریارەکەی بازارۆفی پێخۆشبوو بەلاّم ئەدەب وای دەخواست کە هەستی خۆی بشارێتەوە.بۆ چما ئەویش نیهلیستێك نەبوو.

ڕۆژی دوایی،دووهاڕێی گەنج بەرەوشار کەوتنەڕێ.لاوەکانی ئاوایی لە ڕۆیشتنی ئەوان نیگەران بوون.تەنانەت دوونیاش گریا...بەلاّم پیرەمێردەکان خۆشحاڵ بوون.

## (١٢)

ئەوشارەی هـاوڕێ کانمـان دەیچـوونێ،وەك تێکـڕای شـارەکانی تـری رووسـیا،قایمقامێکی گەنج،پێشەوتووخوازو سەرەڕۆی هەبوو.کە لەهەمان سالّی قایمقامێتی خۆیدا نەك تەنیا لەگـەلّ شارەوانی و بەڕێوەبەرانی شار تێکی دابوو،لەگەلّ کارمەندانی قایمقامیەتیش نێوانێکی هێنـدە خۆشی نەبوو.تەنانەت لەگەلّ نوێنەری پەرلەمانی شاریش تێککگیران.نوێنەری پەرلـەمانی شـار سەروانێکی خانەنشین کراوبـوو، کەلەمیوانداریـدا بـەناوبانگ بـوو بەهـەمان هـۆوە بریـاردرا بـۆداوەریکردن لـە نێـوان ئـەو و قایمقامـداو چارەسـەرکردنی کێشـەکان،نوێنەرێکی تایبـەت ،بەدەستەلاّتێکی بالاّوە بنێردرێتەشارو ئەونوێنـەرەش کەسـێك نـەبوو جگەلـە مـاتۆی ئیلـیچ کۆلیازین کە ڕۆژگارێك باوکی بەرپرسـیارێتی چـاودێری کردنـی نیکـۆلاّی وپاڤێـلّ پترۆڤیچـی بەئەستۆوە بوو.ماتۆی گەنجێکی چل سالّەبوو کە ئایندەیەکی درەخشانی لەکاری دەولّەتیدا لـێ چاوەڕوان دەکرا.بەهەرلایەکی سینەی ئەستێرەیەکی پڕشنگدار هەلّواسرابوو ئەگەرچـی یـەکێك لەئەسـتێرەکان هـی یـەکێك لـە دەولّەتـە بێگانـەکان بوو.لەڕاستیشـدا ئەسـتێرەیەکی بـێ بەهابوو.ئەویش وەك قایمقام پێشکەوتوو خوازبوو ئەگەرچـی بـە کەسـێکی گـرنگ دەژمێـردرا لەگەلّ ئەوەش هیچ وەك مرۆڤە گرنگەکان نەدەچوو.سەرەڕای ئەوەش زۆرلەخۆی ڕازیبـوو بـەلاّم رەفتاروئا کاری سادەوخۆمانەبوو.گوێی لەقسەی خەلّکی دەگرت و هەندێجار هێندە پێدەکـەنی کەلەیەکەم دیتنیدا بەمرۆڤێکی رووخۆش و قسەخۆش دەهاتەبەرچاو لەگەلّ ئەوەشدا لەهەنـدێ کاتدا هێندە سەختگیرو دلّڕەقبوو کە لێی چاوەڕوان نەدەکرا.بەزۆری دەیگوت:

- دەبێ وزە وەربگری.

پاشان بەفەرەنسی لێی زیاد دەکرد:

- وزە وەرگرتن گرنگترین تایبەتمەندی کەسێکی سیاسەتمەدارە.

سەرەڕای ئەوانەش زۆربـەیان فریویـان دەداو هەرکارمەنـدێکی بەئـەزموون زۆر بەئاسـانی دەیتوانی کلاّوی لەسەرىنێ.زۆربەچاکە باسی((گیزۆ))ی نووسەری فەرەنسی دەکردو هەولّێـدەدا

لەهەموان بگەیەنیّ کە ناکریّ ئەولەڕیزی ئەوکارمەندە ئاساییانەی ولاّت بـژمیّردریّ چـوونکە هیچی لەبەرچاو ون نابیّ و تەنانەت ئەگەر ئەو ڕووداوە بچووکیش و بیّ بایەخیش بیّ.تەنانـەت خۆی لەسەرووی ئەوانەش نیشاندەداو دەیگوت تەواوی ئەوکتیّبانە دەخویّنیّتـەوە کـە لـەبواری ئەدەبیاتی هاوچەرخدا بلاّودەکریّنەوە.ڕیّك وەك ئەو پیاوە سەرخۆشەدەچوو کە لەکۆلاّندا دەبینیّ منداڵاّن یاری دەکەن و تیّکەلیّان دەبیّ.بەشیّوەیەکی گشتی زۆر بەسیاسەت مـەدارانی دەوانـی ئەلکساندەر دەچوو کە هەرشەویّك بەر لەڕۆیشتن بۆشەونشینی سوورچیناخانم بەیانی زووەکـەی لاپەڕەیـەکی لـە کتـیّبی (کنـدیاك)[1] دەخویّندەوە.بەوجیاوازیانـەوە لـەوان سـوورترو جـدی تربوو.ئەگەرچی لە زۆرکاراندا سەری دەرنەدەکردو ئاوەزیّکی درووست و حیسابیشی نەبوو بەلاّم ئەوکارانەی پەیوەندیان بەخۆیەوە هەبوو بە وەستاییەکی باش ئەنجامی دەدان.

ماتۆی کۆلیازین بەرروویەکی خۆشەوە کەشیاوی سیاسـەت مـەداران و مرۆڤـە گەورەکانـە پیّشوازی لەئارکادی کرد.بـەلاّم هەرکـە زانـی بـاقی کیرسـانۆفەکان بانگهیّشـتەکەیان قبـووڵ نەکردووەو لە ئاوایی ماونەتەوە،قۆڵی کراسەجوانەکەی تەکاندوو گوتی:

- ئاکاری بابت هەمیشە سەیروسەمەرەن.

پاشان ئاراستەی قسەکانی بۆلای کارمەندە گەنجەکە گۆڕی وگوتی:

- دەڵیّی چی؟

کارمەندە گەنجەکـە بەوپـەڕی سەرسـامییەوە سـەیریدەکرد دیـارە مـاتۆی کۆلیـازین کـە توانیبووی کارمەندەکەی خۆی نیگەران وسەرسام کردووە ئیدی هیچ گرنگیەکی پیّنەدا.

بەشیّوەیەکی گشتی هەریەکیّك لە سیاسییەکانمان،بۆ ئازاردان و ترساندنی بەردەسـتەکانیان شیّوەیەکی تایبەتیان هەیە لەو ڕیّگایە بەرپرسەکە لە بەردەستەکەی دەپرسیّ:

- ئەمڕۆ چ ڕۆژیّکە؟

بەردەستەکە بەوپەڕی ڕیّزەوە دەڵیّ:

- ئەمڕۆ هەینی یە گەورەم.

کەسە گەورەو گرنگەکە بەتوڕەییەوە دەپرسیّ:

- گوتت چی؟

- عـەرزم کردی هـەینی یە گەورەم.

---

١- زانایەکی فەرەنسی بوو.

- هەینی؟ چ هەینی یەك؟

- هەینی یەكێك لەڕۆژەكانی هەفتەیە.

- چۆن چۆنی؟ ئێستا تۆ دەتەوێ شتم فێركەی.

ماتۆی كۆلیازین ئەگەرچی خۆی بە ئازادیخواز دەزانی لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەپێڕی ئەو سیاسیانە دەژمێردرا.بەئاركادی گوت:

- ئامۆژگاریت دەكەم كە حەتمەن دەبێ سەر لە قایمقام بدەی.ئەو قسەیەم نەدەكرد چونكە پابەندی دابونەریتی كۆنم.نا،لەبەرئەوەیە ئەوەت پێدەڵێم كە ئەو پیاوێكی تێگەیشتوو خوێندەوارە...بۆیەپێموایە تۆش لەدیداری كەسانی پێشكەوتوخواز خۆشحاڵ دەبی...هیوادارم لە مەبەستەكەم بگەی.دووسبەی شەوێ،ئاهنگێكی گەورە وەڕێدەخا.

- تۆش لەو ئاهەنگە بەشداری دەكەی؟

ماتۆی كۆلیازین بە ئاهێكی دەستكردەوە گوتی:

- ئەو ئاهەنگەی بەشانازی منەوە ڕێكخستووە...تۆ سەما دەزانی؟

- بەڵێ،بەلاّم زۆرخراپ سەمادەكەم.

- زۆر بەداخەوە.ئێرە كچی زۆر جوان و لەباری لێن و ئەوەش مایەی داخەكە گەنجێكی وەكو تۆ سەما باش نەزانێ.ئەوەی نالێم چونكە باوەڕم بەبنەما كۆنەكان هەیە.منیش پێم وانییە عەقلّی بنیادەم لەوەدابێ بەلاّم ئیتر دەورانی (بایرۆنیزم) و گوێ نەدان بە دنیاو نەفرەتكردن لە یاساكان تێپەڕیوە.

- مامەگیان،بەهۆی باوەڕبوون بە بایرۆنیزمەوە نییەكە...

كۆلیازین چووەناو قسەكانی ئاركادییەوەو گوتی:

- بە كەسایەتییە گرنگەكانی ئێرەت دەناسێنم و لەبن باڵی خۆمت دەگرم.

پاش بزەیەكی لەخۆباییانە،درێژەیدایە:

- پێت ناخۆش نیە؟وانییە؟

لەوكاتەدا،خزمەتكارەكەی هاتنی سەرۆكی دارایی شاری ڕاگەیاند،كە پیرەمێرلادێكی دەم ولێو چرچ بوو.پێرەمێرد خۆی بەعاشقی هاوین دەزانی،ئەوهاوینەی كە هەنگەكان شیلەی گوڵەكان دەمژن.دوای هاتنی ئەو،ئاركادی چوودەرەوە.

بازارۆف لە میوانخانەکە چاوەڕوانی بوو،دوای گفتوگۆیەکی زۆر ڕازیکرد کە بەیەکەوە بچنەلای قایمقام.بازارۆف گوتی:

- دەڵێی چارەیەکی دیکەمان نییە.ناکرێ لەنیوەی ڕێیە بەجێتبێڵم.ئێمە هاتووین پیاوە گەورەکان ببینین.کەوایە دەچین و دەیانبینین.

قایمقام بە ڕووخۆشییەوە بەخێرهاتنی کردن.بەڵام نە فەرمووی دانیشتنی کردن و نەبۆخۆشی دانیشت.بەهەڵپەهەڵپ دەهاتە بەرچاو هات و هاواریدەکرد.لە بەیانییەوە کە جلوبەرگێکی تەسکی لەبەرکردبوو لێکدا لێکدا فەرمانی دەدا،هیچ کات تا دوای هەموان نانی خۆی نەدەخوارد.هەرئەو کارەش ببووە هۆی ئەوەی کە نازناوی (بووردا) یان لێنابوو.ئەو کیرسانۆف و بازارۆفی بانگهێشت کردبوون کە بێنە ئاهەنگەکەو دوای ماوەیەك داوەتەکەی دووبارەکردەوەو ئەوانەی بەبرایانی کایسارۆف بانگ کرد.لاوەکان لەکاتی گەڕانەوەیاندا لەلای قایمقام پیاوێکیان بینی جلوبەرگێکی لەشێوەی پان ئیسلاویەکانی لەبەردابوو،هاواریکرد (یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ) لەو گالیسکەیەی کە تێیدابوو بەرەولای بازارۆف بازیدا.بازارۆف کە هەروا بەڕێگادا دەڕۆیشت گوتی:

- کاك سیتنیکۆف تۆ لەکوێ و ئێرەلەکوێ؟

- هەرگیز نەمدەتوانی بیریشی لێبکەمەوە کە تۆ لێرە دەبینمەوە.

کابرا بەدەست ئاماژەی بۆگالسکە چییەکەکرد کە بەدوایدا بێت لە کاتێکدا کە لەقوڵکەیەك بازیدەدا گوتی:

- باوکم لێرەکاری هەبوو منیش هاتم تا کارەکەی بۆ ڕاپەڕێنم و بیستم تۆش لەوشارەی.بۆیە هاتمە مزڵەکەت تا بتبینم.(کاتێك دووهاوڕێ گەڕانەوە میوانخانەکە کارتێکی بچووکیان دیت کە بەفەرەنسی و رووسی وشەی ستینیکۆفی لەسەر نووسرابوو) هیوادارم نەچووبنەلای قایمقام.

- هێندە هیوادارمەبە چوونکە ئێمە ئێستا ڕاستەڕێ لەلای ئەو دەگەڕێنەوە.

- کەوایە دەبێ منیش بچمەلای ئەو.یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ ...من بە هاوڕێکەت... ناناسێنی؟

بازارۆف بێ ڕاوەستان لەبن لێوانەوە گوتی:

- ستینیکۆف، کیرسانۆف.

ستینیكۆف دەستكێشەكانی لەدەست دەرهێنان،بزەیەكی هاتیێ و گوتی:

- بەدیدارتان خۆشحاڵم.دەربارەی تۆ زۆرشتم بیستوون...من لەهاوڕێیان یان باشترە بڵێم لە قوتابیانی كۆنی یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچم.تەواوی ئەندێشەو بیركردنەوەم بەقەرزداری ئەو دەزانم.

ئاركادی سەیرێكی قوتابیەكەی بازارۆفی كرد.كاریگەری شڵەژان و ساویلكەیی بەرووخسارە بچووكەكەیەوە دیاربوو.نیگاكانی كەمێك تیژامان و نیگەرانی پێوە دیاربوو.ستینیكۆف دریژەیدایە:

- باوەڕناكەی كاتێك بۆ یەكەم جار یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ پێی گوتم كە نابێ قسەی فەلسەفی هێندە بەگرنگ وەربگری،زۆرخۆشحاڵ بووم...دەتگوت ژیانێكی تازەم دۆزیوەتەوە.بەخۆمم گوت سەرەنجام ئەوكەسەی كە دەمویست دۆزیمەوە.تا لەبیرم نەچووە پێت بڵێم كە یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ دەبێ حەتمەن سەردانی یەكێك لەخانمەكانی ئێرەبكەی.چوونكە ئەو ئامادەیە گوێ لەقسەكانی تۆبگرێ.بەكەڵكی تۆدێت پێموایە ناویشت بیستووە.

بازارۆف پرسی:

- كێیە؟

- كولشینا خانم.خانم یۆدۆ كیسیا كولشینا.ئافرەتێكی تێگەیشتوو پێشكەوتووخوازە.ڕاستیت دەوێ پێم باشە هەرئێستا بچینەلای.ماڵەكەی لەو نزیكانەیە.دەچینە ماڵەكەی و قاوەڵتیش هەرلەوێ دەخۆین.خۆ نانی بەیانیت نەخواردووە؟

- هێشتا نا.

- باشتر.تا لەبیرم نەچووە ئەوەش بڵێم لەمێردەكەشی جیابۆتەوەو ئێستا بۆخۆی ئازادە.

بازارۆف پرسی:

- ژنێكی جوانە؟

- نا،ناكرێ كە بڵێم جوانە....

- كەوایە شێتی دەمبەیەماڵەكەی؟

- گاڵتەیەكی خۆشبوو...بتڵێك شامپانیامان بۆدادەنێ.

- ئاوا.لەوێ هەمووشتێك دەردوكەوێ ...ئێستا باسی باوكتم بۆبكە.ئایا ئێستاش بەدوای قازانجی مڵكانەو ئەوجۆرە شتانەوەیە؟

ستینیكۆف بەشڵەژان و بزەوە گوتی:

- ئێستاش وەدوای ئەوشتانەدەکەویٚ...باشە لەگەڵم دێن یان نا؟
- ڕاستیتدەویٚ نازانم.
ئارکادی بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:
- تۆ هاتووی خەڵکی ئێرەببینی.باشە بڕۆببینە.
- کیرسانۆفی بەڕێز،بۆچما تۆش نایەی؟
- ئاخر ئەوە باشنییە هەموومان وەسەرسەری گەڕێین.
- ژنێکی زۆرباشە...
بازارۆف پرسی:
- بتڵە شامپانیاکە مسۆگەرە؟
- بەڵیٚ،زەمانەتی ئەوەیان دەکەم.
- بەچ شتێك زەمانەتی دەکەی؟
- بەسەری خۆم.
- ئەگەر بەکیسەی باوکت زەمانەتت کردبا باشتربوو.کەوایە بابڕۆین.

## (١٣)

ئاڤدۆ ڤیتا نیکی تیشنا لەباڵەخانەیەکدا دەژیا کەلەشێوەی خانووەکانی مۆسکۆ درووست کرابوون.ماڵەکەی لەیەکێك لەشەقامە تازەسووتاوەکاندا هەڵکەوتبوو.هەموودەزانن کە شارەکانی پارێزگا هەرچەند ساڵ جارێك دووچاری سووتان دەبنەوە.لەسەرووی کارتی سەردانی دەرگاکە،زەنگێکی پێوەبوو.لە ڕاڕەوی ژوورەکە ژنێك کە دیارنەبوو قەرەواشە یان هاودەمە،پێشوازی لێکردن.

سیتینکۆف پرسی:

- ئاڤدۆڤیتا نیکی تیشنا لەماڵەوەن؟

دەنگێکی ناسك لەژوورەکەی تەنیشتیانەوە هاتەبەرگوێ:

- ڤیکتۆر تۆی؟ فەرموو.

ژنەکەی پێشێ خێرا ونبوو.سیتنیکۆف خێرا بالاپۆشەکەی داکەند.لەژێرەوە چاکەتێکی درێژی لەبەردابوو،دوای ئەوەی سەرنجێکی ئارکادی و بازارۆفیدا بەدەنگێکی بەرز وەلامی ژنەی دایەوە:

- بەتەنیا نیم.

هەمان دەنگە ناسکەکە وەلامی دایەوە:

- کێشەنییە.

گەنجەکان چوونەژوورێکەوە کەزیاتر بەژووری کار دەچوو تا ژووری پێشوازی.کۆمایەك ڕۆژنامەو گۆڤاری رووسی و نامەی هەڵنەپچڕاو لەسەر مێزێکی خڕ هەڵڕژابوون و ئاغزوونە جگەرە بەژوورەکەدا فڕێدرابوون.خاتوون تاڕادەیەك گەنج بوو قژی بۆرو لوول بوو دەسماڵێکی تەنکی بەسەر سەریەوەبوو لەسەر کورسییەکی چەرمی پاڵی دابوۆوە.جلکێکی ئاوریشمی نارێکی لەبەردابوو بازنەیەکی گەورەی لەدەست دابوو.لەگەڵ هاتنەژوورەوەی میوانەکان لەجێی خۆی هەستاو پاڵتۆ مەخمەرە زەردەکەی بەسەر شانیدادا.دەستی سیتنیکۆفی گوشی و لەسەرخۆ گوتی:

- سلاو،ڤیکتۆریا.

سیتنیکۆف بە لاسایی کردنەوە لەبازارۆف بە ڕاوێژێکی توندو پتەو گوتی:

- بازارۆف،کیرسانۆف.

کوکشینا گوتی:

- بەخێربێی.

پاشان چاوەخڕەکانی لەپشت لووتە بچووکە کەیەوە هەڵکێشان و لەبازارۆفەوە ڕاماو گوتی:

- بەڵێ،بازارۆف.زۆرباش دەتناسم (ئەویش وێڕای زۆر لەخانمانی مۆسکۆ عادەتی وابوو کەپیاوان هەر لەیەکەم دیداری ئاشنابووندا بەناوی نازناویانەوە بانگ بکا) جگەرەدەکێشی؟

ستینیکۆف کە لەوبەینەدا خۆی هەڵدابووە سەرکورسییەکی چەرمییەوە گوتی:

- جگەرە بەجێی خۆی بەلاّم پێشتر باشتێك بخۆینەوە.ئێمە زۆربرسیمانە.تکایە فەرمانبدە قاپێك شامپانیامان بۆ بێنن.

یۆدڤ کسیا پێکەنی و گوتی:

- ئەی ئاسانخواز.ئەو زۆر بەخۆوە ژیووە،وانییە بازارۆف؟

کاتێك پێدەکەنی پووکی سەرەوەی وەدەرکەوت.

بازارۆف هەرلەگەڵ وەژوور کەوتنی تا ئێستا چووبووە ناوقاوغی خۆیەوە.هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش لە رووخساری ئەوژنەدا نەدەبینرا.بەلاّم قەلاّفەتی حاڵەتێکی تایبەتی هەبوو.هەڵسووکەوت و گفتوگۆی سادەوخۆمانەبوون بەلاّم بەئاسانی تێدەگەیشتی کە کارەکانی دەستکردن.ستینیکۆف حاڵەتێکی جدی بەخۆوە گرت وگوتی:

- من ئەوجۆرەژیانەم پێخۆشەو هیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێوان ئاسانخوازی و ئازادیخوازیدا نابینم.

یۆدڤ کسیا هاواریکرد:

- نا،ئەو دووشتانە لێك جیاوازن.

لەگەڵ ئەوەی دەستووری بەخزمەتکارەکەیدا تا خواردن و شامپانیا بێنێ ڕووی لە بازارۆف کردو گوتی:

- من دڵنیام کە لەجیاوازی ئاسانخوازی و ئازادیخوازیدا لەگەڵ ڕای مندای.

بازارۆف رەتیکردەوە:

- بەداخەوە،نا.تەنانـەت لـە ڕوانگـەی زانسـتی کیمیایشـەوە پارچەگۆشـتێك باشـترە لـە لەتکەنانێك.

- تۆ لەگەڵ کیمیاش سەروکارت هەیە؟منیش عاشقی کیمیام.تەنانەت چەسپێکی تایبـەتم درووستکردووە.

- تۆ؟چەسپ؟

- بـەڵێ...دەزانی بـۆ ئـەوکارەم کـردووە؟ ئەوچەسـپەم تایبـەت بـۆ بووکەشووشـان درووسـتکردووە.ئاخر منـیش ئـەهلی کـارو کردەوەم.حـەیف داهێنانەکـەم هێشـتا تەواونەبووە...پێویستە دووبارە کتـێبی (لیبـیخ) بخوێنمـەوە...بزانم تـۆ وتـاری کیسـلاکۆفت خوێندۆتـەوە کـە دەربـارەی کـاری ژنـان نووسـیویەتی و لـە (هـەواڵی مۆسـکۆ) دا بلاۆکراوەتەوە.ئەگەر نەت خوێندۆتەوە تکات لێدەکەم بیخوێنەوە،دەربارەی ژنان و باسوخواسی تایبەت بەوان نێوانت چۆنە؟ هاوڕێکەت چ کارەیە؟ ناوی چییە؟

خاتوو کوکشینا لێکدا لێکـدا پرسـیایدەکرد بێئـەوەی چـاوەڕوانی وەلاۆمـی پێشـووی بـێ پرسیارێکی ئاراستە دەکرد.ڕێك وەك منداڵەزمان لووس و لەخۆباییـەکان ،کـە هەڵسـووکەوت لەگەڵ دایکیان دەکەن.

ئارکادی خۆی ناساند:

- ئارکادی نیکۆلاۆیۆڤیچ و بێکار.

یۆدڤ کسیا پێکەنی و گوتی:

- باشتر!جگەرە دەکێشی؟ ڤیکتۆریا ئەریٚ دەزانی لێت تووڕەم؟

- بۆچی؟

- چوونکە دەڵێن دووبارە تاریفی جۆرج ساند دەکەی.ئەو ژنێکـی دواکـەوتووە کـە بـەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەمرسۆن بەراورد ناکرێ.ئەوهیچ بڕواو فکرێکی لەبواری توێکاری و بابەتگەلی لەوشێوەیە نییە.من دڵنیام کەهیچ شتێك دەربارەی زاوزێ ناسی نـازانێ ئێسـتا چـۆندەبێ لـە دەورانی ئێمەدا لەوشـتانە بـێ ئاگـابی؟(یۆدڤ کسـیا بەشـڵەژانەوە دەسـتەکانی ڕادەوەشـاند) وتارێکی نایابی یەلیسۆڤیچ لەوبارەیەوە نووسـراوە.ئەوکاکە بەڕاسـتی بێوێنەیـە.(یۆدڤ کسـیا بەشێوەیەکی ئاسایی وشەی کاکی لەجێی کەسەکە بەکاردێنا) بازارۆف وەرە ئێـرە لـەلای مـن دانیشە...ڕەنگەنەزانی چەندەت لێدەترسم.

- بۆ؟

- تـۆ زۆر توونـد ڕەخنەدەگری...خوایـەگیان پێکـەنینم دێـت منـیش وەك ئاغاژنـەکان قسەدەکەم..

ئەگەر ڕاستیت دەوێ منیش ئاغام.ئاغای زەویەك کە خۆم بەڕێوەی دەبەم.سەرکارێکم هەیە ناوی یەرۆفییە بنیادەمێکی سەیرە...بەلاّم بڕیارمـداوە بـۆ هەمیشـە لێـرە وەمێنم.ئەگەرچـی شارێکی باشیش نییە بەلاّم...دەلێی چی؟

بازارۆف بەخوێن ساردییەوە گوتی:

- ئەوشارەش شارێکە وەك هەموو شارەکانی دیکە.

- بەلێ،خۆشییەکانی ئێرە هێندە بچووکن کەمرۆڤ دووچـاری سەرسـووڕمان دەکەن.پێشـتر زستانان لەمۆسکۆ دەمامەوە...بەلاّم ئێستا مێردەکەم لەوێ دەژی.سەرەڕای ئەوەش مۆسکۆش وەکو مۆسکۆی جاران نییە.نیازم وایە سـەفەرێکی دەرەوەبکەم.سـالّی پـار هێنـدەی نـەمابوو وابکەم.

بازارۆف پرسی:

- دەچی بۆپاریس؟

- پاریس و هایدلبێرگ.

- بۆچی هایدلبێرگ؟

- چوونکە (بۆنزەن)[1] لەوێیە؟

بازارۆف قسەی نەکرد.کوکشینا دووبارە پرسیاریکرد:

- پیرسا پژینیکۆف دەناسی؟

- نەخێر.

- چۆن نایناسی...ساپژینیکۆف بەزۆری دەچێتەلای لیدیا خوستاتۆڤا.

- ئەویشیان ناناسم.

- بەلێ،ئەوپێشنیاری کرد لەگەلّم بێتەمالێ...سـوپاس بۆخـوا کـە گرفتـاری هـیچ کـۆت وبەندێك نیم و منداڵیشم نییە...گوتم سوپاس بۆخوا...بەهەرحالّ چ فەرقێکی هەیە؟

---

١- داهێنەرێکی ئەلّمانیە.

یـۆدڤ کسـیا پەنجـەکانی لـە ئـەنجامی زۆرجگەرەکێشـان زەرد هەڵگەڕابوون.جگەرەیـەکی پێچایەوەو پێیکرد.لەو کاتەشدا خزمەتکارەکە بەسینیەکی گەورەوە هاتەژوور.

- ئەوەش قاوەڵتی.فەرموون نۆشی گیانتان بێ.ڤیکتۆر تۆسەری بتڵەکە بکەوە.تۆ وەسـتای ئەوکارانەی.

- بەڵێ،لەوکارانەدا وەستام.

دووبارە دەنگی پێکەنینە ناقۆلاکەی ستینیکۆف بەرزبۆوە.بازارۆف دوای هەڵدانی سێیەمین پێك گوتی:

- ئەریێ لێرە ئافرەتی جوان دەست دەکەون؟

یۆدڤ کسیا وەلاّمی دایەوە:

- بەڵێ،بـەلاّم ئەوانـە هــەموویان بــێ مێشــك و پووچــن.بۆنموونە هــەمان ئەوهاوڕێیــەم ئادینسۆڤا لەشـولارێکی نـاڕێکی نییـە هەرچـەندە ناوبانگەکەشـی...بەهەرحاڵ ئەوەشـتێکی زۆرگرنگ نییە.بەلاّم ئەو ئازادیخوازو...نییە.دەبێ دووبـارە درووسـت بکرێتـەوە.من دەمێکـە لەوبڕوایەدام کە ئافرەتانی ئێمە پێویستە سەرلەنوێ درووست بکرێنەوە.

سیتنیکۆف بەدوای قسەکانی ئەودا گوتی:

- ئەوژنانە چاك ناکرێن.ئەوانە شایستەی سووکایەتی پێکردنن.(سـیتنیکۆف لـە هەسـتی بێزاری بەرامبەر بەهەرکەسێك کەویسبای چێژی وەردەگرت.هیچ کات حسابی بۆئەوە نـەدەکرد کە ماوەیەکی دیکە دەبێ لەبەرامبەر ژنەکەی،کە تـەنیا لەبەرئـەوەی شـازادەیە دەمـی خـۆی ببەستێ و خۆی بەکەم بنوێنێ) هیچ ژنێك ناتوانێ لەوتەکانی ئێمە تێبگات.هیچ یەکێك لەوانە شایستەی ئەوەنین کە ئێمەی پیاوان بەشێوەیەکی جدی دەربارەی ئەوان وتووێژ بکەین.

بازارۆف گوتی:

- ئەوان پێویستیان بەتێگەیشتنی وتەکانی ئێمە نییە.

یۆدڤ کسیا خۆی دەنێو گفتوگۆی دووهاوڕێکە هاویشت و پرسی:

- باس لەچ کەسانێك دەکەن؟

- لە ئافرەتە جوانەکان.

- بۆ چما لەلایەنگرانی (پرۆدۆن) ن؟

بازارۆف دانیشت و بەکورتی گوتی:

- پەیڕەوی لە بیرو باوەڕی هیچ کەسێك ناکەم.پەیڕەوی لە بیرو بۆچوونەکانی خۆم دەکەم.
سیتنیکۆف کە لەوهەلەی هاتبووەپێش لە بەرامبەر مامۆستاکەی خۆشحاڵ دەهاتەبەرچاو هاواریکرد:
- مردن بۆتەواوی یاساوڕێساکان.
کوکشینا ویستی بەرگرییەك بکات:
- بەلاّم ماکالی[1]...
سیتنیکۆف قسەکەی پێبڕی:
- بمرێ ماکالی.تۆ پشتیوانی لەژنان دەکەی.
- من سوێندم خواردووە تا دواساتەکانی ژیانم پشتیوانی لەمافەکانی ژنان بکەم.
- مردن بۆ...
سیتنیکۆف قسەکانی گۆڕین:
- نا،منیش پشتیوانی لەمافەکانی ئەوان دەکەم.
- بەلاّم دەڵێی یەك ئیسلاّوی.
- نا،ئیسلاّوی نیم،ئەگەرچی...
- نا تۆئیسلاّوی.تۆ لایەنگری لە کۆیلەبوونی ژنان دەکەی و پێت ناخۆش نەدەبوو قامچیەکییان وەدەست دابای.
بازارۆف گوتی:
- قامچیش شتێکی خراپ نییە.بەلاّم کێشەی ئێمە لە ئێستادا ئەوەیە کە گەیشتووینە دوادلۆپە.
- دوادلۆپەی چ شتێك؟
- دوادلۆپەی شامپانیا.نەك بە دوادلۆپی خوێنێك کە دەتەوێ لە ڕێگای ئافرەتاندا بەختی بکەی.
- من ناتوانم بەبێ مووبالاتی چاودێرێکی بێ ڕێزی ژنان بم.ئەوکەسەی کە هێرش دەکاتە سەرژنان باشترە لەجیاتی ئەوکارە کتێبی (مێشێل) بخوێنێتەوە. (لەبارەی عەشقەوە) بەڕاستی کتێبێکی گەورەیە.

---

١- مێژوونووس و فەیلەسوفی ئینگلیزی.

لە کاتێکدا بەنازەوە دەستی بەسەر سەرینەکەی دادێنا گوتی:

- بەڕێزان وەرن با لەبارەی عەشقەوە قسەبکەین.

بێدەنگییەك باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا بەڵام سەرەنجام بازارۆف بێدەنگیەکەی شکاندو گوتی:

- نا،لە جیاتی قسەکردن دەربارەی عەشق،وەرن با باسی خانمێك بکەین کە بەهەڵەنەچووبم ناوی ئادینسۆڤایە.

سیتنیکۆف بەهەمان ئاوازی ناسازگاری خۆیەوە گوتی:

- ژنێکی زۆرجوانە.بێوەژنێکی دەوڵەمەندەو جوانە.ئەوت پێدەناسێنم ئەگەرچی خاوەنی ئەندێشەیەکی بەرزیش نییە.خۆزیا لەگەڵ یۆدڤ کسیای خۆمان پەیوەندی زیاتری هەبوایە تا بەڵکو ئەوعەیبەشی نەمابا.یۆدڤ کسیا من بەخۆشی تۆ دەخۆمەوە.

- ڤیکتۆر،زۆرکەڵەك بازی.

نانخواردنی قاوەڵتی درێژەی کێشا،دوای بتڵی یەکەم،بتڵی دووەم و سێیەم و چوارەمیش هەڵپچڕان.

یۆدڤ کسیا بێ پسانەوە قسەی دەکرد.سیتنیکۆفیش بەهەوای وی دەڕۆیشت.قسەی زۆریان دەربارەی هاوسەرگیری و شتگەلی خەیاڵی و تاوان کرد.قسەلەسەر ئەوەبوو کەئایا مرۆڤەکان لەگەڵ لەدایك بوونیان یەکسانن و کەسایەتی لەچ کاتێکدا بەرجەستەدەبێ.سەرەنجام یۆدڤ کسیا بەرووخساری سوورهەڵگەڕاو لەخواردنەوەی شامپانیا چوو لەپشت پیانۆکەی دانیشت نینۆکە درێژەکانی لەسەر نۆتەکان داناو بەدەنگێکی نووساو سەرەتا بەگوتنی گۆرانییەکی قەرەجەکان و پاشانیش بەگۆرانی( چاوی خەواڵوو دەکوژێتەوە) دەستپێکرد.

سیتنیکۆفیش سەری خۆی بەملپێچەکەی بەست و وەك عاشقێك خۆی دەنواندو ئەوەی دەگوتەوە:

(با لێوەکانم

لەگەڵ ماچی گەرمدا،پێوەند بکرێن)

ئارکادی لەوە زیاتر تاقەتی نەما.لەشوێنی خۆی هەستاو هاواریکرد:

- ئیدی بەسە.ئێرە وەك شێتخانەی لێهاتووە.

بازارۆف کە زۆر بەکەمی قسەی دەکردو زیاتر شامپانیای دەخواردەوە،بە باوێشکدانەوە هەستاسەرپێ و بێ ماڵئاوایی کردن لەخاوەن ماڵ لەگەڵ ئارکادی وەدەرکەوتن.سیتنیکۆفیش بەدوای ئەواندا دەرپەڕی و بەمەراییکردنەوە گوتی:

- ئێستا ڕاتان چۆنە؟ گوتم کە ژنێکی زۆرباشە.خۆزگە هەمووژنەکان وەکو ئەوبان....لەرووی ڕەوشتەوە بێوێنەیە.

- ئەو دامەزراوەیەی بابیشت نموونەیەکی ڕەوشت بەرزییە.

سیتنیکۆف دووبارە پێکەنی.شەرمی لەئەسلێ ونەسەبەی خۆی دەکرد.بەلاّم نەیدەزانی لە ئێستادا لەو قسەیەی بازارۆف پێویستە برەنجێ یان شانازی پێوەبکا.

## (١٤)

دوای چەند ڕۆژێك قایمقام ئاهەنگێكی لەماڵەكەی خۆیدا سازكرد.دیارترین كەسی ئەومیوانییە ماتۆی ئیلیچ بوو.خاوەن ماڵ تووشی هەركەسێك با دەیگوت ماتۆی تەنیا لەبەرخاتری ئەو هاتۆتە ئێرە.قایمقام تەنانەت لەكاتی میوانداریەكەشدا هەردەستووری دەدان.لە ئاهەنگەكەدا رووخۆشی و میهرەبانی ماتۆی ئیلیچ بەشكۆو گەورەییەوە دیاربوو.دڵی هەموانی دەدایەوە بۆهەندێكیان لەناخی دڵەوەو بۆ هەندێكانیش لەڕووی ناچارییەوە.لەگەڵ ژنەكاندا وەكو شەوالییەكان هەڵسووكەوتی دەكرد بەردەوام بەهەمان بزەی جوانی خۆیەوە دەخەنی.لەروو بەرووبوونەوەی لەگەڵ سێ هاوڕێكەدا چەند جارێك دەستی لەپشتی ئاركادی داو بەبرازای خۆشەویستی خۆی ناوی هێنا.بازارۆف كە كۆت وشەرواڵێكی كۆنی لەبەردابوو بەتیلەنیگایەك لێی ڕوانی و بەمیهرەبانییەوە چەند وشەیەكی لەوانە(زۆر زۆر) و(من)ی لەدەم هاتنەدەر.تۆقەی لەگەڵ سیتنیكۆف كرد بەلاّم خێرا رووی وەرگێڕا.لەگەڵ دیتنی خاتوو كوكشینا كە چاكەتێكی سادەی لەبەردابوو دەستكێشێكی چڵكنی لەدەست دابوو پەڕەتاوسێكی لە پرچەكانی دابوو بە سۆزەوە تەوقەی لەگەڵ كردو بەزمانی فەرەنسی گوتی:

- لەدیدارتان خۆشحاڵم.

خەڵكەكە لە ڕادەبەدەر زۆربوون و ژمارەی پیاوانیش لەژنان زیاتربوون.پیاوە مەدەنییەكان لەپەنا دیوارەكان كۆببوونەوە،بەلاّم پیاوە سووپاییەكان و بەتایبەت یەكێك لەوان كەشەش هەفتەی لەپاریس گوزەراندبوو بەشۆق وزەوقەوە سەمای دەكرد.ئەو ئەفسەرەی باسمانكرد لەكاتی سەماكردندا وشەی ناشرینی بەزمانی فەرەنسی دەگوتن بەلاّم لەكاتی قسەكردندا فەرەنسی زۆرخراپ و بەلەهجەی رووسی بەكار دێنا كە ئەوجۆرە قسەكردنە هەر فەرەنسی زانێكی دێناپێكەنین.

ئاركادی كەلەسەما كردندا شارەزاییەكی ئەوتۆی نەبوو بازارۆفیش كە هەرگیز سەمای نەدەكرد لە سووچێك وەستابوون سیتنیكۆفیش هاتەلایان.لەرووخساریدا حاڵەتێكی گاڵتەپێكردن دەبینراو شتگەلی وڕووشێنەرو هەست بیرینداركردنی دەردەبڕی.بەڕووقایمیەوە سەیری هەموولایەكی دەكرد بەلاّم لەناكاو ڕەنگی گۆڕاو بەئاركادی گوت:

- ئادینسۆڤا هات.

ئارکادی ژنێکی بالابەرزی بینی کەجلێکی ڕەشی لەبەردابوو لەنزیك دەرگا ڕاوەستابوو.ڕواڵەت وشکۆی ژنە،ئارکادی سەرسام کرد.دەستە رووتەکانی کە بەولاولایدا شۆڕببوونەوە جوان دەهاتەبەرچاو.کەزیەکانی کەبەسەر شانەرووتەکەیدا هاتبوونەخوار چەند گوڵێکی جوانی پێدا شۆڕکردبوونەوە.چاوەگەشەکانی بەئارامی لەخەڵکەکە بڕیبوون.لەچاوەکانیدا شوێنەواری بیرکردنەوە بەروونی دیاربوو.بەگشتی رووخساری بەوحاڵەتەگوماناویەی کەهەی بوو،لەگەڵ ئەوەشدا هێمنی و ناسکیەکی تایبەتیان لێ دەبینرا.ئارکادی لە سیتنیکۆفی پرسی:

- دەیناسی؟

- بەڵێ،حەزدەکەی پێت بناسێنم؟

- بەڵێ...بەلام دوای سەماکردن.

بازارۆفیش سەیرێکی ئادینسۆڤای کردو پرسی:

- ئەوەیان کێیە؟ هیچ وەك ژنەکانی دیکەناچێ.

دوای تەواوبوونی سەما،سیتنیکۆف ئارکادی بردەلای ئادینسۆڤا بەلام دەرکەوت ئاشنایەتییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوژنەدا نییە،چوونکە لەکاتی قسەکردندا دەمی تەتەڵەی دەکرد.ژنەش بەسەرسوورمانەوە لێیدەڕوانی.لەگەڵ بیستنی ناوی خێزانی ئارکادی،ڕەنگی رووخساری ژنەگۆڕاو بەشەوقەوە لەئارکادی پرسی:

- ئایا تۆ کوڕی نیکۆلای پترۆڤیچی؟

ئارکادی وەلامی دایەوە:

- بەڵێ،وایە.

- دووجار باوکتم بینیووە شتی زۆرباشم دەربارەی ئەوبیستووە.لە ئاشنایەتیتان خۆشحاڵم.

لەوکاتەدا ئەفسەرێك هاتەلایان و ژنەی بۆسەماکردن بانگکرد ژنەش بانگهێشتەکەی قبووڵ کرد.ئارکادی پرسی:

- بۆچما تۆش سەمادەکەی؟

- بەڵێ.ناکا پێتوابێ بۆسەماکردن زۆرپیربم؟

- نا،تەنیا دەمویست شانازی ئەوەمان بدەنێ سەمای مازوورکات لەگەڵ بەم .

ئادینسۆڤا بەمیهرەبانییەوە بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- فەرموو.

سەیرێکی کرد.ئەونیگایە زیاتر وەك ئەونیگایانە دەچوو کە عادەتەن ئەوخوشکانەی شوویانکردووەو سەیری برابچووکەکانیان دەکەن.ئەگەرچی ئادینسۆڤا جیاوازی تەمەنی لەگەڵ ئارکادیدا زۆرنەبوو تازە دەبووە بیست ونۆ ساڵ لەگەڵ ئەوەشدا ئارکادی لەبەرامبەر ئەودا خۆی وەك قوتابییەکی قوتابخانە یان خوێندکارێکی گەنجی زانکۆ هەست پێدەکرد.

ماتۆی ئیلیچ بەرێزو شکۆوە هاتەلای ئادینسۆڤا.ئارکادی بۆماوەیەك دووركەوتەوە بەڵام هیچ کات چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت.تەنانەت کاتی سەماکردنیش پڕبەچاوان سەیری دەکرد.ئادینسۆڤا چ لەگەڵ پیاوە بەتەمەن و دیارەکان وچ لەگەڵ ئەوکەسانەش کە سەمای لەگەڵ دەکردن هەڵسووکەوتی یەکسان وخۆمانەبوون.بە هێمنی سەرێکی بەدەورووبەریدا گێڕاو دووجار بەئارامی پێکەنی.لووتی وەك لووتی زۆربەی رووسەکان پان بوو،لەناو پێستی رووخساریدا وردەگنج دەبینرا بەڵام ئارکادی پێیوابوو کە تائێستا ئافرەتێکی واجوانی نەدیوە.هێشتا ئاوازی دەنگی ئەوی لە گوێیدا دەزرنگایەوەو هەتا گنجی جلکەکانی ئەوی جوانتر لەگنجی جلوبەرگی ژنانی دیکە دەدیت.لەبنەڕەتدا تەواوی جووڵەی ئەو بۆئارکادی جوان و دڵگیربوون و بەشێوەیەکی سەیرو دوور لەهیچ لەخۆکردنێك دەردەکەوت.

لەکاتی مازووركادا کاتێك ئارکادی لای ژنە ترسێکی زۆری ڕێنیشت.تەواوی ئەوقسانەی کەپێشتر بۆ هەمان دەم ئامادەی کردبوون لەبیری چوونەوە.بەڵام ئەوترس ولەرزە هێندەی نەکێشاو هێمنی ئافرەتەکە ئەویشی گرتەوەو بەئاسوودەیی دەستی کرد بەقسەکردن.باسی زۆرشتی لەگەڵ ئادینسۆڤا کرد.باسی باوکی،مامی،ژیان لە پترۆسبۆرگ ولەگوند.ژنەش بەڕێزەوە گوێی لەقسەکانی ڕادەگرت و باوەشێنەکەی دەکردەوەو دایدەخستەوە.هەرجارێك یەکێك داوای سەمای لە ئادینسۆڤا دەکرد زنجیرەی قسەکانی ئارکادی بۆ ماوەیەك دەوەستاو دوای ماوەیەك درێژەی بەقسەکانی دەدایەوە.لەو ماوەیەدا دووجار سیتنیکۆف داوای سەمای لێکرد.دوای تەواوبوونی هەرسەمایەك ئادینسۆڤا بێ ئەوەی هەست بەماندوویەتی بکات دەگەڕایەوە شوێنی خۆی و باوەشێنەکەی ڕادەوەشاند.تەنانەت هەناسەکانیشی ئاسایی بوون.ئارکادی دووبارە وەقسە هاتەوە.ئەو لەوەی کەلەپەنا ئادینسۆڤا دابنیشێ و قسەی لەگەڵدابکاو سەیری چاوەجوانەکانی بکا لەڕادەبەدەر چێژی وەردەگرت.

ئەگەرچی ئادینسۆڤا زۆرکەم قسەی دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا دیاربوو کەژنێکی کامڵە ئارکادی لە هەڵسەنگاندنی ئەورستەیە بۆی دەرکەوت کە ساردو گەرمی زۆری ڕۆژگاری چێشتووە.ئادینسۆڤا پرسی:

- کاتێك سیتنیکۆف تۆی هێنایە لای من،کێ بوولەلات بوو.

ئارکادی وەلآمی دایەوە:

- بۆچما تۆش ئەوت دیت؟رووخسارێکی جوانی هەیە،وانییە؟ ئەوە بازارۆفە،یەکێك لە هاوڕێکانمە.

تاریفی لایەنەباشەکانی هاوڕێکەی کرد.هێندەی باسی بازارۆف کرد تا ئادینسۆڤا ئاوڕێکی دایەوەو سەیرێکی بازارۆفی کرد.دووبارە کاتی جیابوونەوەهات.ئارکادی هەرگیز حەزی نەدەکرد لەلای ئەوژنە دوورکەوێتەوە.چەند کاتژمێرێکی خۆشی لەگەڵ بردبووەسەر.لە تەواوی ئەوماوەیەدا لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە کە ئادینسۆڤا بەقبوولکردنی لەلای خۆی گەورەییەکی زۆری لە بەرامبەردا نواندووە.دوای تەواوبوونی مۆسیقاو کۆتایی سەما،ئادینسۆڤا گوتی:

- وەرە سەردانم و هاوڕێ گەنجەکەشت بێنە.بەڕای من دیدار لەگەڵ کەسێکدا کە بوێری ئەوەی هەبێ بڕوای بەهیچ شتێك نەبێ زۆرگرنگە.

قایمقام لێیان نزیك بۆوەو بە ئادینسۆڤای گوت:

- نانی ئێواە ئامادەیە.

دەستی گرت ولەگەڵ خۆی برد.ئادینسۆڤا کە دوور دەکەوتەوە ئاوڕێکی دایەوەو بۆ دواجار بزەیەکی هاتێ.ئارکادی ئیکلامێکی کێشاو تێەوە ڕاما.(چەندە لەش ولاری ئادینسۆڤا لەژێر ئەوجلکە ڕەشانەوە جوانن) لەبەر خۆیەوە گوتی:

- هەرلە ئێستاوە ئەوژنە هەست وهۆشی لێ بڕیوم.

لەدڵی خۆیدا هەستی کرد کە تاچ ڕادەیەك سووك وبچووکە.لە سووچێکی ساڵۆنەکە،ئارکادی گەیشتەلای بازارۆف.بازارۆف پرسی:

- کەیفت کرد ؟چەندساتێ بەرلە ئێستا کابرایەك پێیگوتم ئەوژنە بەلآیەکە بۆخۆی.تۆدەڵێی چی؟ بەڕاستی بەلآیە؟

ئارکادی وەلآمی دایەوە:

- لە مەبەستت تێناگەم.

- سەیرە،چەندەمندالّی!

- بەلّیّ،ئەوکەسەی ئەوقسەیەی بە تۆ گوتووە لــە مەبەســتەکەی حــالّی نابم.بــەلاّم ئــەوەی دەزانم کە ئادینسۆڤا ژنێکی زۆرباشەو هەلّسووکەوتی هێمن و لەسەرخۆیەو...

بازارۆف چووە ناوقسەکانییەوەو گوتی:

- بۆمەگــەر نەتبیســتووە (ئاوێــك کــە ئــارام ئــارام دەڕوا باشــتر دەچــێتە قــولاّیی زەویەوە)...تۆدەلّێی لەسەرخۆیە.ناسکیەکەی هەر ئەوەیە.ئەریّ تۆحەزت لە بەستەنی نییە؟

ئارکادی لەبن لێوانەوە پرتەیەکی کرد:

- ڕەنگــە هــەقی تــۆبیّ.من نــاتوانم لــەو بارەیــەوە هــیچ بلّێم.بــەلاّم داوای لێکــردم تــۆی پێبناسێنم.

بازارۆف بەگالّتە پێکردنەوە گوتی:

- دەزانم لای ئەو تاچ ڕادەیەك تاریفی منت کردووە.بەلاّم کارێکی باشت کردووە.بمبــەلای. هەرچی دەیەویّ باوابیّ،مانگایەکی شــیردەر یــان ژنێکــی پێشــکەوتووی وەك کوکشــینا،بەلاّم بەهەرحالّ شان و قۆلّی جوانن کەمن کەمتر دیتوومن.

ئارکــادی لــە رووهــەلّمالاّوی بــازارۆف تووڕەبــوو بــەلاّم ئەوتووڕەییــەی لەسەرشــتێکی دیکەبوو.ئارکادی بەئارامی لەبازارۆفی پرسی:

- تۆ بۆچی ئازادی بیرکردنەوەی ژنانت قبولّ نییە؟

- چوونکە ئەزموون نیشانیداوە تەنیا ئــەو ژنانــە دەتــوانن بــیری ئازادیــان هــەبیّ کەلــە نیعمەتی جوانی بیّ بەش بن.

باسەکە لێرەدا کۆتایی پێهات دووهاوڕیّ دوای نانخواردن کۆڕەکەیان بەجیّ هێشت.کوکشینا تووڕەو ڕق هەستاو لەپشت سەریانەوە پێکەنی بەلاّم هیچیان گرنگیــان پێنــەداو بەوکارەشــیان هەستی لەخۆبایی بوونەکەیان برینداركرد.کوکشینا زیاتر لەئامادەبوان لە کۆڕەکەدا مایەوەو تا کاتژمێر سێی نیوەشەو لەگەلّ سیتنیکۆف سەمای کرد.سەرەنجام کۆڕی میوانی جەنابی قایمقــام بەودیمەنە سەرنجڕاکێشەوە کۆتایی هات.

## (١٥)

ڕۆژی دواتر،کاتێك ئارکادی و بازارۆف لەپلیکانەی ئەو میوانخانەیەی کە ئادینسۆڤا تێیدا دەژیا سەرکەوتن،بازارۆف گوتی:

- دەمەوێ بزانم ئەوژنە لەکام دەستەی مەمکدارەکانە.دڵم ناڵێ ئێرە هەمووشتێکی باش وڕێکو پێك بێ.

ئارکادی بەپەرێشانیەوە گوتی:

- من سەرسامم لەڕەفتارەکانی تۆ.زەمانێك خۆت لە تەنگژەی بنەماکانی ئەخلاقی دوایی و...

بازارۆف بەخوێنساردییەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- تۆش بنیادەمێکی سەیری.بۆ چما نازانی کە لەڕوانگەی ئێمەوە مرۆڤە باشەکان خراپن ومرۆڤە خراپەکانیش باشن.بۆ هەرئەمرۆ نەتگوت مێردی بەپیاوێکی دەوڵەمەندکردووەو ئەوکارەش بەڕای تۆ سەیرە.لەکاتێکدا ئەگەر ڕای منت دەوێ ئەوکارە هەرگیز خراپ نییەو کارێکی ژیرانەیە.من یەکەبارێ خۆم گوێم لەقسەو قسەڵۆکی خەڵکی ئەوشارەنییە.بەڵام پێشم وانییە کە هەموو ئەوقسانە بێ بنەمابن.

ئارکادی وەڵامی نەدایەوە.لەدەرگای ژوورێکی دا.خزمەتکارێك کە جلکێکی ڕەسمی لەبەردابوو دووهاوڕێکەی بۆ ژوورێکی گەورە ڕێنوێنی کرد.لەگەڵ ئەوەی چەند دەستەگوڵێك لەدەورو بەری ژوورەکە دەبینران بەڵام ئەو ژوورەش وەك هەموو ژوورەکانی رووسیا خراپ ڕێکخرابوون.

دوای ماوەیەکی کەم ئادینسۆڤا بە جلکێکی سادەی بەیانی هاتەژوورێ.لە ژێرتیشکی خۆردا لەشەوی ڕابردوو جوانتر دەهاتەبەرچاو.ئارکادی،بازارۆفی پێناساند.ئادینسۆڤا لە دەستەپاچەیی بازارۆف سەری سوورما.ئادینسۆڤا وەك شەوی ڕابردوو هێمنی خۆی کۆنترۆڵ کردبوو.بازارۆفیش لە نیگەرانی و دەستەوستانی خۆی سەرسام بوو.لەبەرخۆیەوە گوتی:

- تۆش بۆیەکەم جار لەژنێك ترسای!

پاشــان وەك ســیتنیکۆف خــۆی هەڵدایــە سەرکورســییەك و زیــاد لەپێویســت هەســتی بەخۆمانەبوون دەکرد.ئادینسۆڤا بۆچرکەیەك چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت.

ئانا سرگیۆنا ئادینسۆڤا کچی سێرگی نیکۆلاێۆڤیچ لۆکنێف بوو.بـاوکی لـەقومار زانـی و سەربەگێچەڵی ناوبانگێکی زۆری هەبوو کە دوای پارە بەفیڕۆدان و عەیش و نۆشـێکی زۆر لـە مۆسکۆو پترۆسبۆرگ سەرەنجام کەوتەسەرساجی عەلی و ناچاربوو بێتەوە گوندو دابنیشێ.بەلاّم لەدێ هێندە خۆی ڕانەگرت و پاش ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کردو میراتێکی زۆرکـەمی بـۆ دووکچەکەی ئانای بیست ساڵەو کاترینی دوازدەساڵە بەجێهێشت.دایکی دووکچەکە یەکێك لە شازادە دەست کورتەکان بوو کە لەوسالاّنەی مێردەکـەی لەوپـەڕی دەوڵەمەنـدی دابوو،کۆچـی دوایی کردبـوو.دوای مردنـی بـاوکی ژیـانێکی ناخۆشـی دەگوزەراند.ئـەو کـەوەك خانـەدانان پـــەروەردەببوو نەیـــدەتوانی چەرمەســـەریەکانی ژیـــان لەگونـــدو کێشـــەی زەوی وزار تەحەموولبکا.لەدەورووبەری خۆی ئاشنایەکی نەبوو،لەگەڵ کەسیش هاموشۆی نەبوو چوونکە باوکی تێکەلاّوی لەگەڵ دراوسێکانی لـێ قەدەغەکردبوو،ئـەوانی بەسـووك وچـرووك لەقەڵـەم دەدان.دراوسێکانیش لەلای خۆیانەوە سووکایەتیان بەوان دەکرد.هەربۆیە ئانا دەستەپاچە نەبوو دەست بەجێ پوورەکەی خـاتوو ئاڤـدیۆتا سـتیپانۆ،کە پیرەژنێکـی خوێنتـاڵ بـوو هێنایـەلای خۆی.ئەویش هەرکـە گەیشـت باشـترین ژووری بۆخـۆی تـەرخانکردو لـە بەیانیـەوە تاشـەوێ پرتەوبۆڵەی بوو.هەتا ئامادەنـەبوو بـۆ گـەڕانیش بەناوباخەکـەدا بـەبێ خزمەتکارەکـەی کـە نۆکەرێکی تووڕەوتۆسن و خوێنتاڵ بوو لـەماڵ بچـێتەدەر،جلێکی کـۆنی لەبـەردەکردو کـلاّوە سێگۆشەکەشی لەسەردەنا.ئانا لەگەڵ هەمـوو خوو ئاکارەخراپەکانیدا هـەڵیکردو هەوڵیـداخۆی تەرخان بکا بۆ پەروەردەکردنی خوشکە بچووکەکەی.بڕیاریدابوو بۆ هەمیشە لەگوند بمێنێتـەوە کە لەناکاو دۆخەکە گۆڕا.

پیاوێکی چل وپێنج ساڵە،دەوڵەمەند،ڕەزاگران،خەمگین و بەدڵ بەڕێکەوت چاوی پێکـەوت وعاشقی بوو،داوای لێکرد زەماوەندی لەکەڵ بکات.ئانا زوو شـووی پێکرد.بـەلاّم دوای شـەش ساڵ مێردەکەی مردوو تەواوی سەروەت وسامانی بۆ هاوسەرەکەی بەجێهێشت.تا ساڵێك دوای مردنی مێردەکەی،ئانا لەگوندەکەی مایەوە.بـەلاّم دوای ئـەوە چـووەدەرەوەو ماوەیـەکی کـەم لەگەڵ خوشکەکەی لە ئەڵمانیا مایەوە.بەلاّم لەوێ هەسـتی بەدڵتـەنگی دەکـردو بۆزەویەکـەی یانی نیکلسکۆی گەڕایەوە کە لە چل کیلـۆ مـەتری شـاربوو...لەوێ باڵەخانەیـەکی زۆرجـوان

وخاوێن و باخێك كە گوڵخانەی زۆری تێدابوون هی ئەوبوون.ئادینسۆڤا بۆ ئارامی و ئاسوودەیی خۆی هیچی لەبیر نەكردبوو.ئانا زۆر كـەم دەهاتـە شـارو زۆر نەدەمایەوە.بۆچـی،خەڵكی شـار لەپاشەملە ئەومێردەی كە كردبووی قسەی زۆریان دەكرد.قسەوباسی زۆریان لـەبارەوە دەكـردو دەیانگوت ئەویش لە قۆڵبڕینەكانی باوكیدا بەشداربووەو هەربۆیەش بووە چۆتە دەرەوە تا پـێش بەهەندیێ ڕووداوی نەخوازراو بگرێ.لە پاشەملە دەیانگوت:

- ئەو دەزانێ كوێ نیسكان دێنێ.

قسەخۆشێكیش بە هێماوە دەیگوت:

- لە زۆر ئاوانی داوە؟

هەمووئەو قسانە بەگوێی ئادینسۆڤا دەگەیشتنەوە بـەلاّم ئـەو بەهەنـدی نـەدەگرتن.ئازاو بەئیرادەبوو.ئادینسۆڤا لەسەر كورسیەك دانیشت.دەستی لەسەردەستی داناو گوێی لە قسەكانی بازارۆف ڕاگرت.بازارۆف بە پێچەوانەی هەمیشە سەرگەرمی چەنەلێدان بوو.لەو نێوەدا شـتێك كـە ئاركـادی سەرسـام كردبـوو ئـەوەبوو كـە بـازارۆف دەیویسـت گوێگرەكـەی سـەرگەرم بكا.نەیدەتوانی تێبگـا كـە ئایـا هاوڕێكـەی بەمەبەسـتی خۆیگەیشـتووە یـان نا.لەلایـەكی دیكەشەوە،ئەندێشەو هەستی ئاناش نەدەتوانرا لەقیافەیدا بخوێنرێتەوە.ڕووخساری لەو كاتـەدا هەم جوان و میهرەبان و هەم جـدی ومكوڕبوو،چـاوەجوانەكانی دەدرەوشـانەوە بـەلاّم تیشـكی شادی تێدا نەدەبینرا.سەرەتا هەڵسووكەوتی بازارۆف لـەبیری ئانـادا ئاسـەوارێكی ناسـازگاری بەجێهێشت.بەلاّم هەركە لەشەرمی بازارۆف تێگەیشت خۆشی ویسـت.ئانا تـەنیا نەیـدەتوانی شتێك تەحەمووڵ بكا ئەویش هەستی بچوكی و بەكـەم نـەزانین بـوو كـە ئەوهەسـتە هـەرگیز لەبازارۆفدا بوونی نەبوو.

ئاركادی لەوڕۆژەدا هیچ كات نەیتوانی لەسەرسام بوون بێتـەدەرەوە.بیری كـردەوە بـازارۆف لەگەڵ ئادینسۆڤاشـدا بەهـەمان شـێوەی كـە لەگـەڵ تێكـڕای ژنـە پێشـكەوتووەكان قسـەی دەكرد،هـەروا قسـەدەكا.یانی ئـەو بـیرو ئەندێشـانەی خـۆی بـۆ بەرامبەرەكـەی ڕوون دەكردەوە.بەتایبەتیش كە ئادینسۆڤا داوایكردبوو لەگەڵ كەسێك ئاشنابێ كـە هـەموو شـتێك ڕەتدەكاتەوەو بڕوای بەهیچ شتێك نییە.

بەلاّم بە پێچەوانە بازارۆف باسەكەی بۆ پزیشكی و گیاناسی كێشـا.لێرەدا دەركـەوت كـە ئادینسۆڤاش بێ ئیشی خۆی بەهەدەرنەداوەو كتێبی باشی خوێندوونەوە.ئەو ڕایەڵی باسـەكەی

بــۆلای مۆســیقا وەرچــەرخاند بــەلاّم کاتێــك تێگەیشــت بــازارۆف هــیچ هۆگریــەکی بــۆ هونەرنییە،لەگەڵ ئەوەی ئارکادی لەبەهای مۆسیقی فۆلکلۆری قسەی دەکرد،بابەتی قسەکانیان دووبارە بەرەولای سروشت وەرگێڕا.

ڕەفتــاری ئادینســۆڤا لەگــەڵ ئارکادی،ڕەفتــاری خوشــکی گــەورە لەگــەڵ بــرای بچــووك بوو.دەرکەوت کە لەودا تەنیا گەنجی و میهرەبانی ســەرنجی ڕاکێشــاوەو هیچــی دی.دوای ســێ کاتژمێر گفتوگۆ دەربارەی بابەت گەلی جۆراوجۆر،ســەرەنجام دووهــاوڕێ هەســاتان و ویســتیان بڕۆن.ئانا بەمەبەستی ماڵئاوایی کردن دەستی بەرەولای ئــەوان درێژکرد،بەســەرنجێکی بەســۆزو پاش ڕاوێژێکی دڕدۆنگانە گوتی:

- بەڕێزان ئەگەر لەلای من ماندوو بێزارنەبن،بانگهێشتان دەکەم بێنەنیکلسکۆی.

ئارکادی بەخۆشحاڵیەوە گوتی:

- ئێمەزۆر خۆشحاڵین کە...

- ئەدی تۆ بازارۆف؟ مسیۆ بازارۆف.

بازارۆف لەجیاتی وەلاّم ئیکلامێکی کێشــا.ئارکادی دووبــارە ســەری سووڕما.رووخســاری هاوڕێکەی سوور هەڵگەڕابوو.کاتێك گەیشتنە شەقامەکە ئارکادی پرسی:

- تۆ هێشتاش لەسەرهەمان بڕوای پێشووتی بەرامبەر بەئەو؟

- نازانم.ناسینی ئەو کارێکی ئاسان نییە.

دوای بێدەنگییەکی کەم،بازارۆف گوتی:

- شازادەخانمی ملّکدار...ئەو تەنیا بەکەڵکی ئەوەدێت جلوبەرگی ئاودامان لەبەربکاو تاج لەسەرنێ.

ئارکادی بەناڕەزاییەوە گوتی:

- شازادەخاتوونەکانی ئێمە ،رووسی ئاوا بەڕەوانی نازانن.

- ژنێکی کامڵە.نان ونمەکی رووسەکانی حەرام نەکردووە.

- لەگەڵ ئەوەشدا ژنێکی جوانە.

- بەڵێ،لەش ولارێکی گۆشــتن وجــوانی هەیــە.مرۆڤ حــەزدەکا هەرئێســتا بیباتــە هــۆڵی توێکاری.

- یۆگینی توخوا وازبێنە.هەمووشتێك سنووری خۆی هەیە.

- زۆرباشە،هێندەزوو هەڵمەچوو.مەبەستم ئەوەبوو کەشتێکی وایە بخورێ...واباشە دووبارە سەری لێبدەینەوە.

- چ کاتێك؟

- دووسـبەی چـۆنە؟ئێمە هـیچ کارێکمـان نییـە جگـە لەسـەردانی دۆسـت وئاشـنایان و کەللەزلەکان و شامپانیا خواردنەوە لەگەڵ کوکشینا.هەر دووسـبەی وەرێدەکەوین.جگەلـەوەش زەوی باوکیشم هێندە لەوێ دوورنییە.نیکلسکۆی دەبێ لەسەر رێیەبێ؟

- بەڵێ،نیکلسکۆی لەسەر رێگای زەویەکانی باوکتدایە.

- کەوایە تەواوە.تەنیا شێتەکان و ئاقڵەکانن کە لەکارەکانیاندا دوادەکەون...لەگەڵ ئەوشدا دووبارە دەڵێم لەش ولارێکی جوانی هەیە.

دوای سێ رۆژان،دووهاورێ بەرەو نیکلیسکۆی وەرێکەوتن.هەوا هەتاوی بوو بەلام زۆرگـەرم نەبوو.ئەسپەتێرەکان گالسکەکەیان تاودەدا.ئارکادی بێ ئـەوەی بزانـێ بۆچی،سـەیری جـادەی دەکردوو پێدەکەنی.بازارۆف لەپرێکدا هاواری کرد:

- واباشـە پیرۆزبـاییم لێبکـەی چـوونکە ئـەمرۆ بیسـت و دووی حوزەیرانـە یـانی رۆژی ناولێنانمە.ئەمرۆ چ تاجێکم لەسەردەنێن؟!

پاشان دەنگی خۆی نزم کردەوەو گوتی:

- ئەمرۆ لەماڵێ هەموان چاوەروانم دەکەن...با چاوەروانبن.هێندە گرنگ نییە.

## (١٦)

شوێنی نیشتەجێبوونی سرگیۆنا لە سەرەو ژێری تەپۆلکەیەك هەڵکەوتبوو کە دەورووبەرەکەی تەقریبەن ئاوالأبوو.لەنزیك ماڵە کەشییەوە کلیسایەکی لێبوو کە لەبەردی زەرد دروستکرابوو،سەرەکەی سەوزو بە ئەستوونی سپی نەخشێنرابوو.لە سەرووی دەرگای چوونەژوورە وێنەی هەستانەوەی مەسیحی لێ کێشرابوو.لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر هێڵی چەماوەی جەنگاوەرێکی لە سەرزەوی کەوتوو لەو تابلۆیەدا دەبینرا.لە پشت کلیساوە دووگەرەك ماڵی گوندی بوون لەسەربانە حەسیرەکان دووکەڵکێش دەبینران.باڵەخانەکە بە شێوازی ئالکساندرێن دروستکرابوو.خانووەکەش وەك کلیساکە بە بەردی زەرد دروستکرابوو سەربانەکەشی ڕەنگی سەوزو ئەستووندەکانیش سپی و ڕازابوونەوە.ئەندازیاری ئەومەڵبەندە،هەردوو باڵەخانەکەی لە سەرداوای ئادینسۆڤای کۆچکردوو دروستکردبوو،کەرقی لە شێوازی تازەبوو.کۆنەباخێك کە بەداری بێ زۆر لە دوولاوە گەمارۆدرابوو،بەناو سنەوبەرەکاندا ڕێگایەك بۆ خانووەکە کرابۆوە.

لەبەر دەرگا،دووخزمەتکار بەجلی ڕەسمییەوە هاتنەپێشوازی دووهاوڕێ گەنجەکە.یەکێك لەوان دەست بەجێ ڕۆیشت بەدوای سەرکاردا.دوای کەمێك سەرکار بەجلکێکی ڕەشەوە دەرکەوت و میوانەکانی بەسەر ئەوپلیکانانەدا برد کە فەرشیان لەسەر ڕاخرابوو چوونەسەرێ،پاشان ئەو ژوورە تایبەتەی کەپێشتر بۆ میوانەکان ئامادەکرابوو ڕێنوێنی کردن، کە دووقەرەوێڵەو کەلوپەلی پێویستی تێدابوو .دیاربوو لەو ماڵەدا ڕێکوپێکی و خاوێنی تێدا بەرقەرارە.هەرشتێکی ژوورەکە بۆنێکی خۆشی لێدەهات کە تایبەتی ژووری پێشوازی وەزارەت خانەکان بوو.

سەرکار گوتی:

- ئانا سرگیۆنا داوای لێکردم بەجەنابتان ڕابگەیەنم کە دوای نیوکاتژمێر دێتەلاتان.ئایا خزمەتێکی دیکەتان نییە؟

بازارۆف وەلأمی دایەوە:

- نەخێرکاکە.هیچ کارێکمان نییە...تەنیا کەمێك عەرەقمان دەوێت.

سەرکار بەسەرسامییەوە گوتی:

- فەرمان دەکەن قوربان.

بەخشەخشی پێلاوەکانییەوە دوورکەوتەوە.بازارۆف بەگاڵتەکردنەوە رووی لە ئارکادی کردو گوتی:

- عەجیب شکۆو گەورەییەك...پێموایە بەقسەی تۆبێ دەبێ هەمان دەستەواژە بەکاربێنم.بەڕاستی شازادەخانمێکی تەواوە.

ئارکادی بەناڕەزاییەوە گوتی:

- بەڵێ شازادەخانمێکی گەورەیە کە بۆیەکەمجار دوو کەسایەتی پایەبەرزی وەك ئێمەی بۆ ماڵەکەی بانگهێشت کردووە.

- بەڵێ،بەتایبەتیش من کە کوڕی دکتۆرێك و نەوەی قەشەیەکم ڕێك وەك (ئیسپرانسکی)...

دوای کەمێك بێدەنگی،بازارۆف لێوەکانی بەنیشانەی بەهەند نەگرتن خوارکردەوەو گوتی:

- دەتزانی نەوەی قەشەیەکم،وانییە؟...باواز لەوانەبێنین خاتوو ئادینسۆڤا ژنێکی بەخۆژیوە.ڕەنگە باشترین کار ئەوەبێ جلکەڕەسمیەکانمان بپۆشین و بچینەلای.

ئارکادی تەنیا شانی هەڵتەکاند...ئەویش تووڕە دەهاتە بەرچاو.

دوای نیوکاتژمێر ئارکادی و بازارۆف چوونە ژووری پێشوازی.ژوورێکی گەورەو شاهانە کە دەتگوت بۆ ڕازاندنەوەی سەلیقەیەکی ئەو تۆی تێدا بەکار نەهاتووە.کەناری دیوارەکان بەڕەنگی قاوەیی و،قەنەفەی قورس و گرانبەها بەشێوەیەکی ئاسایی ڕێکخرابوون.مەرحومی ئادینسۆڤا ئەو کاغەزانەی لەلای هاوڕێیەکی خۆی کە دەلاڵی شەراب بوو لە مۆسکۆوە هێنابوونی.لەپشت کورسییەك،وێنەی پیاوێکی قژبۆر هەڵواسرابوو کە دەتگوت بەچاوێکی دوژمنکارانە لەمیوانەکان دەڕوانێ.بازارۆف بەگوێی ئارکادیدا چپاند:

- پێدەچێ خۆی بێت.

لەکاتێکدا ناوچەوانی گرژدەکرد درێژەی دایە.

- چۆنە ڕاکەین؟

بەڵام لەو کاتەدا خاوەن ماڵ هاتەژوور.جلکێکی سپی تەنکی لەبەردابوو قژەلووسەکەی لەپشت گوێی خڕکردبوونەوە رووخساری بەحاڵەتێکی پاك و کیژانە دەرخستبوو.

- لەوەی بانگهێشتەکەی منتان قبووڵ کردووە زۆرخۆشحاڵم.ئێوە پێویستە ماوەیەك لێرە وەمێنن.ئێرەش جێگایەکی هێندە ناخۆش نییە...لەگەڵ خوشکەکەشم پێکتان دەناسێنم.زۆرباش پیانۆ لێدەدا.ئەگەرچی بەرێز بازارۆف تۆ هێندە گرنگی بەهونەرنادەی بەڵام دەڵێی مسیۆ کیرسانۆف حەزی لەمۆسیقابێ.جیا لەخوشکم پووریشم لەگەڵمان دەژیت.ناوەناوەش یەکێك لە هاوسێکان دیێتەسەردانمان و بەیەکەوە یاری وەرەقە دەکەین.ئەوە هەموو کۆبوونەوەی ئێمەیە.بۆ دانانیشن؟

دەتگوت ئادینسۆڤا ئەو وتارە کورتەی پێشتر لەبەرکردووە.پاشان گەڕایەوە لای ئارکادی و چەند قسەیەکی لەگەڵ کرد.گۆیا دایکیان یەکتریان دەناسی و کاتێك دایکی ئارکادی عاشقی نیکۆلای پترۆڤیچ بووە تەواوی ڕازەکانی بەدایکی ئانا گوتووە.ئارکادی بەگەرمی دەربارەی دایکی دەستی بەقسەکردن کرد،بازارۆفیش بە تەماشاکردنی ئەلبوومەکان خۆی خەریککردبوو لەو کاتەدا لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- من چەندە گوێ لەمست بووم!

بەدوای تاژیەکی جوان کە قەلادەیەکی لەملدابوو کچێکی هەژدەساڵەی پرچ ڕەش،زەردباو بەڵام دڵگیرو چاوڕەش هاتەژووری پێشوازی.کیژە بەرچنەیەکی پڕلەگوڵی بەدەستەوەبوو.ئادینسۆڤا لە کاتێکدا بەئاماژەی سەر ئەوی نیشاندەدا گوتی:

- ئەوەش کاتیای خوشکم.

کاتیا بەخاکە ڕاییەوە لەپەنا خوشکەکەی ڕاوەستاو سەرگەرمی جیاکردنەوەی گوڵەکان بوو.تاژیەکە کەناوی (فی فی) یان لێنابوو بەنۆرە لەمیوانەکان نزیك کەوتەوەو لمۆزی بەدەستیاندا هێنا.ئادینسۆڤا لەکاتیای پرسی:

- ئەو گوڵانە هەموو بۆخۆت چنیوتن؟

- بەڵێ.

- پوورم بۆچایخواردنەوە دێتە ئێرە؟

- بەڵێ،هەرئێستا دێت.

لەکاتی قسەکردندا،لێوەکانی کاتیا بزەیەکی دڵگیریان لەسەربوو.نیگایەکی ساردی هەبوو دەتگوت بەبێ موبالاتی لە هەمووشتێك دەڕوانێ.تەواوی وجودی هەر لەدەنگی و گەندەمووەکانی ژێرچەناگەی و ئەو پەڵە سپیانەی لە لەپی دەستەسوورباوە کانیدابوون تازەو توورت خۆیان دەنواند.تەنانەت شانەکانیشی هەمان حاڵەتیان هەبوو کەمێك تێك تەپیو دەهاتنە بەرچاو.سەرەڕای ئەوانەش کاتی قسەکردن ڕەنگی ڕووخساری سوورهەڵدەگەڕاو هەناسەی سواردەبوو.

ئادینسۆڤا ڕووی لەبازارۆف کردو گوتی:

- یۆگینی ڤاسلیۆڤیچ تۆ لەبەر شەرم و شکۆت، خۆت بەسەیرکردنی ئەو وێنانەوە خەریککردووە لەکاتێکدا ئەوکارە ناتوانێ سەرگەرمت بکا.کەمێك نزیکتربەوە تا بتوانین دەربارەی بابەتێك قسەبکەین.

بازارۆف لە تەنیشتی دانیشت و پرسی:

- لەبارەی چ بابەتێك پێتخۆشە قسەبکەین؟

- هەرچی بێ گرنگ نییە بەڵام پێشتر بائەوەت پێبڵێم من لە گفتوگۆکردندا دژیارێکی سەرسەختم.

- تۆ؟

- بەڵێ،من.دەڵێی لەوقسەیەم سەرسام بووی.دەکرێ هۆکارەکەی بپرسم؟

- ئەگەر ڕای منت بوێ.دەڵێم بەبڕوای من تۆژنێکی هێدی و لەسەرخۆی لە کاتێکدا بۆ بگرەوبەردەی گفتوگۆکردن حەزوگوڕووتین پێویستە.

- چۆن توانیوتە وازوو بمناسی؟ دەتوانی لە کاتیا بپرسی کە تاچ ڕادەیەك کەللەڕەق و بێ سەبرم دەتوانی لێشی بپرسی کە چەندەزوو هەڵدەچم.

بازارۆف سەیرێکی ئانای کردوو گوتی:

- ڕەنگە تۆ باشتر بزانی...کەوایە دەتەوێ گفتوگۆ بکەین...کاتێك تەماشای ئەلبوومەکەتم دەکرد مەنزەرەگەلێکی جۆراوجۆری کوێستانەکانی سویسرام دیتن و تۆش گوتت کە ئەوکارە ناتوانێ سەرگەرمت بکا چونکە هۆگیریم بۆهونەرنییە.بەڵێ،هیچ حەزێکم لەهونەرنییە بەڵام سەیرکردنی ئەو دیمەنانە لەدیدگای زەوی ناسییەوەو بۆنموونە شێوەی باڵەخانە کوێستانییەکان بەلامەوە سەرنجڕاکێش بوون.

- دەمبووری بەلاّم پێموایە بۆزانینی زەوی ناسی لەجیاتی سەیرکردنی ئەو وێنانە باشتروایە ئەو کتێبانە وەخوێنی کەلەو بوارەدانووسراون.

- بەلاّم ئەو وێنانە دەتوانن بەڕادەی دەلاپەڕە روونکردنەوەت بدەنیٚ.

ئاناسـرگیۆنا ماوەیـەك بێـدەنگ بـوو لەکاتێکـدا خـۆی بەسـەرمێزەکەدا شـۆڕدەکردەوە رووخساری خۆی لە بازارۆف نزیککردەوەو گوتی:

- بانگەشەی ئەوە دەکەی کە هیچ هۆگریەکت بـۆ هونـەر نییـە.پێمبڵێ چـۆندەکریٚ بـەبیٚ زەوقی هونەری،بژی؟

- دەکریٚ بپرسم کە ئەو حەزە دەتوانیٚ چ دەردێك دەرمان بکا؟

- لانیکەم بەکەڵکی ناسینی خەڵك و خوێندنەوەیان دێت.

بازارۆف پێکەنی و گوتی:

- سەرەتا دەڵێم بۆ ئەوکارە ئەزموونی ژیان لە گۆڕێیەو دووەمیش لەرووی جەنابتان بڵـێم کە ئەوکارە ئەوە ناهێنیٚ.تەواوی خەڵك لە ڕوانگەی بـەدەنی و رووحییـەوە وەکویەکن.تـەواوی مێشکەکان،دڵەکان،گەدەکان و ڕیخۆڵەکان وەکو یەکن.لە ڕوانگـەی بنـەماکانی ئەخلاقیشـەوە جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان خەڵکەکاندا نییە.هەڵبەتە جیاوازیـە لاوەکیـەکان بـاس ناکـەین و وەلایان دەنێین.بۆ دەرخستنی ڕاوبۆچوون لە بارەی مرۆڤەکانەوە لێکۆڵینـەوە لەسـەریەك کـەس بەسە.مرۆڤەکانیش لێکچووی زۆریان وەکو ڕوەکە کانەو هیچ گیاناسێك یەك بەیەك لە گیاکان ناکۆڵێتەوە.

کاتیا کەخەریکی جیاکردنەوەی گوڵەکان بوو سـەری بـەرزکردەوەو نیگـا سەرسـامییەکەی خۆی لە بازارۆفەوە بڕی و کاتێك سەرنجەکەی بـەنیگا سـاردو بێموبالاتەکـەی ئـەو تـێککگیران سەرتاپا سوور هەڵگەڕا.

ئانا سرگیۆنا سەرێکی ڕاوەشاندو گوتی:

- گیاکان و مرۆڤەکان...بەوپێودانگەبیٚ هیچ جیاوازییەك لە نێوان مرۆڤی ئاقڵ و گێـل و یان لە نێوان بنیادەمی زۆردارو زۆرلێکراودا نییە.

- بۆچی،ئەوانە لێك جیان...هەمان جیاوازی کە لـە نێـوان مرۆڤێکـی سـاغ و مرۆڤێکـی نەخۆشدا هەیە.ڕیخۆڵەکانی سیلدارێك لەگەڵ ڕیخۆڵەکانی من و تۆدا جیاوازن ئەگەرچی شـێوەی پێکهاتەکانیان لە بنەڕەتدا هیچ جیاوازیەکیان نییە.ئێمە تا ڕادەیەك لە نەخۆشییە جسمییەکان

ئاگادارین  بەلاّم نەخۆشییەکان بەهۆکاری پەروەردەی هەلّەوە دەردەکەون.بـەهۆی هـەمان ئـەو گالّتەجارِیەی کە لە دەورانی منداڵی دەیانخەنە مێشکمانەوە،بە هۆکاری بـارووده‌ۆخی ناشـرینی کۆمەلاّیەتی...بەکورتی دەبێ کۆمەڵگا درووست بکەی تا دەردەکان بۆخۆیان لەناوبچن.

لـەکاتی گـوتنی ئـەو وشانەدا،رووخسـاری بـازارۆف حالّـەتێکی وای دەنوانـد کـەدەڵێ: (حەزدەکەی باوەڕ بەقسەکانم بکە،حەزدەکەی باوەڕمەکە).پەنجە درێـژەکانی بـەناو ڕیشـەکەیدا دێناو چاوەکانی بەولاولادا دەگێڕان.

- کەوایە بەچاکسازی کۆمەڵگا،ئیترمرۆڤی گێل یان زالّم نامێنن.

- لە کۆمەڵگایەکدا کە بنەمایەکی درووستی هەبێ دیارە جیاوازی باش و خراپ،نـەزان و زاناو...بوونی نییە.

- بەڵێ،هەموو مرۆڤەکان خاوەنی یەك سپلّن.

- بەڵێ خاتوون،وایە.

ئادینسۆڤا گەڕایەوە لای ئارکادی و پرسی:

- ئارکادی نیکۆلاّی پترۆڤیچ،ڕای تۆچییە؟

- من لەگەڵ یۆگینی هاوڕام.

کاتیا لەبنەوە سەیرێکی ئارکادی کرد.

ئادینسۆڤا گوتی:

- بەڕێزان ئێوە دووچاری سەرسامیم دەکەن...زۆر لە قسەکانی ئێوە تێناگەم بەلاّم  دووبارە قسەدەکەین.ئێستاش پوورم دەلّێی بۆچایخواردنەوە دێتەلامان.ئێمەنابێ سەری بێشێنین.

پووری ئاناسرگیۆنا،شازادەخاتوون...هاتەژوور.ژنێکی ئەنـدام وردیلـەبوو بەرووخسـارێکی بچـووك کـە تیشـکی شـەڕەنگێزی لەچـاوەکانی دەباری.شـازادە چـاوەکانی بەپرچەسـپیەکەی داپۆشیبوو.کە هاتەژووریّ بە ئاماژەی سەر ڕێزی لەمیوانەکان ناو پاشـان لەسـەر کورسـییەك دانیشت کە هیچ کەسێك جگەلەخۆی هـەقی نـەبوو لەسـەری دابنیشێ.دەسـت بـەجێ کاتیـا کورسییەکی بچووکی لەژێرپێی دانا.پیرەژن نەسوپاسی کردو نەهـەتا چاویشـی لـەو کیژۆڵەیـە کرد،تەنیا دەستی لەژێر ئەو دەسماڵەزەردەی کە تەواوی لەشی داپۆشیبوو وەجوڵەخستن.شـازادە عاشقی ڕەنگـی زەردبـوو تەنانـەت ئـەو کـلاّوەش کـە لەسـەریدەنا بـەداوی ئاوریشـمی زەرد نەخشێنرابوو.

ئادینسۆڤا بە دەنگێکی بەرزپرسی:

- پووریێ گیان ئاسوودە نووستی؟

شازادە خاتوون لەجیاتی وەلاّمدانەوە لەبن لێوانەوە بۆلّەیەکی کرد:

- ئەوسەگە دیسان لێرەیە.

کاتێك هەستیکرد فی فی یەك دوو هەنگاو لێی نزیك کەو تۆتەوە هاواریکرد:

- چەغە،چەغە.

کاتیا بانگی فی فی کردو دەرگاکەی کردەو.فی فی بەشەوق و کلکەسووتە لەژوورەکە چوودەر بەلاّم کە دیتی دەرگاکەیان لەسەرداخست دەستی کرد بەقرووسکە قرووسك و چنگی لە دەرگاکە گیردەکرد.شازادە خاتوون رووی ترش کردو داوای لە کاتیاکرد بچێتەدەرەوە.

ئادینسۆڤا گوتی:

- لەکاتی خۆیدا چایەکە ئامادەیە.بەرێزان فەرموون.پووریێ گیان فەرموو.

شازادەخاتوون بەبێ دەنگی هەستاو وەپێشیان کەوت،ئەوانیدیکەش لە ژوورەکە چوونەدەرەوەو چوونە ژووری نیوەرۆخواردن.خزمەتکارێك کەجلکێکی تایبەتی لەبەردابوو،کورسییەك کەچەند بالّنجێکی لەولاولا دانرابوون کێشایە دواوەو شازادەخاتوون بەشکۆوە لەسەری دانیشت.کاتیا کەچا تێکردنی لەئەستۆبوو فنجانێکی تایبەتی پرلەچای کردو لەپێش پووری دانا.پووریێ هەنگوینی لەچایەکەی خۆیکرد (ئەو پێیوابوو کە خواردنەوەی چای بەقەند یەکەم زیانبەخشەو دووەمیش زیادە خەرجیە.ئەگەرچی بۆخۆی لەومالّەدا هەتا وردە پارەیەکیشی خەرج نەدەکرد) لە ناکاو پرسی:

- شازادە (ئیوان) چی دەنووسیێ؟

کەس وەلاّمی نەدایەوە.بازارۆف و ئارکادی زوو تێگەیشتن ئەو هەموو رێزەی کە لێی دەنێن،کەچی کەس گرنگی پێنادا.بازارۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- بۆخۆنواندن رایان گرتووە،هەر لەبەرئەوەی شازادەیە.

دوای چایخواردنەوە،ئاناسرگیۆنا پێشنیاری کرد پیاسەیەك بەناو باخەکەدا بکەن بەلاّم بارانێکی نەرم دەستیپێکرد و هەموویان بێجگە لەشازادە خاتوون چوونەوە ژووری پێشوازی.دراوسێیەکیان کە یاری وەرەقەی لەگەلّدا دەکردن هاتەلایان،پارفێری پلاتۆنیچی بەشەرم و قسەخۆش،قەلّەوو سەر سپی و کورتەبالاّبوو.ئاناسرگیۆنا کە تەواوی هۆشی لای

بازارۆف بوو لێی پرسی کە ئایا حەزدەکات دەستێك یاری (پرفرانس) بکات، کە یاریەکی لەمۆد کەوتووبوو  یان نا.

بازارۆف لە کاتێکدا کە دەیگوت بەوزوانە دەبێتە دکتۆر لەشار،ئامادەیی خۆی نیشاندا.

ئاناسرگیۆنا گوتی:

- دەبێ هەست و هۆشتان کۆکەنەوە دەنا لەگەڵ پافێری پلاتۆنیچ لێتان دەبەینەوە.

پاشان ڕووی لەخوشکەکەی کردوو گوتی:

- کاتیا تۆش شتێك بۆ ئارکادی نیکۆلاییۆڤیچ لێبدە.حەزی لەمۆسیقایە.ئێمەش گوێ دەگرین.

کاتیا بەناچاری لە پیانۆکە نزیك کەوتەوە.ئارکادیش هەرچەندە حەزی لەمۆسیقابوو بەلاَم بەبێ وازی کەوت.پێیوابوو ئانا دەیەوێ لەکۆڵ خۆی کاتەوە.لەکاتێکدا لە دەروونی خۆیدا هەستێکی هەبوو کەئەویش بەعەشق نەدەچوو.کاتیا پیانۆیەکەی هەڵدایەوەو لە ئارکادی پرسی:

- چ ئاوازێکت پێخۆشە بۆتان لێبدەم؟

ئارکادی بەبێ تاقەتی گوتی:

- هەرچی بۆخۆت پێت خۆشە.

کاتیا بەهەمان حاڵەتی پێشوو پرسی:

- تۆحەزت لەچ جۆرە مۆسیقایەکە؟

ئارکادیش بەهەمان بێ تاقەتی پێشووەوە گوتی:

- مۆسیقای کلاسیك.

- مۆرتساتت پێخۆشە.

- بەڵێ.

کاتیا سۆناتەی فانتزی دۆزیەوەو بەجوانی ژەنی.هەرچەندە کەمێك ئیشك وجدی لێیدەدا.کاتی ژەنین کاتیا چاوی لەسەر نۆتەکە هەڵنەدەگرت.ڕەق دانیشتبوو لێوەکانی لەسەریەك دانابوون.لەکۆتایی سۆناتەکە ڕەنگی رووخساری سوور هەڵگەڕابوو کەمێك لەپرچە بلاَوەکەی کەوتبوونە سەر برۆپڕەکانی.ئارکادی زۆر بەقوڵی کەوتبووە ژێرکاریگەری دوابەشی سۆناتەکە.هەمان بەشی کەلەپڕێکدا ناڵەوخەم جێگای شادی دەگرنەوە.بەلاَم ئەو هەستە

دەرکەوتووە هیچ پەیوەندیەکی بەکاتیاوەنەبوو.ئارکادی کاتێك سەیری دەکرد لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە:

- باش پیانۆ لێدەدا.بۆخۆشی خراپ نییە.

دوای تەواوکردنی سۆناتەکە،کاتیا بێ ئەوەی پەنجەلەسەر پیانۆکە هەڵبگرێ پرسی:

- بەسە؟

ئارکادی گوتی ئیجازە بەخۆی نادا لەوەزیاتر مانـدووی بکـاو دەرگـای گفتوگـۆی کـردەوە لەبارەی مۆسیقاو مۆتسارت پرسی کـە ئایـا ئەوسـۆناتانە بۆخـۆی هەڵیبـژاردوون یـان بۆیـان هەڵبژاردووە.وەڵامەکانی کاتیا کورت و پووخت بوون.دیاربوو کە هەوڵیدەدا هەستەکانی خـۆی بشـارێتەوە.کاتێك ئەوحاڵەتـەی بەسـەر دەهـات دووچـاری تـرس دەبوو.تەنانـەت قیافەشـی حاڵـەتێکی گێلانـەی بـەخۆوە دەگرت.هێنـدە شـەرمێون نـەبوو بـەلاّم بـەهۆی پـەروەردەی خوشـیکیەوە کـەمێك ترسـنۆك بارهاتبوو.ئانـا ئاگـای لـەوباس و خواسـانە نـەبوو.ئارکادی بۆدەربازبوون لەوحاڵەتـە،بانگی ڤی ڤی کـرد کـە هـاتبووەژووری و خـەریکی یـاری کـردن بـوو لەگەڵیدا.کاتیاش چۆوەلای گوڵەکانی.لەو نێوەشدا بـازارۆف بـەردەوام دە دۆڕا.ئانـا سـرگیۆنا وەسـتایانە یـاری دەکـردو پـافیری پلاتۆنیچـیش تاڕادەیـەك دەیتـوانی پارێزگـاری لـەخۆی بکات،بەوشێوەیە بازارۆف دۆڕابوو هەرچەندە بڕێکی زۆرنەبوو لەگەڵ ئەوەشدا شێواوو نیگـەران دەهاتەبەرچاو.دوای نانخواردنی شەو،ئانا سـرگیۆنا دووبـارە باسـەکەی بـەرەو گیاناسـی بـردو لەبازارۆفی پرسی:

- ئەگەر حەزت لێبێ بەیانی زوو دەچینە گەڕان تا نـاوی لاتـینی گوڵـە کـانی دەشـتێ و تایبەتمەندیەکانی هەریەکێك لەوانەت لێ بپرسم.

بازارۆف پرسی:

- ناوی لاتینی گوڵەکانت بۆچییە؟

ئانا وەلاّمی دایەوە:

- بێگومان زانینی هەرشتێك سوودی خۆی هەیە.

* * *

کاتێك دووهاوڕێ لە ژوورەکەیاندا بەتەنێ مانــەوە.ئارکادی بــەدەنگێکی نزیــك لــە هــاوار گوتی:

- ئەو ئاناسرگیۆنایەش ژنێکی سەیرە.

بازارۆف وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ،ژنێکی خاوەن بیرەو ئەزموونێکی زۆری کۆکردۆتەوە.

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ مەبەستت چییە؟

- مەبەستێکی خراپم نییە.تەنیا ویستم تاریفی بکەم....ئارکادی نیکۆلاێۆڤیچ دڵنیام کــە کاروباری زەوی و زاریش بەشێوەیەکی باش ڕادەپەڕێنێ...بەلاّم کەسێك کە لێرەدا بۆتــە جێــی سەرسامیم،خوشکەکەیەتی نەك خۆی.

- چۆن؟...ئەوگەنم ڕەنگیەی؟

- بەڵێ،هەمان گەنم ڕەنگیەکەی.ئەو هێشتا تازەو سڵ و بێدەنگ و...بەکورتی هەچی بڵێی وایە.مرۆڤ دەبێ کاتی بۆتەرخان بکات.چۆنت بوێ دەتوانی وای درووست بکــەی بــەلاّم ئــەوەی دیکەیان کامڵەو لەکڵ هاتۆتەدەر.

ئارکاری وەلاّمی نەدایەوە هەردووکیان چوونەناو جێگاکانیانەوە.

* * *

ئانــا ســرگیۆنا ئەوشــەوە لــەبیری میوانەکانیــدابوو.بازارۆفی بــەخاتری بوێریەکــەی خۆشدەویست.شتێکی تێدا بەدی دەکرد کە لەلای ئەو تازەبوو ژنێك بوو کە دەیویســت ســەرلە هەموو شتێك دەربێنێ.

ئاناسرگیۆنا ژنێکی سەیربوو کە بێ بڕوابوون بەشتی خەیالآتی یان بڕواداری،تەسلیمی هیچ شتێك نەدەبوو و ئامانجێکی تایبەتیشی نەبوو.زۆرشتی بەباشی وەردەگرت و زۆریش لەشتەکان سەرنجیان ڕادەکێشا،بەلاّم هیچ شتێك نەیدەتوانی تەواو ڕازیبکا.لەو ڕوانگەیەوە بیرێکــی وردوو هێمنی هەبوو.شکوگومانەکانی نەهێندە دەهاتنەخوار لەبیری بچنەوەو نەهێندەش هەڵدەکشــان کە دووچاری تــرس و دڵــەڕاوکێی بکەن.ڕەنگــە ئەگــەر دەوڵەمەنــد نــەبا،بووبا بــە کەســێکی سەربەگۆبەند...بەلاّم ژیانێکی ئاســوودەی هــەبوو ڕۆژگــاری بــەهێمنی دەگوزەراند.هەنــدێجار دووچاری خۆشحاڵی دەبوو خەیاڵ پلاّوی دەکردن بەلاّم ئەو هەســتە هێنــدە دەوامــی نــەدەکردو

دەست بەجێ هێمنی جێگای هەموو شتێکی دەگرتەوە.هەندێجار خەیاڵەکانی لە بازنەی بنەما ئەخلاقیەکان دەردەچوون،بەلاّم لەهەمان کاتیشدا تێك نەدەچوو لێدانی دڵی ئاسایی بوو.هەندێجار کە لە گەرماوە بۆنخۆشەکەی،گەرم وخومار دەهاتەدەر دەکەوتە بیری بێهودەبوون لەژیان و لەخۆیدا هەستی بەئازایەتی و لێوەشاوەیی دەکردو حەزی دەکرد کاری چاکە ئەنجام بدات،بەلاّم هەڵکردنی بچووکترین شنەبا کەلەپەنجەرەکەی دەدا ئاناسرگیۆنا خۆی کۆدەکردەوەوخالّی دەبووەوە هەمووشتێکی لەبیردەکردو حەزی دەکرد کەئیدی ئەوشنەبا نەفرەتییە بیخات.

وەك تێکڕای ژنانی بێبەش لەعەشق ئەویش بەدوای شتێکدا دەگەڕا کەخۆیشی نەیدەزانی چییە.لەڕاستیدا خوازیاری هیچ شتێك نەبوو لە کاتێکدا بیری دەکردەوە کە هەمووشتێکی دەوێت.

لەگەڵ مێردە کۆچکردوەکەی لەڕووی ناچارییەوە ژیابوو. (بەپێی ڕێ و ڕەسم ببووە هاوسەری.ئەگەرچی مێردەکەی پیاوێکی میهرەبان نەبوو هەرگیزشتی واشی نەدەکرد) نەفرەتی لەهەموو ئەوپیاوانەدەکرد کە لەخەیاڵی خۆیدا بە بوونەوەرێکی تەمبەڵ،ناپاك و بێهێزی دەزانین.سەردەمێك کە لەدەرەوەبوو تووشی گەنجێکی جوانی سویسری بوو کەچاوەجوانەکانی زۆر کاریان لە ئاناسرگیۆناکرد.ئەوەش نەیتوانی بیبێتەهۆی نە گەڕانەوەی بۆرووسیا.

ئاناسرگیۆنا لەنێو جێوبانە ڕازاوەکەیدا درێژببوو.سەری وەسەر سەرینەکەی کردبوو لێفە ئاوریشمیە کەی تاژێر چەناگەی هەڵکێشابوو.هۆگری ڕازاندنەوەی لەباببیەوە بەمیرات بۆ مابۆوە. باوکە تاوانبار بەلاّم میهرلاەبانەکەی لەڕادەبەدەر خۆشدەویست بابیشی لەبەرامبەردا ئەوی دەپەرست و هاوڕێیانە گەمەی لەگەڵ دەکردو ڕازەکانی خۆی لاباس دەکرد...بەلاّم شتێکی ئەوتۆی لەبارەی دایکییەوە لەبیرنەمابوو.

ئانا لەبەرخۆیەوە گوتی:

- ئەو دکتۆرە شتێکی سەیرە.

پاشان باوێشکێکی داو،بزەیەکی هاتێ.دەستی وەبن سەریداو دووسێ لاپەڕەی لە ڕۆمانێکی لە مۆدکەوتووی فەرەنسی خوێندەوەو پاشان کتێبەکەی هەڵدایە گۆشەیەك.لەشە ناسك وساردو هێمنەکەی لەجوڵەکەوت و خەوی لێکەوت.

بۆبەیانی دەست بەجێ دوای نانخواردن ئاناسرگیۆناو بازارۆف بۆ دیتنی گیاوگۆڵ لەماڵ وەدەرکەوتن و لای نیوەڕۆیە گەڕانەوە.ئارکادی نەڕۆیشت تەنیا کاتژمێرێك لەگەڵ کاتیا مانەوە.کاتیا پێشنیاری کرد کە سۆناتەی شەوی ڕابردووی بۆ بژەنێتەوە.بەلاّم کاتێك ئادینسۆڤا گەڕایەوەو چاوی لەچاوی ئارکادی بڕی دڵی تێکڕابوو...ئانا بەهەنگاوی ماندوو لەباخەکە دەگەڕا.گۆناکانی سوورهەڵگەڕابوون و تیشکی چاوەکانی لەجاران درەوشاوەتربوون.بەپەنجان لاسکی گوڵێکی هەڵدەسووڕاند.سووخمەکەی کەوتبووە سەرئانیشکی و داوێکی خۆڵەمێشی کلاّوەکەی تاسەر سنگی شۆڕببوەوە.بازارۆف بەهەمان بێ پەروایی خۆی پێ بەپێی دەهات هەرچەندە سەری حاڵیش نەبوو.بەلاّم بەدڵی ئارکادیش نەبوو.بازارۆف سلاّوێکی کردوو چووەژوور.ئادینسۆڤاش بەشپرزەیی دەستی ئارکادی گوشی و ڕۆیشت.

ئارکادی لەبەرخۆیەوە گوتی:

- سلاّو ئیدی چ مانایەکی هەیە؟ بۆ چما ئەمڕۆ یەکتریمان نەبینیووە؟!

## (١٧)

وەك دەڵێن زەمان هەندێ جار وەك بایەکی توونتد تێدەپەڕێ و هەندێ جاریش وەك کرمێك بەهێواشی دەخزێ،مرۆڤ ئەو کاتەشادمانە کە لە تێپەڕینی زەمان تێنەگات.ئارکادی و بازارۆف پازدە ڕۆژیان بەو شێوەیە لە ماڵی ئادینسۆڤا تێپەڕاند.ئەوان ئەوخۆشیەیان بە لەبەرچاو گرتنی ئەو دسپلینە دەزانی کە ئاناسرگیۆنا لەماڵەکەیدا نەك هەرخۆی پابەندی بوو بەڵکو ئەوانیدیکەشی ناچارکردبوو کە پەیڕەوی بکەن.هەر کارەو لەکاتی خۆیدا جێیەجێ دەکرا.کاتژمێر هەشتی بەیانی،کاتی چایخواردنەوەبوو تا کاتی نیوەڕۆ هەرکەس ئازادبوو بچێتەهەرجێگایەك و لەو ماوەیەداخاوەن ماڵ لەگەڵ سەرکارەکەی دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردن گفتوگۆی دەکرد...ئێوارانیش ئەندامانی خێزان لە دەوری یەك کۆدەبوونەوە تا بەکۆمەڵ کتێبێك بخوێننەوە یان باسوخواسێك بکەن.شەویش کاتی گوێگرتن بوو لەمۆسیقا یان قوومارکردن.کاتژمێر دەونیو، ئاناسرگیۆنا دەستووریدەدا بۆڕایی کردنی کارەکانی بەیانی .پاشان دەچووە ژوورەکەی خۆی و دەنووست.بازارۆف ئەو دسپلینەی هێندەپێخۆش نەبوو.پێیوابوو کە ئەوجۆرە ژیانە یەکڕیتمییەو بێ ڕۆحە. ڕێك وەك ئەوەی مرۆڤ لەسەرسکەی شەمەندەفەربڕوات.خزمەتکارەکان بەوجلو بەرگە فەرمی و ڕێکەکەیان هەستی دیموکراتیانەی ئەویان برینداد دەکرد.پێیوابوو ئەگەر قەراربێ وەك ئینگلیزان بژین واباسترە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ بەجلی ڕەسمی و بۆینباخی سپییەوە لەپشت مێز ئامادەبن.سەرەنجام ڕۆژێك ئەو باسەی لەگەڵ ئاناسرگیۆنا هێناگۆڕێ.هەڵسووکەوتی ئاناسرگیۆنا وابوو کە هەمووکەس دەیتوانی بیروڕای خۆی لەگەڵ باسبکا.ئاناسرگیۆنا دوای بیستنی قسەکانی بازارۆف وەڵامی دایەوە:

- ڕەنگە هەقی تۆبێ و ڕەنگە هەست بەئاغایەتی بکەم بەڵام ژیان لەگوند بەجۆرێکی دیکە ناکرێ.ئەگەرجۆرێکی دیکەبژی جگەلەخەم وپەژارە زیاتر بەرهەمێکی دیکەی نابێ.

دووباره هەمان رەفتاری پێشووی گرتەوەبەر.بازارۆف هەروا ناڕازی و بەگلەیی بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوو ئارکادی لەژیان لەوماڵەدا کە وەك ئەوەی وابوو بەسەرسکەی شەمەندەفەردا دەڕۆی،چێژیان وەردەگرت.

هەر لەگەڵ یەکەم ڕۆژی مانەوەیان لە نیکلسکۆی،شوێنەکە کاریگەری خۆی لەسەر هەردوو گەنجەکە دانا.بازارۆف کەوا دەردەکەوت کەوتۆتە بەردڵی ئاناسرگیۆنا،هەرچەندە لە هەندێ بابەتیشدا جیاوازیان هەبوو،هەندێجار وا دووچاری شڵەژان و دڵەخورپەدەبوو کەپێشتر ڕووی نەدابوو.زۆر زوو هەڵدەچوو.بەنابەدڵی قسەی دەکرد.تووڕەو تۆسن بوو نەیدەتوانی لە شوێنێك بەندبێ.

ئارکادیش کەخۆی بەعاشقی ئادینسۆڤا دەزانی کەوتبووە ناو خەمێکی قوڵەوە بەو هەموو خەمەوە نەیتوانی پێش بەنزیکبوونەوەی لەگەڵ کاتیا بگرێ ڕێك بەپێچەوانە هەمان هەست ئەوی زیاتر لە کچەجوانەکە نزیکتر کردەوە.ئارکادی لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- ئەو قەدرم نازانێ...بەڵام لەبەرامبەردا ئەو بوونەوەرە میهرەبانە لەخۆیم ناتۆرێنێ...چی دەکەی؟

بەو هەستەوە شادی دەچووە ناو دڵیەوە.کاتیا تێگەیشتبوو کە ئارکادی لەدیتنی هەست بەئارامی دەکات هەربۆیە نە ئەوی لەو ئارامیە بێ بەش دەکردو نەخۆیشی لەو هاوڕێیەتیە بەدوور دەگرت. لەبەردەم ئاناسرگیۆنادا زۆرکەم بەیەکەوە قسەیان دەکرد چونکە کاتیا لە بەرامبەر خوشکەکەیدا بێدەنگ دەبوو ئارکادیش هەروەکو کەخووی عاشقانە لەبەرامبەر خۆشەویستەکەیدا نەیدەتوانی بێجگە لەو بیرلە هیچ شتێکی دیکە بکاتەوە.بۆیە کاتێك ئارکادی و کاتیا بەتەنیا دەمانەوە کاتێکی خۆشیان بەسەردەبرد.ئارکادی دەیزانی ناتوانێ ئاناسرگیۆنا سەرگەرم بکات.کاتێك پێکەوە دەمانەوە ترس هەڵیدەگرت و دەستەپاچەی دەکرد.ئادینسۆڤاش قسەیەکی نەبوو تا لەگەڵ ئارکادی دا بیکات.ئارکادی زۆر پێ لەوشتانە بچوکتربوو.بەڵام ئارکادی لە بەرامبەر کاتیادا هەستی بەئارامی دەکردو کچەش ڕاوبۆچوونەکانی دەربارەی چیرۆك،مۆسیقاو...لەگەڵدا باسدەکرد.بەبێ دەنگی گوێی لەوقسە حەللەق مەللەقانە ڕادەگرت بێ ئاگا لەوەی کەهەمان ئەوقسە بێ بنەمایانە سەرگەرمیان دەکرد.کاتیاش بەتەنیا جێیدەهێشت تا بکەوێتە ناوخەم و پەژارەی خۆیەوە.

ئادینسۆڤا لەگەڵ بازارۆف دڵخۆش بوون ئارکادیش لەگەڵ کاتیادا.هەرکاتێك کە هەرچواریان پێکەوە دادەنیشتن.دوای ماوەیەکی کەم دوو دووجیا دەبوونەوەو بۆلایەك دەڕۆیشتن.کاتیا وەك شێتان عاشقی سرووشت بوو بەلاّم دەترسا ئەوهەستەی ئاشکرابکات لەسەیرکردنی سرووشت چێژی وەردەگرت.لە کاتێکدا سرووشت نەلای ئادینسۆڤاو نەلای بازارۆف ئەو گرنگیەی نەبوو.دوورکەوتنەوەی ئەو دووهاوڕێیەلە یەکتری سەرەنجام کاریگەریەکانی دەرکەوتن.بازارۆف ئیدی لە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئارکادیدا باسی سرگیۆنای نەدەکردو رەخنەی لەخەسڵەتە خانەدانییەکەی نەدەگرت هەرچەندە دەبارەی کاتیا بەهەمان بۆچوونی جارانی قسەی دەکردو پێیوابوو کە دەبێ ئەوکچە درووستبکرێ و لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانی سەرزارەکی بوون و لە دڵەوە نەبوون.بەشێوەیەکی گشتی لەجاران کەمتر قسەی لەگەڵ ئارکادی دەکرد...دەتگوت لێیدەپرینگێتەوە...یان لێیدەترسێ.ئارکادی ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو بەلاّم قسەی نەدەکرد.

هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو دوو ئاڵوگۆڕەش لەپەیوەندی نێوان دووهاوڕێ کەدا،هەستێك بوو کە ئاناسرگیۆنا لە بازارۆفیدا درووستکردبوو...هەستێك کە مایەی ڕەنج و تووڕەیی بازارۆف بوو. هەستێك کە ئەگەر کەسێك پێیگوتبا ڕەنگە ڕۆژێك یەخەی تۆش بگرێتەوە لەوەلاّمدا پێدەکەنی و گاڵتەی بەکابرا دەکرد.بازارۆف ژنی خۆشدەویستن بەلاّم عەشقی ڕۆمانسیانەی پێ گێلانەو گاڵتەجاڕی بوو چەندان جار گوتبووی کە پێویستەشاعیرانی ڕۆمانتیکی فەرەنسی بەرنە شێتخانە. هەمیشەدەیگوت:

- ئەگەر حەزت لە ژنێك بوو هەولبدە وەدەستی خەی.ئەگەر نەکرا بەدوای یەکێکی دیکەدا بگەڕێ. زەوی خودا گەورەیەو پڕیشەلەژن.

بازارۆف ئادینسۆڤای خۆشدەویست و ئەو قسانەی دەربارەی ڕای سەربەخۆ و بیروڕای ئازادو...لە ئاناسرگیۆنای بیستبوو و ئەو ڕێزەی کە لێینابوو ئەو وێنەی لادرووستببوو کە خاوەن ماڵ ژنێکی دەستەمۆیە بەلاّم ڕاستی شتێکی دیکەبوو.کەواتە بەگوێرەی بیروڕای بازارۆف،دەبوایە واز لەو ژنە بێنێ و وەدوای ژنێکی دیکە بکەوێ.کە دەیبینی ناتوانێ وازلە ئادینسۆڤا بێنێ تووڕە دەبوو. هەستێکی تازەی لەخۆیدا دەدیت.هەستێك کە تاپێش ئێستا پێی پێدەکەنی و ئێستاش ئەو هەستە تەواوی لەخۆبایی بوون و متمانە بەخۆبوونەی تێکوپێك دەدا.کاتی قسەکردن لەگەڵ ئاناسرگیۆنا هەمیشە گاڵتەی بەهەست و سۆزی ڕۆمانسیانە دەکرد

بەلاّم کاتێك تەنیا دەبوو بەترس و لەرزەوە دەیدت بۆتە کەسێکی ڕۆمانسی.بۆ دەربازبوون لەو هەستە بەپڕتاو لەناو دارستانەکە دەستی دەکرد بەپیاسەکردن.لکی دارەکانی دەشکاندو تانەو تەشەرو قسەی ناشرینی بەخۆی و ئاناسرگیۆنا دەدا.هەندێجاریش لەعەمبارەکە لەسەرکا لێی درێژدەبوو بەڵکوخەوی لێبکەوێ و لەو هەستەدوور بکەوێتەوە.بەلاّم زۆر بەکەمی سەرکەوتوو دەبوو.

هەندێجار بەخەیاڵ دەستە ناسکەکانی ئاناسرگیۆنای لەگەردنی خۆیدا دەدی و لێوەکانی بە لێویەوەو چاوەتیژەکانی لەچاویەوەدەبڕی.سەری لە گێژەوەدەهات و خۆی لەبیردەکرد تا کاتێك خۆی لەو هەستە بێزارە دووردەخستەوە بەو حاڵەدەمایەوە.دەتگوت شەیتان چۆتەکەوڵیەوە...هەندێجاریش پێیوابوو کە ئادینسۆڤاش دووچاری ئاڵوگۆڕێك بووە....لەرووخساریدا هەندێك شتی تازە دەبینران کە ڕەنگە ئەو نیشانەیە...بازارۆف هەرکاتێك دەگەیشتە ئێرە بەتووڕەییەوە پێی بەزەوی دادەدا.ددانی لەچیڕەوەدەبردوو مشتی خردەکردوو جنێوی بەخۆی دەدا.بەلاّم با ئەوەش لەبیرنەکەین کەبیری بازارۆفیش هێندە لەخۆڕایی نەبوو.ئاناش زۆرزۆر بیری لە بازارۆف دەکردەوە.

هەرچەندە کە ئەویش دیارنەبا هەستی بە دڵتەنگی نەدەکرد بەلاّم هەرکە بازارۆفی دەدی هەستی بەخۆشحاڵی دەکرد.هەوڵیدەدا بەتەنیا لەگەڵی وەمێنێ و باس لەزۆرشت بکەن.تەنانەت ئەگەر بازارۆف سەرزەنشتی قسەو رەفتارەکانیشی دەکرد ئادینسۆڤا نیگەران نەدەبوو.دەتگوت دەیەوێ بەو کارەی خۆی و بازارۆف تاقی بکاتەوە.ڕۆژێك لە کاتێکدا لە ناوباخ پیاسەیان دەکرد،بازارۆف لەناکاو درکاندی کە دەیەوێ بچێتەلای باوکی.بەبیستنی ئەو وشەیە ئادینسۆڤا ڕەنگی رووخساری پەڕی.دەتگوت سووژنێیان لەدڵی ڕاکردووە.هێندە نیگەران بوو کە ماوەیەك ناچاربوو بیرلە ئاڵوگۆڕی حاڵەتی خۆی بکاتەوەو هەوڵبدا تا هۆکاری ئەونیگەرانیە بزانێ.بەلاّم بازارۆف لە درکاندنی ئەوشتە مەبەستی تاقی کردنەوەی ئادینسۆڤای نەبوو.بەپێی عادەتی خۆی نەیدەتوانی درۆبکا.ڕاستیەکەشی ئەوەبوو کە بەیانی هەمان ڕۆژ سەرکارەکەی باوکی و سەرپەرشتی دەورانی منداڵی خۆی دیتبوو.پیرەمێردێکی چالاك و قژزەرد،رووخساری تاوەسووت و چاوی بەقوڵداچووبوون، جلکێکی خوری شینی لەبەردابوو پشتێنێکی دڕاوی بەستبوو پێلاّوەکانیشی دەتگوت بۆیاخێکی سووریان لێدراوە لەناکاو لەپێش بازارۆف قوتبۆوە.بازارۆف بەسەرسوڕمانەوە هاواریکرد:

- سلاّوپیرەپیاو.

پیرەمێرد لەخۆشیان پێکەنی کە تەواوی ڕووخساری بوونەگنج.

- سلاّو یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ،چۆنی بابەگیان.؟

- بۆچ کارێك هاتووی؟ بەدوای مندا ناردوویانی؟

پیرەمێرد دەمی تەتەڵەی کرد.

- ڕێزت هەیە.ئەوقسانەچن دەیانکەی قوربان...(ئەوفەرمانەی کە ئاغـا لـەکاتی هاتنیـدا پێیـدابوو وەبـیری هاتـەوە) بۆڕاپەڕانـدنی کارەکـانی ئاغـا دەچوومەشـار کەبیسـتم جـەنابت لێرەی...بۆ دیتنی تۆ...ڕێگاکەم گۆڕی...دەناچۆن دەکرێ ببمەهۆی نارەحەتی جەنابتان.

- پێویست ناکا درۆیان ڕێکخەی.بۆچما ڕێگای شار لەولایەیە؟

پیرەمێرد کەمێك خۆی هێناوبرد.

- باوکم چۆنە؟

- باشە.

- دایکم چۆنە؟

- سوپاس بۆخواحاڵی ئارینا ڤاسیلیۆناش زۆرباشە.

- چاوەڕوانم دەکەن؟

پیرەپیاو ملی خوارکردەوەو گوتی:

- چۆن دەکرێ چاوەڕوانت نەبن؟سوێندبەخوا بنیادەم بە دیتنی ئـەوان دڵـی داغـان داغـان دەبێ.

- زۆرباشە هێندە چەنەبازی مەکە.پێیان بڵێ بەوزوانە دێمەلایان.

- فەرمان دەکەی قوربان.

هەرکە ڕۆیشت کلاّوەکەی لەسەرناو سواری گالیسکەکەبوو ئەسپە کزەکـە کەوتـەڕێ بـەلاّم بەرەولای شار نەڕۆیشت.

* * *

ئێوارەی هەمان ڕۆژ،ئادینسۆڤاو بازارۆف لە ژوورەکەی ئادینسـۆڤا دانیشـتبوون.ئارکادیش لە ژووری پێشوازی،دەهات و دەچوو گوێی لەمۆسـیقای کاتیـا ڕاگرتبوو.شـازادەخانمی پیریـش

چووبووه ژوورەکەی خۆی.ئەو بەهیچ جۆرچاوی دیتنی میوانانی نەبوو بەتایبەتیش لەو دوو تازە هاتووە شێتانە دەهری ببوو.کاتێك لەژووری پێشوازی دوولاوەکەی دەدیت تەنیا ناوچەوانی تێکدەنا،بەلاّم کاتێك لەگەڵ خزمەتکارە تایبەتەکەی پێکەوە دەمانەوە هێندەی جنێوو سووکایەتی پێدەگوتن کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدانەبوون.

ئادینسۆڤاش ئاگای لەوبەزمەهەبوو.

ئانا گفتوگۆی دامەزراند:

- چۆن بوو بڕیارتدا بەجێمان بێڵی؟ مەگەر بەڵێنەکەت لەبیرچۆتەوە؟

بازارۆف بەپەشۆکاویەوە گوتی:

- چ بەڵێنێك؟

- لەبیرت چۆتەوە؟ چما قەولت نەدابوو چەند وانەیەکی کیمیام پێ بڵێی؟

- دەڵێی چی؟ باوکم چاوەڕوانەو ناتوانم لەوە زیاتر وەمێنم.جیالەوەش کتێبێکم داویەی کە بەزمانی سادەنووسراوەو بۆخۆشت دەتوانی بیخوێنیەوە.

- بۆخۆت پێتگوتم کە کتێب ناتوانێ جێگای..ڕستەکەی تۆم تەواولەبیرنەماوە بەلاّم بۆخۆت دەزانی دەڵێم چی.

- بەڵێ،بەلاّم چی بکەم؟

ئادینسۆڤا پرسی:

- بەڕاست بۆ دەبێ لێرەبڕۆن؟

بازارۆف سەیرێکی کرد.ئادینسۆڤا بەئەنقەست سەری وەسەر کورسییەکە کردو قۆڵە ڕووتەکانی لەسەرسنگی لێك گرێدان.تیشکی چرایەك لەکاغەزێکی موشەبەکی کون کونەوە دەهاتەدەر.ڕووخساری ڕەنگ بزرکاو دەهاتە بەرچاو.کراسە سپییەچین چینەکەی تەواوی لەشی داپۆشیبوو تەنیا سەری پەنجەکانی دیاربوون.

بازارۆف وەلاّمی دایەوە:

- بۆچی بمێنمەوە؟

ئادینسۆڤا بەهێمنی سەری وەرگێڕاو گوتی:

- بۆ ئەوپرسیارەدەکەی؟ بۆ مەگەر ئێرەت پێخۆش نییە؟ڕەنگەپێتوابێ کەس لەرۆیشتنی تۆ نیگەران نابێ؟

- لەو ڕووەوە دڵنیام.

ئادینسۆڤا ماوەیەك بێدەنگ بووپاشان گوتی:

- وانییە.پێموانییە ئەوقسەیەت بەدڵ کردبێ.

بازارۆف بێدەنگ بوو.

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ بۆ هیچ نالێی؟

- بلێم چی؟ کەس شایانی بەزەیی نییە منیش وەك ئەوانیدیکە.

- بۆچی؟

- چونکەمنیش ئەگەر لەوانیدیکە خراپترنەبم باشترنیم.مرۆڤێکی وشکم و هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشیشم نییە.

- ڕەنگە مەبەستت ئەوەبێ تاریفت بکەم؟

- نا،من هیچ کاتێك ئەوشتانەم پێخۆش نین.بۆچی بۆخۆشت نازانی من لەوشتانەی کە تۆخۆشتدەوێن من هێندەم خۆش لێنایەن.

ئادینسۆڤا گۆشەیەکی دەسماڵەکەی بەددان گرت و گوتی:

- چۆنی پێتخۆشە وابیربکەوە بەلاّم ئەوەی بزانە کە لەڕۆیشتنی تۆ خەمباردەبم.

- ئارکادی لێرە دەمێنێتەوە.

ئادینسۆڤا شانێکی هەڵتەکاندوو گوتی:

- زۆردڵتەنگ دەبم.

- بەڕاستی؟ بەهەرحاڵ خەم وپەژارەی تۆ هێندە ناخایەنێ.

- بۆ وا دەلێی؟

- بۆخۆت گوتبووت تەنیا کاتێك دڵتەنگ دەبی کە ڕێکوپێکی کارەکان تێك بچن.ژیانی تۆ بەشێوەیەکی واڕێکخراوە کە نەجێگای دڵتەنگی تێدادەبێتەوەو نەجێگای هەرجۆرە هەستێکی ئازاردەر.

- تۆ پێتوایە کە لەژیانی مندا هەمووشتێك واڕێکخراوە کە ئیدی جێگایەکی خاڵی بۆهیچ شتێك تێدانەماوەتەوە؟

- بە دڵنیاییەوە دەڵێم بۆچی.دوای چەند دەقیقەیەکی دیکە لەگەڵ لێدانی زەنگی کاتژمێر دە،لەژوورەکەت وەدەرمان دەنێی.

- نا،یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ.واناکەم.دەتوانی هەرلێرە بمێنیتەوە...پەنجەرەکان بکەوە.واهەست دەکەم دەخنکێم.

بازارۆف هەستا.دەستی لەپەنجەرەکەداو پەنجەرەکە کرایەوە.بازارۆف پێیوانەبوو پەنجەرەکە وا بەئاسانی بکرێتەوە...دەستی دەلەرزین.شەوێکی تاریك و هەوایەکی بۆنخۆش، درەختەکان بەئارامی ڕادەژان،ئادینسۆڤا گوتی:

- پەردەکان دابدەوەو دانیشە.دەمەوێ پێش ڕۆیشتن کەمێك دەربارەی خۆت قسەم بۆبکەی.تۆ بەدەگمەن باسی خۆت دەکەی.

- ئاناسرگیۆنا،من هەمیشە هەوڵدەدەم باس لەشتێك بکەم کە بەکەڵك بێت.

- تۆ زۆر لەبەردڵانی...بەڵام پێم خۆشبوو لەبارەی باوك و دایکت کە بەجێتهێشتوون شتێکم لەزمانی خۆتەوە گوێ لێبووبا.

بازارۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە کە بۆچی شتێکی وای دەوێ بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- ئەوانیش شتێکی واسەرنجڕاکێشیان نییە،بەتایبەتی بۆتۆ،ئێمە خەڵکانێکی ونبووین کە...

- بەبڕوای تۆ من خانەدانم؟

بازارۆف گەڕایەوە لای ئاناسرگیۆناو بە دەنگێکی زبرەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ.

ئادینسۆڤا پێکەنی و گوتی:

- هەرچەندە پێدادەگری کە بۆناسینی هەموخەڵك تەنیا بەسە یەکێکیان بناسی لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم کە زۆرکەم، منت ناسیوە.کاتێك چیرۆکی ژیانی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە...بەڵام حەزدەکەم سەرەتا تۆ باسی ژیانی خۆتم بۆ بکەی.

بازارۆف پەسەندی کرد:

- ڕەنگە هەقی تۆبێ نەمتوانیبێ وەك ئەوەی پێویستە بتناسم.دەشێ بەڕاستیش هەر کەسەو ڕازێکی سەربەمۆربێ بۆنموونە تۆ،کە لەکۆمەڵگا ماندوویت و لەبەری ڕادەکەی بەڵام دووقوتابیت بانگهێشت کردوون بۆ ماڵەکەت.ڕاستی دەمویست بزانم کە بۆچی تۆ بەوهەموو زیرەکی و جوانییەتەوە لەگوند دەژی.؟

- دەڵێی چی؟...جوانی؟

بازارۆف برۆی تێکنان و گوتی:

- ئەوە هێندە گرنگ نییە...تەنیا دەمویست هۆکاری مانەوەت لە گوندی بزانم.

- تۆ ئەوەیان نازانی...بەلاّم دلّنیام ئەو مەسەلەیەت بەشێوەیەك بۆخۆت لێكداوەتەوە.

- بــەلّیّ...گومانی مــن ئەوەیــە کــە هۆکــاری ژیانــت لێــرە شــتێك نییەجگــە لــە بــە نازپەروەردەبوونت.تۆ لە ڕادەبەدەر حەزت لە ئاسوودەیی و هێمنیەو زۆریش بەحەوسەلەی.

ئادینسۆڤا دووبارە بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

- بەڕاستی ئەوەت قبوولّ نییە کە منیش ڕەنگە شتێکی دیکەم خۆشبویّ؟

بازارۆف بەتیلە نیگایەکەوە سەیرێکی ئادینسۆڤای کردوو گوتی:

- ڕەنگەوابیّ.بەلاّم تەنیا لە ڕووی کونجکاویەوەیە کەدلّت بەشتێکی دیکەوە بەستبێتەوە.

- بەڕاستی؟ کەواتە ئێستا هۆکاری گیانی بەگیانی خۆمان دەزانم.چونکە تۆش وەکومنی.

بازارۆف بەدەنگێکی نووساوەوە گوتی:

- ئێمە بەو هۆیەوە بووینەگیانی بەگیانی...

- بەلاّم لەبیرم چووبوو کە تۆ نیازی ڕۆیشتنت هەیە.

بــازارۆف هەستا.چــراکە لــەژوورە تاریــك و بۆنخۆشــەکە کزدەســووتا.هەوای پــاك بەهەمهەمەیەکی پڕلە نهێنیەوە ڕێگایەکی بۆخــۆی دەکردەوە.ئادینســۆڤا بچــووکترین جولّــەی نــەکرد بــەلاّم لــەناکاو دلّەخورپەیــەك کەوتــە دەروونییەوە.هــەمان هەســت کــە لــە دەروونــی بازارۆفیشدا دەکولاّ.بازارۆف ئــەوەی بۆدەرکــەوت کــە لــە ژوورێکــدا لەگــەلّ ژنێکــی جوانــدا بەتەنیایە.

ئادینسۆڤا پرسی:

- دەتەویّ بچیەکویّ؟

بازارۆف وەلاّمی نەدایەوەو خۆی هاویشتە سەرکورسییەك.ئانا بەهەمان ڕاوێژو بــیّ ئــەوەی چاولەپەنجەرەکە بگوازێتەوە گوتی:

- بە بۆچوونی تۆ من بوونەوەرێکی نازپەروەردەو خۆشگوزەران خوازو خۆڕەپێش خەرم.بەلاّم من خۆم بە بەدبەخت دەزانم.

- تۆ و بەدبەختی؟ ڕەنگە گویّ لەقسەی بیّ سەرەوبەرەی خەلّك بگری؟

ئادینسۆڤا ناوچەوانی تێکنا، لەوەی بازارۆف کـە لەمەبەسـتی نەگەیشـتبوو،نیگەران بـوو گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ،من هیچ کاتێك گوێ بەوقسانە نادەم کەلە پاشەملەم دەیانڵێن.من زۆرلەوە زیاترم کە گوێم لێدەبن.من لەو ڕوانگەیەوە بەدبەختم...کە هیچ زەوق وهیچ ئامانجێکم بۆ ژیان نییە.ئاوالێم مەڕوانە.ڕەنگەپێتوابێ ئەو ژنەی کە ئێستا قسەدەکات خانەدانێکە.ژنێکە کە لەسەرکورسـی مەخمـەری دانیشـتووەو سـەرتاپای خـۆی ئارایشـت داوە.نایشـارمەوە کـە ئەوشتانەی تۆ ناوت لێناون ئاسوودەخوازی پێم خۆشە بەلاّم لەهەمان کاتدا حـەزێکم بـۆ ژیـان نییە.ئێستا چۆن دەکرێ ئەو دوو هەستە دژبەیەکە لە کەسێکداهەبن نازانم...هەرچەندە دڵنیـام کە تەواوی ئەو قسانە بەڕای تۆ گاڵتەجاڕی و ڕۆمانسین.

بازارۆف سەری باداو گوتی:

- تۆ تەندرووستیت باشە،سەربەخۆو دەوڵەمەندی.ئایا شتێکی ترتدەوێ.؟

ئادینسۆڤا هەناسەیەکی هەڵێشاو گوتی:

- شتێکی دیکەشم دەوێت؟ ماندووپیربوو وم.دەڵێی زۆر ژیاوم.

پاشان لەکاتێکدا ڕۆبەکەی بەسەرقۆڵە ڕووتەکانیدا دەداگوتی:

- بەڵێ،زۆر پیربووم.

چاوی لەچاوی بازارۆف هەڵەنگوت.کەمێك سوورهەڵگەڕا:

- بیرەوەری زۆرم هەن،لە ژیـان لەپترۆسبۆرگ،سـەروەت،هەژاری،مردنی باوك،شـووکردن و پاشـان سـەفەری دەرەوە...بـەڵێ،بیرەوەری زۆرم هـەن بـەلاّم لـە یـادەوەری هیچیـاندا چـێژ وەرناگرم... لەبەر دەمیشمدا ڕێگایەکە زۆر درێژەو بێ ئامانج...حەزیشم لە ڕۆیشتن نییە.

بازارۆف پرسی:

- ئایا بەڕاستی هێندە لە ژیان بێ هیوای؟

ئادینسۆڤا بەشێنەیی گوتی:

- نا،بەلاّم هێندەش ڕازینیم،ڕەنگە ئەگەر دەمتوانی دڵ بەکەسێك یان شتێك ببەستم...

بازارۆف قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- تۆ دەتەوێ عاشق بی بەلاّم ناتوانی ئەو کارەبکەی.ئەوە گرێ کوێرەی بەدبەختی تۆیە.

ئادینسۆڤا کەچاوی لەڕۆبەکەی بڕیبوو گوتی:

- مەگەر ناتوانم خۆشەویستی بکەم؟

- دەبێ بڵێم نا،من بەهەڵە ناوم نا بەدبەختی.کەسێك کە دووچاری ئەوحاڵەتەبێ زیاتر لە هەرشتێك شایانی دڵسۆزی و رەحمە تا گیرۆدەبوون...

- گیرۆدەبوونی چ شتێك؟

- گیرۆدەبوونی عەشق.

- چۆن دەزانی؟

بازارۆف بەتووڕەییەوە هاواری کرد:

- لە قسەی خەڵکی.

لە بەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- ئەی بەناز،تۆ نازدەکەی چوونکە لەبێ ئیشیان بێتاقەت بووی بەڵام من...

دڵی بەتووندی لێیدا.پاشان داهاتەوەو بەڕیشوەکانی کورسییەکەوەخۆی خافلاندو گوتی:

- سەرەڕای ئەوەش تۆ زۆر توندی.

- ڕەنگە!بە بڕوای من یان دەبێ هەمووشتێکت هەبێ یان هیچ...گیان لە بەرامبەرگیان و ژیان لە بەرامبەر ژیان...لەو دۆخەدایە کە ئەو کەسە بڕیاری کۆتایی داوەو خەفەت لە هیچ شتێکیش ناخوات.بەپێچەوانەی ئەوە، واباشە دەست لە سەردەست دابنێی و هیچ کارێك نەکات.

- زۆرباشە،قبوڵمە.شەرتێکی تەواوبەجێیە...بەڵام تۆچۆنە تا ئێستا ئەوکەسەی کە دەتەوێت پەیدات نەکردووە؟

- ئەگەر مرۆڤ وردبێتەوەو ڕێزلە بەهاکانی خۆی بگرێ،ئەوکارە هێندە کارێکی سادەوئاسان نییە...بەڵام ئەگەر کارەکە بێ تێڕامانبێ دیارە هێندە کارێکی سەخت نابێ.

- بەڵێ،ئەگەر لەو جۆرە کارانەدا مرۆڤ بیەوێ زۆر تێڕامێنێ و خۆی بگنخێنێ بێگومان کارێکی هێندە ئاسان نییە بەڵام بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەندێك لە شتەکان نابێ کارێکی سەخت بێ.

- چۆن مرۆڤێك دەتوانێ ڕێزلە بەهاکانی خۆی نەنێ.ڕابردوو و خۆڕاگری مرۆڤێکی بێ بەها، بە کەڵکی چی دێت.

- ناتوانم ئەومەسەلەیە شیبکەمەوە.هەڵسەنگاندنی کاری مرۆڤەکان لە توانای من بەدەرە.پووختەی مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێ لە هەندێ دۆخدا لە ڕادەبەدەر نەرم ونیان بێ.

- تۆجۆرێك قسەدەکەی کە دەڵێی تەواوی ئەو قۆناغانەت تێپەڕاندوون.

- ئەو قسانەم هەرواکردن.تۆخۆت باشتر دەزانی کە لەو باسانەدا من هەرگیز ناتوانم خاوەن ڕابم.

- بەلاّم ئەگەر تۆ لەجێگای من بای دەتتوانی هەمان نەرمیت هەبێ کەخۆت گوتت لەهەندێ مەسەلەشدا خۆ ببوێری؟

- نازانم.من ناتوانم تاریفی خۆم بکەم.

ئادینسۆڤا قسەیەکی دیکەی نەکرد.بازارۆفیش بێدەنگی پێ باشتربوو.دەنگی پیانۆ لەژووری پێشوازییەوە دەبیسترا.ئادینسۆڤا پرسی:

- چی بووە کاتیا تا ئەو نیوەشەوە پیانۆ لێدەدا.؟

بازارۆف هەستاوگوتی:

- بەڵێ،کات درەنگە.کاتی نووستنی تۆیە.

- کەمێك بووەستە.بۆهێندە پەلەتە؟...دەمویست شتێکت پێ بڵێم.

- چ شتێك؟

- سەبرکە.

ئادینسۆڤا لەچاوەکانی بازارۆفەوە ڕاما.دەتگوت دەیەوێ بیرکردنەوەکانی بخوێنێتەوە.بازارۆف لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو گەڕایەوە لای ئادینسۆڤاو بەپەلە گوتی:

- ماڵئاوا.

دەستی خاوەن ماڵی واڕێکگوشی هێندەی نەمابوو خاوەن ماڵ زیرەبکا،دەست بەجێ چۆدەرەوە.ئاناسرگیۆنا پەنجەکانی ڕیگوشین و بەرەولای دەمی بردن و فوی لێکردن پاشان بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت.وێدەچوو نیازی گەڕاندنەوەی بازارۆفی هەبێت...

خزمەتکارەکە هاتەژوورەوە سینییە زیوینەکەی لەسەرمێزەکە دانا.دۆلکەئاوێك لەسەر سینیەکە دانرابوو.ئادینسۆڤا لەشوێنی خۆی مایەوە.خزمەتکارەکەی ئیزنداو لە فکرەوەچوو.پرچەڕەشە شێواوەکانی وەکو ڕەشمارێك بەسەر شانانیدا کەوتبوون.تا کاتێکی

درەنگ چرای ژووری ئادینسۆڤا دایساو بۆخۆشی بەبێ دەنگی دانیشتبوو تەنیا جارجار دەستەکانی ڕێکدەگوشین کە سەرمای شەو تەزاندبوونی.

* * *

بەلاّم بازارۆف دووسێ کاتژمێر دواتر گەڕایەوە ژوورەکەی.شەونم پێلاّوەکانی تەڕکردبوون.ئارکادی لەپشت مێزێك دانیشتبوو کتێبی دەخوێندەوەو هەموو دووگمەی کۆتەکەی کردبوونەوە.

بازارۆف بەڕاوێژێکی خەمناك پرسی:

- تۆ هێشتا نەخەوتووی؟

ئارکادی بێ گوێدان بەپرسیارەکەی گوتی:

- تۆ ئەمشەو زۆرزیاد لەلای ئاناسرگیۆنا مایەوە.

- بەڵێ،لەوماوەی کە تۆو کاتیا سەرگەرمی مۆسیقالێدان بوون،من لای ئاناسرگیۆنا بووم.

- من پیانۆم نەدەژەنی...

ئارکادی قسەکەی بەنیووەچڵی هێشتەوە.حەزی دەکرد بگری.بەلاّم پێی باشبوو لە بەرامبەر ئەو هاوڕێ یەی کە هەر هەستێك بەگاڵتە پێکردن وەردەگرێ ئەو کارە نەکات.

## (١٨)

بـەیانی کاتێـك کـە ئاناسـرگیۆنا بۆچـایخواردنەوە هات،دەمێـك بـوو بـازارۆف بەسـەر فنجانەکەیـدا شـۆڕببوەوەو قسـەی لەگـەڵ کـەس نەدەکرد.بـەڵام هـەر لەگـەڵ هاتنـەژووری ئاناسرگیۆنا سەری هەڵێناو تەماشای کرد...ئاناسـرگیۆنا کـە دەتگـوت لـە نیگـای بـازارۆف تێکڕابـووە سـەیرێکی کرد.بـازارۆف هەسـتیکرد رووخسـاری ئاناسـرگیۆنا لەشـەوی ڕابـردوو پەڕیوترە.

ئاناسـرگیۆنا دوای ماوەیـەك چـووە ژوورەکـەی خـۆی و تـا کـاتی نـانخواردنی ناشـتا نەهاتەدەر.هەوای بارانی ڕێگای گەڕانی نەدەداو بەهەمان هۆوە هـەموان بەناچـاری لـە ژووری پێشوازیدا کۆببوونەوە.ئارکادی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی دەخوێندەوە.پووریێ گیانیش کە دەتگوت ئارکادی تووشی تاوانێك بـووە سـەرەتا بـە سەرسـووڕمانەوە لێـی ڕوانـی و پاشـانیش نیگـا ڕقاویەکانی لێوەبڕی.

بەڵام ئارکادی بێ گوێدان خەریکی کاری خۆی بوو.ئاناسرگیۆنا بە هێمنی بانگی بـازارۆفی کرد:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ وەرە بابچینە ژوور...دەمویست شتێکت لێ بپرسم...شەوی ڕابردوو باسی کتێبێکت کرد کە...

پاشـان لەشـوێنی خـۆی هەسـتاو وەدەرکـەوت.پووریێ گیـان سـەیرێکی دەورووبـەری خۆیکرد.دەتگـوت دەڵـێ: (سـەیرکەن چ کارێـك دەکـەن.) بـەڵام دووبـارە لـە ئارکادیەوەڕاما.ئارکادی سـەیرێکی کاتیـای کـرد کـە تێیـەوەڕامابوو دووبـارە دەسـتی کـرد بەخوێندنەوە.

* * *

ئاناسـرگیۆنا بـە هـەنگاوی خێـرا چـووە ژوورەکەی.لـە دواشـییەوە بـازارۆف کـە سـەری بەردابۆوە،دەڕۆیشـت و گـوێی لـە خشەخشـی ئەوجلکانـە ڕادەگـرت کـە لەپێشـیەوە دەڕۆیشت.هەرکە گەیشتە ژوور ئاناسرگیۆنا خۆی هەڵدایە سەر ئەوکورسییەی کـە دوێ شـەو

لەسەری دانیشتبوو.بازارۆفیش لەسەر جێگای شەوی ڕابردووی دانیشتەوە.دوای کەمێك بێدەنگی،ئادینسۆڤا وەقسەهات:

- باشە،ئەو کتێبەی گوتت ناوی چی بوو؟

- (کولییات...) ئەگەرچی باشترە لەپێشدا (نامەی پێشەکی فیزیا) نووسینی (گانۆ))بخوێنیتەوە.ئەو کتێبە بەوێنەوەیەو...

ئادینسۆڤا دەستی درێژکردو گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ من لەبەر کتێب بانگم نەکردووی بۆ ئێرە بەڵکو حەزدەکەم گفتوگۆی دوێ شەو درێژە پێبدەین.تۆ هێندە بەپڕتاو دەرپەڕی...خۆنیگەران نابی؟

- ئاناسرگیۆنا،من لەخزمەتدام...بەلاّم شەوی ڕابردوو لە بارەی چییەوە قسەمان دەکرد؟

ئاناسرگیۆنا بەنیو نیگایەك سەیرێکی بازارۆفی کردو گوتی:

- دەربارەی خۆشبەختی قسەمان دەکردو منیش باسی خۆمم بۆ دەکردی.ئێستاش کە باس لەخۆشبەختی دەکرێ دەمەوێ بپرسم بۆچی هەندێ کاتی ئێمە بۆنموونە لە شەوێکی جوان یان گوێگرتن لە مۆسیقایەکی خۆش یان دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەخۆشمان دەوێن چێژ وەردەگرین و هەست بەخۆشبەختی دەکەین...بەلاّم هیچ یەکێك لەوانە خۆشبەختی ڕاستەقینەنین،بۆچی؟ هەرچەندە ڕەنگە تۆ هەستێکی وات نەبێ؟

- ئەوپەندەت بیستووە کە دەڵێ: (خۆشبەختی لەوجێگایەیە کە ئێمەلەوێ نین.) جگەلەوەش شەوی ڕابردوو تۆ وات نیشاندەدا کە لەژیانت ناڕازی ...بەلاّم لەبارەی منەوە،ڕێك قسەی تۆیە.چوونکە ئەوجۆرە فکرانە هیچ کات لە مێشکی منداجێیان نابێتەوە.

- حەتمەن گاڵتەت بەوجۆرە بیرکردنەوانەدێ؟

- نا،بەهیچ شێوەیەك نایەنە مێشکی منەوە.

- بۆ؟ ڕاستیت دەوێ زۆرم پێخۆشە بزانم کە تۆ زیاتر بیر لەچی دەکەیتەوە؟

- بەڕوونی لە مەبەستەکەت نەگەیشتم.

- باش گوێ بگرە...دەمێك بوو دەمویست قسەت لەگەڵدابکەم.پێویست بەگوتن ناکا کە تۆ لەوخەڵکە ئاسابیە جیاوازی.تۆ هێشتا گەنجی و دواڕۆژێکی پڕشنگدارت لەپێشە.پرسیاری من ئەوەیە بۆ ئایندەچ بەرنامەیەکت هەیە؟ دەتەوێ چی بکەی؟ ئامانجت چییە؟ دەتەوێ بگەیەکوێ؟ بە کورتی تۆکێی و چی؟

- من سەرسامم بەتۆ.بۆخۆت دەزانی کە من لەڕشتەی زانستی سرووشتیدا کاردەکەم.بەڵام ئەوەی کەمن کێم...

- بەڵێ،تۆکێی؟

- پێشتریش پێمگوتبووی کە لەداهاتوو لە یەکێك لەشارەکان کاری پزیشکی دەکەم.

ئاناسرگیۆنا عەجولانە گوتی:

- من ناتوانم ئەوقسەیەت لێ وەربگرم.بۆخۆت بڕوات بەشتێك نییە کە هەرئێستا گوتت...ئەگەر ئارکادی ئەوقسەیەی کردبا تا ڕادەیەك دەکرا باوەڕی پێبکەی.بەڵام بەتۆ نا.

- بۆچی ئارکادی...

- خۆت مەدزەوە،چۆن تۆ دەتوانی بە کارێکی وا دواکەوتوانە ڕازی بی؟ چەندان جار نەتگوتووە کە زانستی پزیشکی لەلای تۆ هیچ گرنگیەکی نییە؟ ئێستا چۆنە بەو لەخۆباییەوە دەتەوێ لە یەکێك لە شارەکان کاری پزیشکی بکەی؟ من بەڵگەی شێوازی وەڵامدانەوەکەت دەزانم.تۆ ئەو وەڵامە دەدەیتەوە چوونکە دەتەوێ لەکۆڵ خۆتم کەیەوە.تۆ بڕوات بەمن نییە.بەڵام یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ بزانە کەمن و تۆ دەتوانین تێك بگەین.ئاخرمنیش ڕۆژگارێك وەك تۆ هەژارو لەخۆبایی بووم.منیش ئەو قۆناغەسەختانەی تۆم تێپەڕاندوون.

- ئەوانە ئەزموونی باش و بەنرخن...بەڵام ئاناسرگیۆنا داوای لێبووردن دەکەم کە ناتوانم لەبارەی خۆمەوە قسەبکەم.من هیچ کات ئەوخووەم نەبووە.سەرەڕای ئەوەش مەودایەك لەنێوان من و تۆدا هەیە...

- چ نێوانێك؟ ڕەنگە بڵێی من بەشێك لەچینی خانەدانانم.یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ تکات لێدەکەم ئەو وشەیە دووبارە مەکەوە.دەڵێی تاپێت بسەلمێنم کە...

بازارۆف نەیهێشت قسەکەی تەواوبکات:

- جگە لەوەش،ئەوە چ کارێکە مرۆڤ دابنیشێ و بڕیار لە ئایندەی بدات؟ ئەویش ئایندەیەك کە هێندە لەدەستەلاتی خۆماندا نەبێت.ئەگەر توانیت کاربکەی چ باشترو ئەگەر نەشتتوانی ئیدی نیگەران نی کە دانیشتووی و قسەی حەلالەق مەللەق لەدوای یەك ڕیزدەکەی.

- تۆ هەمیشە گفتوگۆی دۆستانە بەقسەی بێ سەرەوبەر لێکدەدەیەوە؟ یان لەبەر ئەوەی ژنم گفتوگۆ لەگەڵ مندا بەوشێوەیە لێك دەدەیەوە؟ یان ئەوەیە تۆ هەمووماں بەسووك دەزانی؟

- ئاناسرگیۆنا،باش دەزانی کە من نییەتی سووکایەتیم نییە بەرامبەر بەتۆ.

- نا،من هیچ شتێك نازانم...زۆرباشە،دەمزانی تۆ ناتەوێ هیچ لە ڕابردووی خۆت بلێی.بەڵام گۆڕانکاریەکانت...

- گۆڕانکاریەکان؟...بەشێوەیەك قسەدەکەی کە دەڵێی من حکومەتێکم یان وڵاتێکم!بەهەرحاڵ ئەوەش ناتوانێ بابەتێکی سەرنجڕاکێش بێ.سەرەڕای ئەوەش بۆچما مرۆڤ دەتوانێ بە دەنگی بەرز بڵێ کە لەچ دۆخێکدایە.؟

- من تێناگەم کەچۆن مرۆڤێك نەتوانێ ڕازی دڵی خۆی بڵێ.

- تۆ دەتوانی ئەوەبکەی؟

ئانا دوای کەمێك بێدەنگی وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ،دەتوانم.

بازارۆف سەری نەویکردوو گوتی:

- کەوایە تۆ زۆر لەمن خۆشبەختتری.

ئاناسرگیۆنا نیگا پرلەپرسیارەکەی لێبڕی و گوتی:

- چۆنت پێخۆشە.بەڵام شتێکم پێدەڵێی کە ئێمەبێ هۆ لێك نزیك نەبووینەوەو لە ئایندەشدا دەتوانین دووهاوڕێی باشبین بۆ یەکتری. دڵنیام کە سەرەنجام ئەو کەللەڕەقی و کینەیەت لەناو دەچێ.

- تۆ چ کەللەڕەقییەکت لەمندا دیووە...چیدیکەشت گوت؟..کینە؟

- بەڵێ.

بازارۆف لەشوێنی خۆی هەستاو چووە بەرپەنجەرە.

- تۆ زۆرت پێخۆشە هۆکاری ئەو کینەو ئاڵوگۆڕە دەروونیانەی من بزانی؟

ئادینسۆڤا بەترسێکی لە ڕادەبەدەر گوتی:

- بەڵێ.

- تووڕەش نابی؟

- نەخێر.

بازارۆف هەروا کەپشتی تێکردبوو گوتی:

- نا،ئێستا کە بۆخۆت حەزدەکەی هەمووشتێکت پێدەڵێم...هۆکارەکەی ئەوەیە کەوەك شێتان خۆشمدەوێی...ئەویش هەمان ئەو ڕازەیە کە تۆ هێندەحەز بەبیستنی دەکەی...

ئادینسۆڤا دەستی بۆلای درێژکرد بەلاّم بازارۆف سەری وەشووشەی پەنجەرەکە کردبوو.هەناسە بڕکەی بوو.تەواوی لەشی دەلەرزی.ئەو لەرزینە لە ئەنجامی کەم ڕوویی یان شیرینی یەك ئیعتیراف نەبوو.ئەولەرزینە لەئەنجامی هەوەسێکی بەهێزەوەبوو.شەهوەتێك کەوەك تووڕەیی نەدەچوو ڕەنگە لێشی نزیکبووبێ.

ئادینسۆڤا هەم ترساو هەم دلّیشی بە بازارۆف سووتا:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ.

دەنگی پڕبوو لەخۆشەویستی.بازارۆف وەرسووڕا.نیگا پڕلە هەوەسەکانی خۆی تێگرت.دەستەکانی ئاناسرگیۆنای گرتن و لەئامێزی گرت.ئادینسۆڤا خۆی لەئامێزی نەکێشایەوە بەلاّم دوای ماوەیەك لە گۆشەیەك وەستاو لە بازارۆفەوە ڕاما.بازارۆف دووبارە بەرەولای ڕۆیشتەوە...ئادینسۆڤا بەسەرسامییەوە گوتی:

- تۆ لەمەبەستی من نەگەیشتووی؟

وا دەهاتەبەرچاو کە ئەگەر بازارۆف هەنگاوێکی دیکەچووباپێش ئاناسرگیۆنا دەیقیژاند...بازارۆف لێوی خۆی گەزت و چووە دەرەوە.دوای نیوکاتژمێر خزمەتکارەکە نووسراوێکی بازارۆفی دایە دەستی ئاناسرگیۆنا کە لێی نووسرابوو: (هەرئەمڕۆبڕۆم یان دەتوانم تاسبەی لێرەوەمێنم؟)

ئاناسرگیۆنا وەلاّمی دایەوە: (بۆچما چی ڕوویداوە کە دەتەوێ بڕۆی.من نەمتوانی لەمەستی تۆ تێبگەم و تۆش نەتتوانی لەمەبەستی من بگەی.)

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- من لەمەستی خۆیشم تێناگەم.

تا کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ ئادینسۆڤا لە ژوورەکەی نەهاتەدەر.دەستی لەپشتەوە گرێدابوون و لە ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد.هەندێجار لەبەرپەنجەرە ڕادەوەستاو هەندێجاریش لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا لەخۆی ڕادەما دەسماڵەکەی بەگەردنی و ئەوشوێنانەدا دێنا کە دەزوورانەوە،لەخۆی پرسی:

- چ شتێك وای لێکردم تا ڕازی ئەو بزانم.بۆ مەگەر ئەوەم نەدەزانی.خەتاباری سەرەکی خۆمم.دەبوایە پێشتر پێشبینی هەمووشتێکم کردبا.

بیرکردنەوەکانی لێکدەدانەوە کاتێك رووخساری شێتانەی بازارۆفی لەکاتی شالاّو هێنانیدا هاتەوەیاد،ڕەنگی سوورهەڵگەڕاو لەناکاو هاواریکرد:

- ڕەنگە...

دووبارە لەبەر ئاوێنە ڕاوەستاو بەسەر ڕاوەشاندن پرچەکانی هەڵدانەوە.لە ئاوێنەکەدا لەخۆی ڕاما.دەتگوت لینگەوقوچ بووە و خەندەکەی شتێکی پێدەگوت کەخۆیشی لەبیستنی شەرمی دەکرد.

سەرەنجام لەبەرخۆیەوە گوتی:

- نا،خوا باشتردەزانێ کە ئەوجۆرە کارانە دەشێ لە کۆتاییدا بەکوێ بگەن.نابێ گەمە لەگەڵ ئەوجۆرە کارانەدا بکرێ.لە دنیادا هیچ شتێك لەدان بەخۆداگرتن باشترنییە.

هەر هێمن بوو.بەلاّم خەمگین بوو تەنانەت جارێك بێ ئەوەی بۆخۆشی هۆکارەکەی بزانێ چەند دڵۆپ فرمێسك لەچاوەکانییەوە ڕژان.فرمێسکی نەدەهات چوونکە بێ ڕێزی پێکرابوو،بۆیە خۆی بەسووکایەتی پێکراو نەدەهاتەبەرچاو.فرمێسکی دەرشت چوونکە خۆی بەخەتابار دەزانی کە نەیتوانیبوو هەستێکی نادیار لەدەروونی خۆیدا کپبکاتەوە.دەیدیت کە شتگەلێکی تازە لە ژیانیدا بەڕێوەن و هەست کردن بەو ژیانە زووتێپەڕەو دەبێ کەڵکیان لێوەربگرێ،کەناخی داگرتووە.لە ژێرکاریگەری ئەو بیرکردنەوەی خۆیدا گەیشتبووە قۆناغێکی هەستیارو پڕلە نهێنی،کە سەیری دەرەنجامەکەی دەکرد شتێکی بێجگە لە بۆشایی...ناشرینی و پەستی و...نەدەدیت.

## (١٩)

هەرچەندە ئادینسۆڤا بەسەرخۆیدا زاڵببو، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ جۆرە دەمارگیرییەکی نەبوو سەرەڕای ئەوانەش لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا نیگەران دەهاتەبەرچاو،نانخواردن بێ هیچ کێشەیەك پێپەڕی.پلاتۆنیچ گەیشتبۆوەو چەند نووکتەیەکی خۆشی گێڕانەوە.ئەو کە تازە لەشار گەڕابۆوە،ئەوباس و خواسانەی دەگێڕانەوە گوتی قایمقام فەرمانی بە پشکێنەرە تایبەتەکانی خۆیداوە کە هەرکاتێك بەسواری بەفەرمانێك دەردەچن حەتمەن دەبێ مامزەش ببەستن.ئارکادی بەهێمنی لەگەڵ کاتیا دەدواو بەتەوسەوە بەتیلە نیگایەك سەیرێکی پوورەخاتوونی کرد.بازارۆف کەوتبووە بێدەنگیەکی قوڵەوە.ئادینسۆڤا دووجار ڕاستەو ڕاست لەڕووخساری تووڕەو تۆسنییەوە ڕاما.لەقیافەیدا سووکایەتی دەخوێندەوەو لەبەرخۆیەوە گوتی:

- نا،نا،نا...

دوای نیوەڕۆ ئادینسۆڤا وێڕای ئەوانیدیکە چووە ناو باخەکەو کاتێك دیتی بازارۆف نیازی قسەکردنی هەیە،چەند هەنگاوێك کشایەوەو ڕاوەستا.بازارۆف بێ ئەوەی سەرهەڵبڕێ لێی نزیك کەوتەوەو گوتی:

- ئاناسرگیۆنا من زۆر بەداخەوەم.تۆ بەڕاستی لێم ڕەنجاوی.

ئانا وەڵامی دایەوە:

- نەخێر،یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ،من دڵم لێت نەڕەنجاوە،بەڵکو منیش بەداخەوەم.

- ئیدی خراپتر.پێموایە بەئەندازەی پێویست تەمبێ بووم.حەتمەن قبوڵتە ئەوکارەی من کردم زۆر گەمژانەبوو.تۆ نووسیوتە کە بۆچی بڕۆی؟! من ئیتر ناتوانم لێرەوەمێنم.سبەی دەڕۆم.

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ،بۆچی تۆ...

- دەڵێی بۆچی دەمەوێ بڕۆم؟

- نا،نیازم نەبوو وا بڵێم.

- ئاناسرگیۆنا،تیر کەلەکەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە...بەهەرحاڵ ئەوشتانە ڕوودەدەن و منیش دەبــێ بڕۆم.تــەنیا لەحاڵێکــدا دەمتــوانی لێرەوەمێنم.منــت لەبــەر ڕووقایمیەکــە مــەوە دەبەخشی.تۆمنت خۆشناوێ.؟

تیشکێك لەچاوەکانی بازارۆفەوە هەڵبوو.ئاناسرگیۆنا بێ وەلاٌمدانــەوە ئــەوەی بەمێشــکدا هات:

- من لەوپیاوە دەترسم.

بازارۆف دەتگوت بیری ئەوی خوێندۆتەوە.ماڵئاوایی لێکـردو گەڕایــەوە ماڵێ.ئادینســۆڤا چەند هەنگاوێك وەدوای کەوت و پاشان بانگی کاتیای کرد.قـۆڵی لــە قـۆڵی ڕاکـردو تــا گــە یشتنەوە ماڵێ لێی جیانەبۆوە.لە ماڵێش دەستی لەوەرەقەی یاری نەدا.لە هەمووکاتێك زیــاتر پێدەکەنی.پێکــەنینێك کــە لەگــەڵ رووخســاری ڕەنــگ پــەڕیوی نەدەهاتــەوە.ئارکادی وەدوای دەکەوت و بەردەوام لەخۆی دەپرسی:

- یانی چی؟ بۆچی ئەوکارانە دەکات؟

بازارۆف چووە ژوورەکەی و تا کاتی چایخواردنەوە لەژوورێ خۆی زیندانی کرد.ئاناســرگیۆنا مەبەســتی بــوو قســەی خۆشــی لەگەڵــدابکات بــەلاٌم نەیــدەزانی لــە کوێــوە دەســت پێبکات...سەرەنجام شتێکی چاوەڕوان نەکراو لەو کەڵکەڵەیەی ڕزگارکرد.خزمەتکارەکە هاتنی سیتنیکۆفی ڕاگەیاند.سەختە بتوانی ڕەفتارو غــاردان و هاتنــەژوورەوەی باســبکەی کــە بــەچ چووست و چــالاکیەك خــۆی بەژوورێداکرد.بــەپێی ئەوهەوالاٌنــەی بلاٌوببوونــەوە زانیبــووی کــە هاوڕێکانی میوانی ئاناسرگیۆنان و هەربۆیە ئەو گەنجە پێشکەوتووخوازە بڕیــاری دابــوو خــۆی بگەیەنێتە گوندی ئەو ژنەی کە نەزۆرباش دەیناسی و نە بانگهێشتیشی کردبوو.بۆیــە هەرکــە گەیشت نیگەران دیاربوو.پێشترچەند ڕستەیەکی لێبووردنی ئامادەکردبوون بەلاٌم هــەموویانی لەبیرچووبوونەوە تەنیا چەند ڕستەیەکی بێ سەروبەری دەکردن لەوانە (یۆدڤ کسیا ناردوویەتی تا لەهەواڵی ئاناسرگیۆنا ئاگاداربێ) یان (ئارکادی نیکۆلاٌیۆڤیچ بــۆی باســکردبوو کــە...) بــەلاٌم کەوتە پرتەپرت و هێندە دەستەپاچەببوو تــا لەســەر کلاٌوەکــەی خــۆی دانیشت.بەپێچــەوانەی ئەوەی بــیری لێــدەکردەوە کــەس ڕووی لێوەرنــەگێڕاو هــەتا ئاناســرگیۆنا بــەکاتیاو پووریشــی ناساند.زۆر زوو سیتنیکۆف حاڵەتی ئاسایی خۆی وەرگرتەوەو چەنەی لێدا.ســەرهەڵدانی شــتی بێ بەهاو خۆبەکەم زانین لەژیانی مرۆڤدا،هەندێجار نەك زیــان بــەخش نییــە بــەڵکو دەتــوزانێ

ســوودمەندبێ.دەتوانێ مێشــکی نیگــەران و مانــدوو هێوربکاتــەوەو دەشــتوانێ هەســتی لەدەستدانی متمانەش دووبارە بگێڕێتەوە.یانی تێدەگەین کەخۆبەکەم زانین و خۆپەرستی یەك ڕیشەیان هەیە.لەگەڵ گەیشتنی سیتنیکۆف دەتگوت ڕق و کینەکان نەماون و هەمووشتێك گەڕاوەتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.هەتا هەموان زیاد لەپێویست نانیانخواردو نیوکاتژمێر درەنگتر لە هەموو شەوان بۆ نووستن چوونە ژوورەکانیان.کاتی نووستن ئارکادی بە بازارۆفی گوت کە خەریکی جل دانان بوو:

- ئێستا دەتوانم ئەوقسەیەی ڕۆژێك پێتگوتم بەخۆتی بلێمەوە: (بۆهێنەدە خەمگینی،ناکا کەتنێکت کردبێ؟)

ماوەیەکبوو ئەو دووهاوڕێیە تانەوپلاریان لێکدەدا کە نیشاندەری نێوان ناخۆشییان بوو.

بازارۆف گوتی:

- بەیانی دەچمەوە لای باوکم.

ئارکادی ئانیشکی دادا.هەم پێی سەیربوو هەم نەشیدەزانی بۆچی خۆشحاڵە.

- هۆکاری خەمگینی تۆ ئەوەیە؟

بازارۆف باوێشکێکی داوگوتی:

- چ پێویست دەکا هەمووشتێك بزانی؟مرۆڤ کاتێك زۆری زانی زووپیردەبێ.

- ئاناسرگێۆنا چ لێدەکەی؟

- تێناگەم دەڵێی چی؟

- مەبەستم ئەوەیە لێدەگەڕێ بڕۆی؟

- من کرێکارو بەندەی هیچ کەس نیم.

ئارکادی کەوتە بیرکردنەوەو بازارۆفیش پشتی تێکردو ڕووی لەدیوارەکە کردو درێژبوو.چەند دەقیقەیەك بێدەنگ مانەوە ئارکادی لەناکاو بەدەنگی بەرزگوتی:

- یۆگینی!

- بەڵێ؟

- منیش سبەی لەگەڵت دێم.

بازارۆف قسەی نەکرد.

- بەڵام من دەچمەوە ماڵێ.تاگوندی....بە یەکەوە دەبین.لەوێ تۆ ئەو ئەسپانەی پێوستتن لە (فیدۆت) یان وەردەگری.زۆرم حەزدەکرد ماڵەوەتان ببینم.بەڵام دەترسم تۆش و ئەوانیش نارەحەت بکەم...تۆ دووبارە دێیەوەلامان.

بازارۆف بێ ئەوەی ڕووی وەرگێڕێ،وەڵامی دایەوە:

- کەلوپەلەکانم لەماڵی ئێوەن.

ئارکادی لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:

- بۆچی ناپرسێ کە منیش دەڕۆم...ڕاستی بۆچی دەڕۆم...بۆچی ئەودەڕوات؟...

ئارکادی وەڵامێکی بۆپرسیارەکەی خۆی نەدیتەوە.دڵی توند دەبوو.هەستی دەکرد ناتوانێ لەو ژیانەی تائەو ڕادەیەی خووی پێوە گرتووە لێی جیابێتەوە.بەڵام مانەوەشی بەتەنێ بەکارێکی سەیردەزانی.

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- چ شتێك لەنێوان ئەوانەدا ڕوویداوە؟ بۆ دەبێ دوای ڕۆیشتنی بازارۆف،وەکو دڕوویەك بچمەچاوی ئادینسۆڤاوە؟ حەتمەن ئەگەر بازارۆف لێرەنەمێنێ حەوسەلەی منی نامێنێ و ئەوەش بەمانای نەمانی دوائومێدیە.

لەوکاتەدا ڕووخساری جوانی ئاناسرگیۆنای لەبەرچاوان دەرکەوت.ئارکادی دەمی خستەسەرسەرینەکە کە چەند لۆپە فرمێسکێکی لەسەر ڕژابوون بەورتەوە گوتی:

- حەیف بۆکاتیا.

پاشان سەری بەرزکردەوەو بەدەنگێکی بەرزگوتی:

- ئەو سیتنیکۆفە گەمژەیەیە بۆتەشریفی ناموبارەکی هێناوەتە ئێرە؟

بازارۆف لەسەرجێگا خۆی وەرسووڕاندو گوتی:

- دەبینم هێشتاش گەمژەی.بوونی نموونەی وەکوسیتنیکۆف بۆ ئێمە پێویستن.ئەوەم لێوەربگرە.خۆناکرێ خوداکان بەکاری قوڕەکاریەوە خەریکبن.ئێمەپێویستی زۆرمان بەوبێ مێشکانە هەیە.

ئارکادی لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:

- ئاوا!...من و تۆش لەوخودایانەین.یانی تۆخودای و منیش حەتمەن حەیوانێکم!

بۆ یەکەمجار لەخۆبایی و خۆپەرستی بازارۆفی هێنایە بەرچاوی خۆی.بازارۆف بە تووڕەییەوە دووبارەی کردەوە:

- بەڵێ،تۆهێشتاش زۆرگەمژەی.

بۆ بەیانی ئارکادی بەخاوەن ماڵی گوت کە ئەویش لەگەڵ بازارۆفدا دەڕوات،ئاناسرگیۆنا هیچ پێی سەیرنەبوو تەنیا ماندوو و پەرێشان دەهاتەبەرچاو.

کاتیا تەنیا نیگایەکی بێدەنگ بەلاّم پڕمانای لێکردو پوورەخاتوون لە ژێرجلکەکانییەوە کە کەس ئاگای لێنەبێ نیشانەی خاچی کێشا بەلاّم ئارکادی ئاگای لێبوو.سیتنیکۆف شێواو پەرێشان بوو.جلکێکی نوێی بۆیەکەمجار لەبەر کردبوو بۆنانخواردنی قاوەڵتی هاتبوو،بۆ ڕۆژی دوای هاتنی هاوڕێکانی نیازی ڕۆیشتنیان هەبوو،لە کاتێکدا ئەو هێندەی جلك و بەرگ هێنابوون کە شەوی پێشێ خزمەتکارەکە لەو هەموو جلك و بەرگە سەری سووڕمابوو.چەند هەنگاوێك چووەپێش.وەکو نێچیرێك کە ڕاوچی لەبەرامبەر خۆیدا دیبێ شڵەژاو گوتی منیش دەڕۆم.ئادینسۆڤاش داوای نەکرد وەمێنێ.گەنجەبێ بەدبەختەکە گەڕایەوەلای ئارکادی و گوتی:

- گالیسکەکەی من زۆرباش و فراوانە.تۆ دەتوانی لەگەڵ من بێی یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچیش بە گالیسکەکەی تۆبێت.ڕەنگە واباشتربێ.

- لوتفت هەیە.بەلاّم ڕێگای من لەگەڵ ڕێگای تۆ یەك ناگرێتەوە.ئەوشوێنەی من بۆیدەچم بۆ ئەو شوێنەی تۆ بۆیدەچی نێواانیان یەکجار زۆرە.

- هیچ گرنگ نییە.من کاتم زۆرە.جگەلەوەش لەو دەورووبەرانە کارم هەیە دەبێ هەربچم.

بازارۆف بەئاشکرا سووکایەتی پێکرد:

- بێگومان ئەوکارانەی پەیوەندیان بەملکانەوەهەیە؟

بەلاّم سیتنیکۆف هێندە سەرقاڵبوو کە بەپێچەوانە بزەی نەهاتێ و دووبارە داوایکردەوە:

- دڵنیاتان دەکەم کە گالیسکەکەم زۆرباش و ئاسوودەیەو جێگای تەواوی هەیە.

ئادینسۆڤا گوتی:

- باش نییە سیتنیکۆف بڕەنجێنن.

ئارکادی گەڕایەوەو ئیکلامێکی کێشا.میوانەکان دوای چایخواردنەوە وەڕێکەوتن.ئادینسۆڤا لە حاڵێکدا دەستی ماڵئاوایی بۆلای بازارۆف درێژ دەکرد گوتی:

- ئێمە دووبارە یەکتر دەبینینەوە،وانییە؟

- هەرچۆنێك تۆپێت باشبێ.

- کەوایە دووبارە یەکتر دەبینینەوە.

ئارکـــادی لـــەپێش هەموانـــەوە دەڕۆیشـــت و لـــە گالیســـکەکەی ســـیتنیکۆفدا دانیشـــت.خزمەتکارەکە بەوپـــەڕی ڕێـــزەوە یارمەتیـــدا تـــا دابنیشـــێ بـــەلاّم ئـــەو لەبەرامبەرداحەزیدەکرد زللەیەکی قـایم لـە قـەپۆزی خزمەتکارەکـە سـرەوێنێ یـان هۆڕهـۆر بگریت.بـازارۆف لـە گالیسـکەکەی دیکەسـواربوو.کاتێك گەیشـتنە گونـدێك..ئارکادی چاوەڕوانبوو تا فدۆت ئەسپەکان بگۆڕێ و پاشان چووەلای ئەو گالیسکەیەی کە بازارۆف تێیـدا دانیشتبوو بە هاوڕێکەی گوت:

- یۆگینی لەگەڵ خۆتم بەرە.دەمەوێ بێمەماڵی ئێوە.

بازارۆف لەسەرخۆگوتی:

- سەرکەوە.

سیتنیکۆف کە فیتووی لێدەداو بەدەوری گالیسکە جوانەکەیـدا هەڵدەسـووڕا لـە بیسـتنی ئەوقسە یە سەری سووڕما.ئارکادی بەوپەڕی ئارامییەوە ئەسپەکانی خۆی لە گالیسکەکەی ئەو بـۆ گالیسـکەکەی دیکـە گواسـتنەوەو بەوپـەڕی ڕێـزەوە بـۆ هـاو سـەفەرەکەی دەسـتی بەسنگیەوەنا.پاشان لەلای بازارۆف دانیشت و گوتی:

- بڕۆ.

گالیسکەکەی ئەوان وەڕێکەوت و بەزوویی لە بەر چاوان ونبوو.سـیتنیکۆف کـە بەتـەواوی دەستەپاچەببوو سەیرێکی گالیسکەچـییەکەی کرد.گالیسکەچـی قامچـی ڕاوەشـاندە ئەسـپی تازەنەفەس.سـیتنیکۆف سـەیرێکی نـاو گالیسـکەکەی کـرد ئـەودوو ڕەعیەتـەی کـە لـەوێ ڕاوەستابوون جنێوێکی داوهاواریکرد:

- گەمژەینە کلاّوەکانتان لەسەرنێنەوە.

چوونەوەشار.زۆر درەنگ گەیشتنەوە ماڵێ لەپێشدا چوو بۆ ماڵی کوکشـیناو لـەلای ئـەو، دووهاورێ بێ ڕەوشتەکەی وەبەرجنێواندا.

ئارکادی هەرکە لە تەنیشت بازارۆف دانیشت،دەستی گوشـی و قسـەی نـەکرد.بازارۆفیش دەتگـوت مانـای ئەودەسـت گوشینەدەزانێ.شـەوی پێشـێ نەخـەوتبوو نەجگەرەیەکیشـی کێشـابوو.جگەلەوەش لـەو چـەند ڕۆژەی دواییـدا ئیشـتیای خـواردنی نەمابوو.لەلاڕاولـەبن

کلاوەکەیەوە ڕەزاگران و کز دەهاتە بەرچاو.دوای ماوەیەکی زۆربێدەنگی،سەرەنجام بازارۆف وەقسەهات و گوتی:

- زۆرباشە هاوڕێ،جگەرەیەکم بدەیە...جوان سەیرکە بزانە زمانم زەردنەبووە؟

- بەڵێ،زەردبووە.

- بەڵێ...لەخۆڕانییە کەجگەرەتامێ نادا.دەڵێی نەخۆشم.

- تۆ لەو دواییانەدا زۆرگۆڕاوی.

- گرنگ نییە.باش دەبم.تەنیا شتێك نیگەرانی کردووم ئەویش دڵناسکی دایکمە.ئەگەر ڕۆژێ چەند جارنانی نەخواردبا تا ئێستا مردبوو.بەڵام هێندە نیگەرانی باوکم نیم.ئەو پیاوێکی بەئەزموونە تاڵ و سوێری زۆری چێشتوون.

پاشان  درێژەیدایە:

- نا،جگەرەش بەکەڵك نایە.

ئەوەی گوت و فڕێیدایە ناو  تەپوتۆزی جادەکەوە.

ئارکادی پرسی:

- تا گوندەکەی ئێوە بیست و پێنج  کیلۆمەتر نابێ؟

بازارۆف بەسەر لەقاندن رووی لە گالیسکەچییەکە کرد کە کرێکاری فدۆڤ بوو گوتی:

- بیست و پێنج کیلۆمەتر؟ لەوفەیلەسووفەی بپرسە.

بەڵام کابرای فەیلەسووف بە ڕاوێژێکی پچڕپچڕەوە گوتی:

- خودا باشتردەزانێ.کیلۆمەترەکانی ئێرە ئەندازەی درووست و ڕێکوپێکیان نییە.

دە ئەسپەکانی ڕاخوڕی کە بۆ لەخۆڕا مل بەرز دەکەنەوە.

بازارۆف لە ناکاو گوتی:

- بەڵێ،هاوڕێی ئازیز.با ئەوە بۆتۆ  دەرسێکی گەورەبێ...هەرکەسەو بە سەرەداوێکەوە هەڵواسراوە، هەر لەحزەیەك مومکینە لێیبێتەوە.بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدا خۆشییەکی تازە لەخۆیدا وەبینێ و ئەوەی کەهەیە خراپتری بکات.

ئارکادی گوتی:

- لە مەبەستت تێناگەم.

- مەبەستێکی دیاری کراوم نیە.جگە لەوەی دەمەوێ بڵێم ڕەفتاری من و تـۆ زۆرگەمژانــە بووە...بەڵێ لەو بارەیەوە گومانم نییە.بەڵام من لەدەرمانخانە دیتوومە ئەوانەی کە لەنەخۆشی خۆیان تووڕەن حەتمەن چاك دەبنەوە.

- دووبارە لە مەبەستت تێناگەم. ئیدی قەرارنەبوو تۆ گلەیی و گازندەت هەبێ.

- ئێستا ڕاشکاوانەتر پێتدەڵێم.بە بڕوای من باشترە مرۆڤ لەشاخی بەردان هەڵکەنێ بەڵام ڕێگە نەدا ژنێك هەتا بە ئەندازەی دەرزییەك بەسەریدا زاڵبێ.هەمووئەوقسانە...

بازارۆف دەویست وشەی ڕۆمانسی بەکاربێنێ بەڵام پەشیمان بۆوەو لە جیاتیان گوتی:

- گاڵتەجاڕیە.ڕەنگە تۆ قسەکانی منت قبووڵ نـەبن بـەڵام پێتـدەڵێم کـە ئێمـە لـەکۆڕی ژناندابووین و خۆشمان بۆگوزەرا.بەڵام وازهێنان لەوجۆرەجێگایانە ڕێـك وەك ئەوەوایـە ئـاوێکی ساردت پێداکەن لە ڕۆژێکـی زۆرگەرمـدا.پیاو نـابێ هـەرگیز خـۆی بەوجۆەشـتانەوە سـەرقاڵ بکا.وتەیەکی بەناوبانگی بێگانەهەیە دەڵێ: (پیاونابێ دەستەمۆبێ.)

پاشان رووی لە گالیسکە چییەکە کردو گوتی:

- تۆ فەیلەسوفێکی،بزانم ژنت هەیە.؟

کابرای دێهاتی رووخسارە پانوچاوە خڕەکانی بۆلای دووهاوڕێکە وەرگێڕاو گوتی:

- ژن،بەڵێ هەمە.چۆندەکرێ نەمبێ؟

- دارکاری دەکەی؟

- هەرکاتێك پێویست بکات.بەڵام لەخۆڕا لێی نادەم.

- کارێکی باش دەکەی،بزانین ئەویش لەتۆ دەدات.

کابرای لادێیی هەوساری ڕاکێشاو گوتی:

- قسەی سەیردەکەی ئاغا،دەڵێی پێم ڕادەبوێری...

وادەهاتەبەرچاو کابرای دێهاتی نیگەران بووبێ.بازارۆف دووبارە گوتی:

- گوێت لێیە ئارکادی نیکۆلاێۆڤیچ...بەڵام ئەوان لە ئێمەیانداو ئەوەش دەرەنجامەکەی.

ئارکـادی بەزۆرپێکەنی.بـەڵام بـازارۆف رووی وەرگێـڕاو لــە تــەواوی ڕێگــادا قســەیەکی نەکرد.بیست و پێنج کیلۆمەتر بەلای ئارکادییەوە پەنجا کیلۆمەتربوو.بەرەبەرە لەسەرەو ژێـری گردێکەوە سەروکەڵلەی گوندی باوکی بازارۆف دەرکەوت.لە ناوبێشـەڵانێکی قـەراخ گوندەکـە

باڵەخانەیەك بەسەربانی گڵەوە دەركەوت.لە بەرامبەر یەكەم كۆڵێتدا دوو دێهاتی ڕاوەستابوون و هەرایان بوو.

- تۆ بەرازێكی گەورەی بەڵام لەبێچوە بەرازێك پیستری.

ئەوەی دیكەشیان وەڵامی دایەوە:

- ژنەكەی تۆش جادووگەرە.

بازارۆف بە ئاركادی گوت:

- ئازادی گوتاریان ئەوە نیشاندەدا كە ڕەعیەتەكانی باوكم هێندە پابەندی بەندوباونین...سەیركە،ئەوەش باوكمە لەماڵ دێتەدەر.دیارە گوێی لە دەنگی زەنگەكە بووە.بەڵێ،خۆیەتی،ناسیمەوە.بەڵام بۆ هێندە مووەكانی سپی بوونە!.

## (٢٠)

بـازارۆف سـەری لـە گالیسـکەکە هێنـادەرو ئارکـادیش لـەدوای هاورێکـەی ملـی هێنادەر،لـەپێش ماڵێك،پیـاوێکی باڵابـەرزی کـزی قژسـپی و تێـك ئاڵقـاو و لـووت درێـژ کەچـاکەتێکی کـۆنی سـەربازی لـە بـەردابوو،لینگی لـێ ئـاوالاکردبوون و ڕاوەسـتابوو.پیاوە سەبیلەی دەکێشاو بۆ ئەوەی بـەر بەتیشـکی خـۆر بگـرێ چـاوەکانی نووقاندبوون.ئەسـپەکان ڕاوەستان.باوکی بازارۆف کە هێشتاپەنجەی بە ناو سەبیلەکەدا دێنا بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- ئاخرەکەی هات.زووتر وەرەخوارێ تا یەکتر ماچ بکەین.

هەرکە باوك و کوڕ یەکتریان لە ئامێزگرتبوو،دەنگی ناسکی ژنێکیش هاتە بەرگوێ:

- نیۆشا...نیۆشا...

دوای ئەوە دەرگا کرایەوەو پیرەژنێکی کورتەباڵاو قەڵەو کە کراسێکی گوڵداری لەبەر دابوو کلاوێکی تەنکی سپی لەسەربوو هاتەدەر.پیرەژن قیژەیـەکی کـرد.زۆری نـەمابوو بکـەوێ کـە بازارۆف گرتییەوە.دەستەخەپەتۆڵەکانی پیرەژن لەملی بازارۆف هاڵان و سەری بەسنگی تاقانـە کوڕەکەیەوەنا.دەنگە دەنگـەکان لـە ناکـاو نـەمان تـەنیا دەنگـی هەنسـکی گریـانی دایکـە دەبیسترا.بازارۆفی پیر ناوچەوانی تێکناو گوتی:

- ئاریشا لێوەبرە.

پاشان سەیرێکی ئارکادی کرد کە هەروا بە بێدەنگی لە تەنیشت گالیسـکەکە ڕاوەسـتابوو سەیری دەکردن (گالیسکەچییەکەش رووی خۆی وەرگێڕابوو) دووبارەی کردەوە:

- ئاریشا تکات لێدەکەم بەسە.

پیرەژن وەلامی دایەوە:

- چۆن وازبێنم ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ.دوای تەمەنێك کوڕەکەم دیتۆتەوەو...

بێ ئەوەی دەست لە ملـی بـازارۆف بکێشێتەوە،رووخسـارەپڕلە گـنج و لۆچەکـەی خـۆی کێشایەوەو بەشەوق و زەوقەوە لە ڕووخساری کوڕەکەیەوە ڕاماو دووبارە لە باوەشیگرتەوە.

بازارۆفی پیر بەهێمنی گوتی:

- هەقی خۆتە بەڵام واباشترە بچیەژووریٚ.سەیرکە یۆگینی بەتەنیٚ نییە.میوانی هەیە.
پاشان بەرەولای ئارکادی ڕۆیشت و بەنیشانەی ڕێزپێلاٚوەکانی جووتکردن و گوتی:
- بمانبوورە.تۆ دەزانی ژن بیٚ غیرەتن،دلٚی دایکیش...
لێووبرۆو چەناگەی پیرەمێرد دەلەرزین،بەلاٚم هەولێدەدا بەسەرخۆیدا زالٚبیٚ.ئارکادیش دەستی بۆ بەسنگیەوەنا.سەرەنجام بازارۆفی گەنج گوتی:
- بەلٚیٚ،دایەگیان ئیدی بەسە...
دایکی لەگەلٚ خۆی بردەوەژووریٚ و لەسەر کورسییەکی داناو دووبارە چۆوەلای باوکی و لە باوەشیگرتەوە،ئارکادی پێناساند.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ گوتی:
- لە دیتنتان زۆرخۆشحالٚم.هیوادارم بمانبووری.ئاریناڤلاسۆنا تکات لێدەکەم وازبێنە.بوویە مایەی نیگەرانی میوانەکەمان.
پیرەژن بە گریانەوە گوتی:
- تکایە دەتوانم ناوو ناوبانگتان بپرسم؟
ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بە دەنگێکی ڕەوان ناساندی:
- ئارکادی نیکۆلاٚیۆڤیچ.
پیرەژن گەرووی پاککردەوەو پاشان چاوەکانی سڕینەوەو گوتی:
- هیوادارم بە هۆی گەمژەییمەوە بمبووری...پێموابوو ئیدی بەر لەوەی کوڕەکەم بگەڕێتەوە دەمرم و هیچ کات نایبینمەوە...
ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ نەیهێشت قسەکەی تەواوبکات  گوتی:
- بەلاٚم ئاخیرەکەی بەئاواتی خۆت گەیشتی.
کیژۆلٚەیەکی سێزدەسالٚەی پێخواس کە کراسێکی گولٚداری لەبەردابوو لەپشت دەرگاکەوە بە هەراسانی دەیڕوانی پێیگوت:
- تانیا پەرداخێك ئاو بۆخاتوون بێنە.لەسەرسینی دابنیٚ و بیهێنە.تێگەیشتی؟
پاشان بە گالٚتەوە گوتی:
- ئێوەش بەڕێزان،واباشە بێنەژووری کۆنە سەربازێك؟
ئاریناڤلاسۆنا بە ناڕەزاییەوە گوتی:
- نیۆشای ئازیزم...ڕاوەستەباجارێکی دیکەش ماچت کەم.

بازارۆف داهاتەوە.پیرەژن گوتی:

- چەندەجوان بووی.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ گوتی:

- جوان یـان ناشـیرین،بەهەرحالْ بۆخـۆی بۆتەپیاوێك.ئارینا‌ڤلاسـۆنا،هیوادارم لـە فکـری هەستی دایکانەی خۆتدانەبی و ئـەوەت لەبیرنەچـێ کـە میوانـەکانمان تـازە گەیشـتوونەجێ و برسیانە.

پیرەژن گوتی:

- ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ،هەرئێستا سفرەڕادەخەم.دەچمەچێشتخانەو پێیان دەڵێم سەماوەرەکەی هەڵکـــەن.کارەکان ڕێکدەخەم...ئاخرســـێ ســـاڵە کوڕەکـــەمم نـــەدیووە و هیچیشـــم بۆنەکردووە...بۆچما کارێکی ئاسانە.؟

- زۆرباشـــە،خواردنێکی باشمـــان بۆســـازکە.بەڕێزان ئێـــوەش واباشـــە لەگـــەڵ مـــن بێن.یۆگینی،تیمۆڤیچیش هاتووە بەخێرهاتنتان بکات.دیـارە ئـەویش لـە هاتنتـان خۆشـحاڵ بووە...وانییە پیرەپیاوی بێ زەین...؟باشە،بابڕۆین.

ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ لەگـەڵ ڕۆیشـتنی هەرایـەکی سـازکردبوو.پێڵاوە کـۆن و دڕاوەکـانی وێکدەکەوتن و دەنگیان دەهات.

* * *

تەواوی ماڵی بازارۆف لەشـەش ژوور پێکهاتبوو.ئـەو ژوورەی دوو گەنجەکـە چـوونە نـاوی ژووری کاری خاوەن ماڵ بوو.لە نێوان دووپەنجەرەدا مێزێکی گەورەی پایەئەستوور دانرابوو کـە سەرەکەی پڕبوو لە کاغەزی لوول دراو ئەوەش نیشانەی ئەوەبوو کە ئەوکاغەزانە ماوەیەکە بـێ کەڵك لەوێ هەڵدراونـەوە. تفـەنگی تورکی،قامچی،شمشێر،دوونەخشـەی جوگرافیـاو هەنـدێك وێنەی شیکاری و وێنەیەکی(هۆفلاند-فیزی زانی ئەڵمانی) و نازنـاوی بنەماڵـە کـە بـەخوری چنرابوو، بڕوانامەی دیبلۆم (ئەودوانەی ئاخیری لە چوارچێوە گیرابوون) بە دیـواری ژوورەکـەوە هەڵواسرابوون.لە ما بەینی دووگەنجینـەی گـەورەدا کـە لـەدار درووسـتکرابوون کورسـییەکی چەرمی لێ دانرابوو کە هەندێ شوێنی دڕابوون.لەسەر گەنجینەکان و لەسەر ڕەفتەکان کتێـب و قووتوو باڵندەی وشککراوەو شووشەی بەتاڵ بەسەلیقەیەکی تایبەت ڕیزکرابوون.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ  بە داوای لێبووردنەوە گوتی:

- پێشتریش پێمگوتبوون کە ئێرە ژووری کۆنە سەربازێکە.

بازارۆفی گەنج چووە ناوقسەکانی باوکی و گوتی:

- وازبێنە باوکە.بۆ هێندە ڕوومان لێدەنێی؟ کیرسانۆف بۆخۆی باش دەزانێ کە ئێمە تەنیاسەری خۆمان پێڕادەگیرێ و چاوەڕوانی ئەوەش ناکا بۆپێشوازی کۆشکێکی بۆدرووست بکەی.

- کوڕی خۆم ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ ئێمە لێرە ژووری زۆر باشترمان هەیە کەپێموایە ئەویان زۆر باشتربێ.

- ئاوا،کەوایە ژوورێکی تازەت درووستکردووە؟

تیمۆڤیچ  نەیتوانی خۆیڕابگرێ  گوتی:

- بەڵێ،لەشوێنی حەمامەکە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەپەلە گوتی:

- بێگومان لە تەنیشت حەمامەکە.ئێستا هاوینە...تیمۆڤیچ واباشە ئەسپی ئەو بەڕێزانەت هێنابان...منیش هەر ئێستا دەچم دەستوور دەدەم ژوورەکەیان بۆ ئامادەبکەن.یۆگینی،دەزانی ژوورەکەی خۆم دەدەم  بەتۆ.

لەگەڵ چوونەدەرەوە ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچی کوڕ گوتی:

- ئەوەش باوکم.فەقیرە پیرەمێردێکی زۆرباشە.لە زۆر ڕووەوە وەك باوکی تۆ دەچێ بەلاّم عەیبی گەورەی ئەوەیە زۆر قسان دەکات.

ئارکادی گوتی:

- دایکیشت ژنێکی زۆرباش و بێوێنەیە.

- بەڵێ،مرۆڤێکی باش و سادەیە.ئێستا بزانەچ نیوەڕۆ خوانێکمان بۆ سازدەکا.

تیمۆڤیچ کە جانتاکەی بازارۆفی دەبردە ژووری  گوتی:

- ئەورۆ چاوەڕوانی تۆ نەبوون بۆیە گۆشتیان نەکڕیووە.

- بەبێ گۆشتیش دەتوانین بژین.هەژاری تاوان نییە.

ئارکادی لەپڕدا گوتی:

- ڕەعیەتەکانی باوکت چەند کەسن.؟

- ئەو زەویە ئی باوکم نییە.ئەوەی هەیە ئی دایکمەو دەڵێن پازدە کەسێك دەبن.

تیمۆڤیچ لەخۆباییانە قسەکەی بازارۆفی ڕاستکردەوەو گوتی:

- بیست و دوو ڕەعیەتن.

دەنگی شڵپەشڵپێك هات دوای ئەوە ئیڤانۆڤیچ  بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- تاچەند دەقیقەیەکی دیکە ژوورەکە ئامادە دەکریٚ بەڕێز ئارکادی... نیکۆلایۆڤیچ.ئەگەر بەهەڵەنەچووبم ناوی بەڕێزتان ئەوەیە.ئەوەش خزمەتکاری تایبەتی  تۆ.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کوڕیژگەیەکی نیشاندا.کوڕیژگەکە پرچ کورت و جلو بەرگێکی سوورمەیی لەبەر دابوو جووتەپێلاوێکی کۆنی لەپێدابوون.

- ناوی( فەدکا) یە.هەرچەندە کوڕەکەم دژی ئەو کارەیە بەلاٚم ئەو کوڕە باشترین کەسە کە بتوانیٚ کارە کانتان بۆ ڕاپەڕێنیٚ.سەبیلەش باش دادەگریٚ.جگەرەکێشن؟

ئارکادی وەلاٚمی دایەوە:

- زۆرجگەرە دەکێشم.

- کارێکی زۆرباش دەکەی.ئەگەر ڕاستیت دەویٚ منیش تامی جگەرەم پێخۆشە بەلاٚم بەداخەوە جگەرە لێرە زۆرکەم پەیدادەبیٚ...

دووبارە یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ  قسەکانی باوکی بڕین و گوتی:

- شیوەن ئیدی تەواو.واباشە هەرلێرە لەسەر ئەو کورسییە دابنیشی باتێر تەماشات بکەم.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ پێکەنی و لەسەر کورسییەکە دانیشت.رووخساری وەك ڕووخساری بابی وابوو تەنیا ئەوەندە جیابوو کە ناوچەوانی باوکی کورتترو دەمی کەمێك گەورەتربوو.بەردەوام تێکڕادەبوو شانەکانی هەڵدەتەکاند،دەتگوت کراسەکەی بەری تەنگەو چاوی دەتروکاند.هەمیشە دەکۆخی و پەنجەی دەجولاٚند.لە کاتێکدا کوڕەکەی بەئارامی دانیشتبوو سەیری دەکرد.

- شیوەن؟ یۆگینی پێتوانەبیٚ من بۆیە وادەکەم تا میوانەکەمان دڵی پێمان بسووتیٚ و وابزانیٚ لەچ جێگایەکی دوورو تەریکدا دەژین.ڕێك بەپێچەوانە،من بڕوام وایە کە هیچ شوێنێکی دوورە دەست بۆ کەسێك کەخاوەنی ئەندێشەو بیربێت بوونی نییە.من هەمیشە لەو هەوڵەدام کە لە ڕووی فکرەوە دانەڕزێم و لەدەورانی خۆم داوانەکەوم.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ ئەو دەسماڵە زەردەی کە لـەژووری ئارکـادی لەگـەڵ خـۆی هێنـابوو لـە گیرفانی دەرهێناو لە کاتێکدا ڕایدەوەشاند گوتی:

- من لەو فیداکاریانەی کردوومن بۆنموونە ڕەعیەتەکانم کردوونە کرێچی و تەنانەت بە نیوە قیمەت زەویم بە هەندێکیان فرۆشتووەو قسەش ناکەم.چوونکە بڕوام وایە ئەو کارە ئەرکی خۆم بووە لە کاتێکدا زۆرلەخاوەن مڵکەکان هەرگیز شتی وایان نەکردووە.من مەبەسـتێکی دیکـەم هەیە.مەبەستی من لێکۆڵینەوەی زانستییە.

بازارۆف گوتی:

- بەڵێ،گۆڤاری ((هاوڕێی تەندرووستی)) چاپی ساڵی١٨٥٥لێرە دەبینم.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەپەلە گوتی:

- یەکێك لە هاوڕێ کۆنەکانم بۆم دەنێرێ.جگەلەوەش زانیاریم دەربارەی کاسەسەر ناسی و شتی تریش هەیە.

لە کاتێکدا کە زۆرتر ڕووی قسـەکانی لـەئارکادی بـوو کەللەسـەرێکی بچـوکی لـە گـەچ دروستکراوی نیشاندا کەلەسەر گەنجینەکە دانرابوو گوتی:

- ئێمە هەتا (شەنلین) و (ڕادماهر) یش مان لەبیر نەکردوون.

بازارۆف پرسی:

- بۆمەگەرلێرە...خەڵك هێشتاش بڕوایان بە ڕادماهر هەیە؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ گەرووی پاککردەوەو گوتی:

- بێگومان بۆخۆت باشتر دەزانی کە ئیمەلێرە نـاتوانین بـە ئەنـدازەی پێویسـت دەسـتمان بەسەرچاوەی زانستی ڕابگا...لە زەمانی ئێمەشدا گاڵتەیان بە(هۆمۆرالیسم هافمەن) و (براون) و (ڤیتالیسم) دەکرد،لە کاتێکـدا ئەوانــە لـەزەمانی خۆیانـدا زۆر بـەناوبانگ بوون.ئێسـتاش کەسێکی دیکە جێگەی ڕاماهری گرتۆتەوەو ڕەنگە بیست ساڵی دیکـەش نووسـەرێکی دیکـە جێگای ئەو نووسەرە بگرێتەوەو خەڵکانی دوایی بەو کەسانەی کە تۆ حاڵی حازر زۆر بەجدی بە بیروبڕوایان پابەندی پێبکەنن.

بازارۆف بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- دەبێ بزانی کە ئێمەلەحاڵی حازردا گاڵتەمان بە تەواوی زانسـتی پزیشـکی دێ و هـیچ هێزێکیش نییە بتوانێ لەبەرامبەر ئێمەداخۆی ڕابگرێ.

- چۆن شتێکی وادەکرێ؟...بۆ چما تۆ نیازت نییە ببیتەپزیشك؟

- نیازی ئەو کارەم هەیە،بەلاّم پێکەنین بە زانستی پزیشکی، شتێکی دیکەیە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ پەنجەگەورەی لە سەبیلەکەدا بادا.هێشتا سووتووی سەبیلەکە هەرگەرم بوو.

- باشە،ڕەنگە وابێ.بۆچما من چەندە سەرم لەکاری پزیشکی دەردەچێ.من تەنیا دکتۆرێکی خانەنشینی سووپام کە ئێستاش خەریکی کاری کشتووکاڵیم.

پاشان ڕووی لە ئارکادی کردوگوتی:

- من لە تیپێکدا خزمەتم دەکرد کە باپیرەگەورەی تۆ فەرماندەی بوو.بەڵێ،بەڵێ،منیش لە ڕۆژگاری خۆمدا زۆرشتم دیتوون.لەگەڵ چ کەسانێك هەڵنەستاوم و دانەنیشتووم.لەچ کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا بەشداریم نەکردووە.بەڵێ،من،یانی هەمان کەسی کە بەرامبەرتان دانیشتووە،شارەزایی زۆرم لە ورەوغیرەتی شازادەکان هەبوو.تەواوی ئەوانەی کە لەساڵی١٨١٤لە لەشکری باشوورخزمەتیان دەکرد.لە هەمان زەمان ڕاپەڕینی دیسامبەریەکان،تێگەیشتی؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بە شێوەیەکی مانادار لێوەکانی هەڵچنین و گوتی:

- ئەوانەم زۆرباش دەناسین.دیارە کارەکەشم هێندە گرنگ نەبوو.من تەنیاپێویست بوو خۆم بناسم...بەلاّم باپیرت پیاوێکی زۆر بەڕێزبوو.ئەو سەربازێکی ڕاستەقینەبوو.

بازارۆف بەهێمنی گوتی:

- بلێ ئەو تا چ ڕادەیەك گەمژەبووە.

- ئاخ،یۆگینی،ئەوەچ قسەیەکە دەیکەی؟...بێگومان ژەنەڕاڵ کیرسانۆف لەو دەستە ژەنەڕالاّنە نەبووکە...

بازارۆف دووبارە قسەکەی پێ بڕی:

- با وازلەو قسانە بێنین.کاتێك دەهاتینەئێرە باخچەسپیدارە کەتم دیت زۆرم پێخۆشبوو.باش گەورەبوون.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەو تاریف کردنە خۆشحاڵ بوو گوتی:

- کەوایە تا ئێستا باخچەکەت نەدیووە.دارەکان هەرهەموو بۆخۆم ناشتوومن.هەم دارە میووەکان و هەم گیاکانی پزیشکی.تۆ هەرچی پێتخۆشە بیلێ بەلاّم (پاراتسیلی) قسەیەکی

جوانی گوتووه.دەڵێ : (بەرووەك و وشەو خوێ...) تۆ دەزانی من دەمێکە دەستم لە چارەسەرکردنی خەڵکی هەڵگرتووە.ناچارم هەفتەی دووجار کاری ڕابردووم بکەمەوە.بەشێکی زۆر سەردانی ئێرە دەکەن ناشکرێ ئەوانە بێ ئوومێد بکەی.هەندێجار هەزاران بە مەبەستی یارمەتیدان دێنەئێرە...ئێرە پزیشکی لێ نییە.بیری لێبکەوە یەکێك لە دراوسێکانمان کە سەرگوردێکی خانەنشین کراوە دەستیکردووە بەچارەسەرکردنی خەڵك.ڕۆژێك لێم پرسی کە لەو بوارەدا هیچی خوێندووە؟ گوتی نا بەڵام تەنیا لەڕووی خێرخوازییەوە ئەوکارە دەکا.بەڕاستی گاڵتەجاڕیە...لەڕووی خێرخوازییەوە...تۆ دەڵێی چی؟

بازارۆف بە تووڕەییەوە گوتی:

- فەدکا،سەبیلەکەم بۆ داگرە،

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بە نائومێدیەوە گوتی:

-ڕۆژێك داوایان لە پزیشکێك کرد بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشێك بێتە ئێرە.کاتێك پزیشکەکە گەیشتە ئێرە نەخۆشەکە مردبوو.خزمەتکاری ماڵەکەش ڕێگای نەدا بێتەژوورەوەو پێیگوت کە (ئیدی پێویست بەتۆناکات)پزیشکەکەش کەچاوەڕوانی شتیکی وای نەدەکرد پرسی: (دەمەوێ بزانم ئاغات بەرلە مردنی نزگەرەی هاتێ) (بەڵێ) (نزگەرەی زۆربوو) (بەڵێ) (ئەوە زۆرباشە) دوای ئەوە پزیشکەکە گەڕایەوە.

پیرەمێردپێکەنی،ئارکادیش پێکەنی بازارۆف کەمەربەندەکەی تووندکردەوە.کاتژمێرێك بەو شێوەیە تێپەڕی.دوای ئەوە دەرفەتێك هاتەپێش تا ئارکادی سەرێك لە ژوورەکەی بدات.ژوورەکە پێشتر شوێنی خۆگۆڕینی حەمام بوو گەورەوخاوێن دەهاتە بەرچاو.سەرەنجام وەختی نانخواردن هات و ڕایان گەیاند خواردن ئامادەیە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەپێش هەمواندا هەستاو گوتی:

- فەرموون بەڕێزان.هیوادارم بەقسە حەللەق مەللەقەکانم سەرم نە ئێشاندبن.ڕەنگە خێزانم لەمن باشتربتوانێ پێشوازیتان لێبکات.

*　　*　　*

لەگەڵ ئەوەی لە ئامادەکرنی نانی نیوەڕۆدا پەلەو هەڵپەیەکی زۆرکرابوو واش خواردنێکی زۆرباش ئامادەکرابوو تەنیا شەرابەکە باش نەبوو.شەرابی ئیسپانی کە تیمۆڤیچ لەشارو لە

بازرگانێکی ئاشنای کڕیبوو تـامی زۆرخـۆش نەبوو.مێشەڕەشـەش وازیـان نەدەهێنا.لـەکاتی نانخواردندا یەکێك لە خزمەتکارە منداڵەکان بە لکەدارێك مێشەکانی دەردەکردن بەلاّم لەترسی ڕەخنەی دوو میوانە گەنجەکە،خزمەتکارەکەیان بەدوای کـارێکی دیکـەدا نارد.لـەو ماوەیـەدا ئاریناڤلاسۆنا دەرفەتێکی پەیداکردبوو تـا کـەمێك بـەخۆی ڕابگـات.کلاّوێکی تـۆڕی جـوانی پەراوێز ئاوریشمی لەسەر نابوو دەسماڵێکی شـینی بەسەرشـانی دادابوو.هـەر لەگـەڵ دیتنـی یۆگینی،دووبارە چاوی پڕبوونەوە لەفرمێسك.بەلاّم پـێش ئـەوەی مێردەکـەی قسـەیەك بکـات فرمێسکەکانی سڕینەوە تا نەکا دەسماڵەکەی تەڕبێ.

تەنیا دوومیوانە گەنجەکان دەستیانکرد بەنانخواردن،چوونکە دانیشتوانی ماڵێ دەمێك بـوو نانیان خواردبوو.فەدکا سەرگەرمی کاری خۆی بوو.دیاربوو پێلاّوەکـانی ئازاریـان دەدا.یەکـەم جاربوو ئەوپێلاّوانەی لەپێ دەکردن.ژنێکیش کە ناوی (ئانفیس) بوو یارمەتی دەدا.ئانفیس کـە ڕووخسـارێکی جـدی و خـواری هـەبوو خەزێنـەدارو جلشـۆریش بوو.لـە تـەواوی کـاتی نانخواردندا،ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لە ژوورەکەدا پیاسەی کردو نیگەرانیەکانی خـۆی سـەبارەت بـە سیاسـەتی نـاپلیۆنی سـێیەم و کێشـەی ئیتالیـا دەربڕی.ئاریناڤلاسـۆناش هـیچ لـەبیری ئارکادیدانەبوو ڕووی نەدەدایە.دەستی خستبووە ژێرچەناگەو لێوەگۆشتن و ئالۆبالۆەکانی.گۆنـاو ناوچەوانی پڕبوون لە وردەخاڵ کە حاڵـەتێکی میهرەبانیـان پـێ بەخشـیبوو.پیرەژن هـەتا بـۆ چرکەیەکیش چاوی لەسـەر کوڕەکـەی هەڵنەدەگرت.لێکـدا لێکـدا ئـاخی هەڵدەکێشـا.زۆری حـەزدەکرد بزانـێ یـۆگینی تاچـەند لێـرە دەمێنێتـەوە بـەلاّم لـە بیسـتنی وەلاّمەکـەی دەترسا.لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوەو دەیگـوت نـەکا بـۆ یـەك دووڕۆژان هاتبێتـەوە ئـەوکات خەریك دەبوو دڵی ڕاوەستێ.

...دوای کەباب خواردن،بۆ ماوەیەکی کەم ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لە ژوورەکە هاتەدەرو هەرکە گەڕایەوە شووشە شامپانیانیەکی بەدەستەوەبوو.

– فەرموون.ئەگەرچی ئێمە لەلادێ دەژین لەگەڵ ئەوەشدا لـەکاتی شـادی و خۆشـییەکاندا شتێکمان هەیە کە خۆمانی پێ دڵخۆش بکەین.

پاشان سێ پەرداخ و ئیستیکانێکی پڕکردن لە شامپانی و پەرداخەکەی خۆی بەسـەلامەتی میوانەخۆشەویسـتەکانی هەڵـداو پیرەژنیشـی ناچـارکرد تـا دواچـۆڕی ئیسـتیکانەکە بخواتەوە.لەکاتی خواردنی مرەببادا،لەگەڵ ئەوەی ئارکادی نێوانێکی ئـەوتۆی لەگـەڵ شـیرینی

نەبوو واش بۆ ڕێزگرتن لەو دابوڕەسمە لەهەر چوار مرەبباکەی خوارد.لە کاتێکدا بازارۆف لێوی لــە مرەببــا نــەداو هەرجگــەرەی کێشــا.دوای ئــەوە نــۆرەی چــای و قــەیماغ و کــەرەو کولێرەچەورەهات.پاشان ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بردنیەباخەکە تا لەجوانییــەکانی شــەو سەرمەســت بن.کاتێك بەپەنا یەکێك لە نیوتەختەکان تێدەپەڕین،پیرەمێرد بەگوێی ئارکادیدا چرپاند:

- کاتێك لێرەم تەنیا دەمەوێ خۆرئاوابوون ببینم و ڕاوێچکان بکەم.ئەوکارە بۆ مرۆڤێکــی گۆشەگیری وەك من زۆر لەبارە.کەمێك لەولاتر درەختی خۆشەویستی هۆراسی شاعیری ڕۆمــیم چاندوون.

بازارۆف کە گوێی لەقسەکانی باوکی ڕاگرتبوو پرسی:

- چ دارێك؟

- ئەقاقیا.

بازارۆف باوێشکێکی دا.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ گوتی:

- پێموایە کاتی ئەوەهاتووە میوانەکانمان بخەون و...

دووبارە بازارۆف قسەکانی باوکی بڕین و گوتی:

- یانی مەبەستتان ئەوەیە کاتی خەوە.بەڕاستی قسەیەکی باشتکرد.

پێش نووستن بازارۆف ناوچەوانی دایکی ماچ کردو دایکیشی بێ ئەوەی ئەو ئاگای لێبێ لە دوایەوە سێ جار خاچی کێشا.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ ئارکادی تا بەردەرگای ژوورەکەی بردوو گوتی:

- هیوادارم وابخەوی کەمن لە ڕۆژانی پڕلەحەزی گەنجێتیمدا دەنووستم.

ئارکادی بەئاسوودەیی لێی نووست.ژوورەکەپڕبوو لەبۆنی نەعنا دووسیسرکە بە نۆرە دەیــان خوێند،کە مرۆڤیان هاندەدا بۆنووســتن.ئیڤانۆڤیچ پاشــان چــووە ژوورەکــەی خــۆی و لــە خــوار کوڕەکەی لە سەر کورسییەك دانیشت و نیازی بوو قسە لەگەڵ بازارۆف بکات.بەڵام بە بیانووی ئەوەی کە زۆرماندوویــە و دەیــەوێت بنوێــت لــەخۆی دوورخســتەوە،واش تاســپێدە نەنووســت بیرەوەریەکانی دەورانی منداڵی هێندەشیرن و سەرنجڕاکێش نەبوون و هێشتاش نەیتوانیبوو خۆی لەو یادە تاڵەی چەند ڕۆژی ڕابردوو ڕزگاربکات.بازارۆف بەرقەوە چاوی لەتاریکی شەو بڕیبوو.

ئاریناڤلاسۆنا پێش نووستن دوعای خوێند.پاشان ماوەیەك لەگەڵ ئانفیس کەوتە قســەکردن کە بە سەرسامییەوە سەیری دەکرد.ئانفیس بەدەنگە سیحراویەکەی بیروباوەڕەکــانی دەربــارەی

هەڵس و کەوتی یـۆگینی ڤاسـیلیۆڤیچ دەردەبڕی.بـەهۆی خواردنـەوەی شـامپانیاو دووکـەڵی جگەرەوە پیرەژن سەری دەگێژەوە دەچوو.مێردەکەی نیازی بوو قسەی لەگەڵدابکات بەلاّم پیرەژن بە ئاماژەی دەست تێیگەیاند تاقەتی نییە.

ئاریناڤلاسۆنا یەکێك لە خانەدانـە کۆنـەکان بـوو کـە زۆر پابەنـدی داب و نـەریتی کـۆن بوو.ڕەنگە باشتربا کە دووسەد ساڵ پێش یانی لەزەمانی حکومەتی مۆسکۆی کۆندا ژیابـا.زۆر لەخواترس بوو بڕوای زۆری بەدووعاو جنۆکەو تەلیسم و...هـەبوو.بڕوای وابـوو ئەگـەر شـەوی جێژنی پاك مۆمەکانی کلێسا نەکوژێنەوە،بڕوای وابوو بەرووبوومی جۆکێویلە ئەوساڵە زۆرباش دەبێ.بڕوای تەواوی وابوو کە بەوزوانە دنیاخرادەبێ.پێشی وابوو ئەگەر بنیادەم چـاوی بـەکارگ بکەوێ ئەوا ئەو کارگە لە گەشەکردن دەوەستێ.شەیتان تەنیا دەتوانێ بچێتەئەو جێگایەی کـە ئـــاوی لێبێ.لەســـــەر ســـــینەی هـــــەر تێکۆشـــــەرێك کەللەیــــەکی پڕخـــــوێن هەیە.مشك،بۆق،زێروو،چۆلەکە،هەورەبرووســـکە،ئاوی سارد،با،ئەســـــپ،بزن،مرۆڤی ژیـــــرو پشیلەڕەشە هەموویان هەراسانیان دەکرد.سەگ و سیسرکەی بەشووم دەزانین.لەخواردنی گۆشتی گوێرەکـەو گۆشـتی کـۆترو قـرژاڵ و گوڵـەزەرو پەتاتـەو ترشـی و گۆشـتی کەروێشـك خـۆی دەپاراســت.ئەگەر کوشتباشــت شــووتی نــەدەخوارد چــوونکە شــووتی ســەری یــەحیای دێناوەبیر.لەکاتی قسەکردندا ئەو سەدەفانەی بەخۆوەی کردبـوون دەلەرانەوە.چێشـت خـواردنی زۆرپێخۆشــبوو هەمیشــەش ڕۆژووی خـۆی دەگرت.لــە شــەوورۆژدا دە کاتــژمێری بۆخــەوتن دانابوو.بەلاّم ئەگەر ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ چووکترین نەخۆشی هەبا خەو نەدەچووە چاوەکانی.جگە لەدوو کتێبی دیاری کراوی ئاینی هیچی دیکەی نەدەخوێندەوەو ساڵێش لە دوونامــە زیـاتر ی نەیدەنووســی.،بەلاّم دەربــارەی کاروبــاری مــاڵێ لــە دروســتکردنی مرەببــاو شــەربەت و وشککردنەوەی سەوزەومیوە زۆر لێهاتووبوو ئەگەرچی بۆخۆی کەمتر ئەو کارانەی دەکـرد ئـەو تەنیا فەرمانی دەدا.

ئاریناڤلاسۆنا مرۆڤێکی دڵپاك بوو بە بڕوای خۆی کەسێکی ژیربوو.ئـەو بابەتـەی زۆربـاش دەزانی کە هەندێك کەس بۆفـەرمان کـردن و هەنـدێکیش بـۆ فـەرمان بـەڕێوەبردن درووسـت کراون.هەر بۆیە لــە نوانـدنی فـەرمان کردنـدا چـێژی وەردەگـرت و لەگـەڵ ئەوەشـدا لەگـەڵ خزمــەتکارەکانی زۆر میهرەبــان بــوو.هیچ کاتێــك گەدایــەکی بەنائومێــدی لــە ماڵەکــەی بەڕێنەدەکرد.خراپەی کەسی نەدەویست بەلاّم غەیبەت کردنیشی پێخۆشبوو.بەگەنجی کچـێکی

جوان بوو،تا ڕادەیەکیش لەژەنینی پیانۆ شارەزابوو دەشــی تــوانی مەبەســتی خــۆی بــەزمانی فەرەنسی بگەیەنیٚ.بەلاٚم بەدرێژایی ئەوسالاٚنەی کە لە دەربــەدەری بــوو لەگــەڵ ئــەو مێــردەی بەزۆری ببووە هاوسەری بەرەبــەرە قەڵــەو ببــوو مۆســیقاو فەرەنســییەکەی بــە تــەواوی لــەبیر چووبۆوە.کوڕەکەی دەپەرست و لەهەمان کاتیشدا لێی دەترسا.

بەڕێوەبردنی مڵکەکانی خــۆی بــە ڤاســیلی ئیڤــانۆڤیچ ســپاردبوو بۆخــۆی هــەرگیز خــۆی تێهەڵنەدە قورتاند.هەر کاتێکیش مێردەپیرەکەی ئەو بەرنامەی کــە نیــازی وابوولــە ئاینــدەدا پیادەیــــان بکــــات و قســــەی لەگــــەڵ دەکــــرد پــــیرەژن هەناســــەیەکی هەڵدەکێشــــاو دەنووزایەوە.دەسماڵەکــەی ڕادەوەشــاندو بــرۆی هەڵدەکێشــان.بەردەوام لەخــەیاڵ پلاٚوانــدا دەتلایەوە.هەر لەحزە لە چاوەڕوانی بەدبەختییەکی گەورەدابوو کە بێت.ئەوەندە بەسبوو شتێکی خەمگین وەبیرخۆی بێنێتەوە تا فرمێسکەکانی هەڵڕژێن.

...ئێستا لەوجۆرە ژنانە کەمترپەیدا دەبن.هەرخوا باشــتردەزانیٚ کــە لەنــەبوونی ئەوانــەدا دەبیٚ خۆشحاڵ بین یان خەمگین.

## (٢١)

که له جێگاکەی هاتەدەر،ئارکادی چووە بەرپەنجەرەو کردیەوە یەکەم شت کە چاوی پێکەوت ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بوو.پیرەمێرد کە جلکێکی ڕستراوی بووخارای لەبەردابوو دەسماڵێکی لەپشتی بەستبوو لە ناوباخچەکە بەپێمەرە زەویەکەی وەرد دەدایەوە.ئەویش ئارکادی دیت لە کاتێکدا خۆی هاویشتبووە سەرپێمەرەکەی هاواریکرد:

- بەیانیت باش.هیوادارم باش بی.باش نووستی؟

- زۆرباش.

- هەوەك دەبینی منیش خەریکی شێلمانم.ئێستا ئیدی زەمانە گۆڕاوە...هەرکەس دەبێ کاری خۆی بۆخۆی بکات.نابێ چاوت لە دەستی خەڵکی بێ.هەرکەس دەبێ بۆخۆی قۆڵانی لێهەڵماڵێ.دەڵێی هەقی ژان ژاك ڕۆسۆیە.برای بەڕێز ئەگەر نیو کاتژمێر پێشترمنت دیبا لە دۆخێکی دیکەدابووم...ژنێك کە تووشی زگ چوون ببوو...چۆن بڵێم...تریاکم دایە.ددانی ژنێکی دیکەشم کێشا.ویستم بێهۆشی بکەم بەڵام ڕازی نەبوو.تەواوی ئەو کارانەم بەخۆڕایی کردوون.بە کورتی منیش بەشێکم لەوخەڵکە.من وەك خێزانم لەدەستەی خانەدانەکان نیم...ئەگەرپێت خۆشبێ دەتوانی بێیە ئێرەو لەژێر ئەو سێبەرە پێش نانخواردنی ناشتا کەمێك هەوای پاك هەڵمژی.

ئارکادی لەژووریێ هاتەدەرو بەرەولای پیرەمێرد ڕۆیشت.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەشێوەی سەربازان دەستی خستەسەر کلاوە چڵکنەکەی و گوتی:

- دووبارە بەخێربێی.هەرچەندە دەزانم تۆ بەژیانی ئاسوودەو پڕلە نازونیعمەت ڕاهاتووی بەڵام پێموانییە گەوران کەمێك مانەوەیان لە کەوێڵی هەژاراندا هەست بەشەرمەزاری بکەن.

ئارکادی بەناڕەزاییەوە گوتی:

- لە کەیەوە من بوومەتە بەشێك لە گەورەپیاوان؟کێ بەتۆی گوتوە من بەژیانی ئاسوودەو پڕ لە نازونیعمەت ڕاهاتووم.؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەخۆشەویستییەوە گوتی:

- ئیجازە بفەرموون.ئیجازە بفەرموون.ڕاستە کەمن دوور کەوتەم،منیش لەو دنیایەدا ژیاوم و باڵندەکان لەڕووی فڕینیانەوە دەناسم پێشم وایە تا ڕادەیەك قیافەناسبم.ڕەنگە بەجورئەتەوە بڵێم ئەگەر ئەو تایبەتمەندیانەم نەبان تا ئێستا لەمێژبوو لەناو چووبووم.زۆران ڕێگا بە کەسانی لەخوارەوەی وەکومن نادەن کە ژیانێکی ئارامیان هەبێ.ڕاست و ڕەوان و بێ لەڕوودامان دەڵێم هاوڕێیەتی تۆو کوڕەکەم بۆمن مایەی خۆشحاڵییە.چەند دەقیقەیەك لەمەوبەربوو کەدیتم.وەك خووی هەمیشەیی بەیانیان زوولەخەو هەڵدەستێ و سەیرێکی دەورووبەردەکات.لەوەی زۆرخۆ تێهەڵدە قورتێنم داوای لێبووردن دەکەم.ئەرێ تۆو یۆگێنی لەمێژە یەکتری دەناسن؟

- لە زستانی پارەوە.

- باشە.دەمەوێ پرسیارێکی بکەم...باشترنییە دانیشین و قسەکانمان بکەین.هەست و سۆزی باوکانەیە وادەکا ئەوپرسیارانەت لێ بکەم ڕات چۆنەبەرامبەر یۆگێنی؟

ئارکادی بەشەوقەوە گوتی:

- کوڕی تۆ یەکێکە لە گەورەترین ئەو کەسانەی کە بەدرێژایی تەمەنی خۆم ناسیومن.

چاوەکانی ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ خڕبوونەوەو ڕووخساری سوورهەڵگەڕاو پێمەڕەکەی لەدەست کەوتەخوارێ.

- بەوپێیەی تۆ بیردەکەیەوە کە...

ئارکادی قسەکانی پێ بڕین و گوتی:

- من دڵنیام کوڕەکەی تۆ ئایندەیەکی پڕشنگداری لەپێشە.دەبێتەهۆی سەربەرزی و شانازی ئێوە.من هەر لەیەکەم دیداردا دەرکم بەوەکرد.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بە زەحمەت توانی ئەوشتەی مەبەستی بوو بیڵێ:

- سەیرە...چۆن بووە؟؟...

- حەزدەکەی داستانی یەکەم دیتنمانت بۆ بگێڕمەوە؟

- بەڵێ...هەمووشتێك.

ئارکادی بە تامەزرۆییەوە دەربارەی بازارۆف دوا هێندە ڕۆیشت تەنانەت ئەو شەوەی کەبەمیوانی لای ئادینسۆڤا بوون هێندەی تاریف نەکردبوو.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ سەرتاپا ببووە گوێ.بێ ئاگا چڵمی هەڵدەلووشی و دەسماڵەکەی لەناو دەستانیدا ڕێکدەگوشی.کەوتە کۆخین و

پرچەکانی ئالۆزان و سەرەنجام لەوە زیاتر توانای نەما.داهاتەوەو شانەکانی ئارکادی ماچ کـردن لە کاتێکدا هێشتا بزەی لەسەرلێوان بوو گوتی:

- تـۆ سـەرتاپا نـووقمی خۆشـحاڵیت کردم...واباشـە ئـەوەت پێبڵـێم کە...کوڕەکـەم دەپەرستم.هیچ بەژنەکەم نـاڵێم چـوونکە بۆخـۆت پیرەژنـەکان باشـتر دەناسـی و دەزانـی کـە دایکەکان چ جـۆرە بوونەوەرێکن.بـەڵام مـن لەبەرامبەرئـەودا توانـای دەربڕینـی هەسـتەکانم نییە.ئەو، ئەو کارانەی پێخۆش نـین دژی هـەرجۆرە دەربڕینێکـی خۆشەویستییە.زۆرکەسـیش لەبەر ئەو ڕەفتارەی لۆمەی دەکەن و ئەوەی بەلوت بەرزی و خۆهەڵکێشان لێك دەدەنەوە.بـەڵام هەڵسەنگاندنی ئەوجۆرە مرۆڤانە لەگەڵ خەڵکانی دیکە کارێکی هەڵەیە.وانییە؟بۆنموونە ئەگەر کەسێکی دیکە لەجێگای ئەو بایە تا ئەوجێگایەی دەیتوانی بەردەوام پارەی لـەدایك و بـاوکی وەردەگرت،تەنانەت دیناریکیشی لە ئێمە وەرنەگرتووە.بەخوا بەڕاستمە.

- مرۆڤێکی پاك و ڕاستە.

- بەڵێ،بەڕاستی بنیادەمێکی پاکە.هەربۆیە نەك تەنیا دەیپەرستم بەڵکو شانازیشی پێـوە دەکەم...ئەگەر ئەوە خۆهەڵکێشان نەبێ تەنیا ئارەزووی من ئەوەیە کـە لـەژیان نامـە کەیـدا بنووسن ( ئەو کوڕی پزیشکێکی سادەی سووپابوو کە زۆرزوو پەی بەئایندەی خـۆی بـردوو لـە پەروەردەکردنی خۆیدا لە هیچ هەوڵ و کۆششێك وازی نەهێنا.)

زنجیرەی قسەکانی پیرەمێرد پچڕا.ئارکادی دەستەکانی دەنێودەستی خۆی گرتن و گوشینی.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دوای کەمێك بێدەنگی گوتی:

- تۆ ڕات چییە؟ئایا لەپزیشکیدا ئەوپلەیەی لەبەرچاوت گرتووە پێیدەگات؟

- لەدنیای پزیشکیدا نەخێر.هەرچەندە لەو ڕشتەیەشدا دەبێتە فەیلەسووفێکی گەورە.

- کەوایە لەچ بەشێکدا بەناوبانگ دەبێ.

- ئێستا دژوارە وەڵامی ئەوپرسیارەت بدەمەوە.بـەڵام  بـە دڵنیاییـەوە دەبێتـە پیـاوێکی گەورە.

- پیاوی گەورە؟!

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دوای دەربڕینی ئەوڕستەیە لەفکرەوەچوو.ئانفیس بەسـینیەکی گـەورەی پڕلە شاتوو بە تەنیشتیاندا تێپەڕی و گوتی:

- ئاریناڤلاسۆنا فەرموویان پێتان بڵێم چای حازرە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ هەستا سەرپێ و پرسیاریکرد:

- قەیماغی ساردمان بە شاتووە دەوێت؟

- بەڵێ ئاغا.

- وریابە حەتمەن دەبێ ساردبێ.ئارکادی نیکۆلاییۆڤیچ بۆچی ڕاوەستاوی و لەو شاتووانە ناخۆی؟بۆچی یۆگینی نایەت؟

بازارۆف لە ژوورەکەی ئارکادیەوە بانگی کرد:

- من لێرەم.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ خێرا ڕووی وەرگێڕاو گوتی:

- ئاوا،نیازت بوو سەرێك لە هاوڕێکەت بدەی بەڵام دەڵێی وەدرەنگ کەوتووی.ئێمەپێکەوە زۆرمان قسەکردو ئێستاش دەچین چای دەخۆینەوە.دایکت بانگ مان دەکات.پێشم خۆشبوو قسەم لەگەڵ کردبای...

- دەربارەی چی؟

- ئێرە پیرەپیاوێکی لێیە تووشی زەردوویی بووە.

- زەردوویی؟

- بەڵێ،زەردوویی.ئەویش زەردوورییەکی سەخت.چەند گیایەکی پزیشکیم دایەو پێمگوت کە دەبێ گیزەرو سۆدەش بخوات...بەڵام ئەوانە تەنیا هێورکردنەوەن.دەبێ ڕێگایەکی دیکە وەبینین.هەرچەندە تۆپێکەنینت بەزانستی پزیشکی دێت بەڵام دڵنیام دەتوانی یارمەتیمان بدەی...لەو بارەیەوە پاشان بە دوورو درێژی قسەدەکەین.ئێستا واباشە بچین و چای بخۆینەوە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەسەر نیوتەختەکە هەستاو بەخۆشحاڵییەوە دەستی کردبەخوێندنەوە:

( وەرە وێکڕایاسایەك دابنێین

کەپێی بە شادی و بەخۆشی بژین)

بازارۆف لە کاتێکدا لەبەرپەنجەرەکە دوور دەکەوتەوە لەبەرخۆیەوە گوتی:

- چەندەپیرەمێردێکی سەیرو زیندوویە.

* * *

نیوەڕۆ خۆر وەکو مسێکی سوورەوەبوو لەپشت هەورە کانەوە بەسەر هەمووشتێکدا بڵاو دەبۆوە.بێدەنگی باڵی بەسەر هەمووشتێکدا کێشابوو تەنیا دەنگی قووقەی کەڵەشێرەکانی ئاوایی دەبیستران،کە بەقوقەی خۆیان وەڵامی پرسیارەکانی یەکتریان دەدایەوەو هەرکەسێك گوێی لێبان هەستی بەخەمناکی و خەوبردنەوە دەکرد.دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا لەچڵەپۆپەی درەختێکەوە چریکەی باڵندەیەکی بچوك دەهات.

ئارکادی و بازارۆف لەژێرسێبەری قۆریە گیایەك پاڵکەوتبوون و هەریەکەیان یەك دوو مەڵۆ گیایان خستبووە بن ئانیشکیان.بازارۆف گفتوگۆی دامەزراند:

- ئەو درەختەی لەوێیە ڕۆژانی منداڵیم وەبیر دێنێتەوە.ئەوکات پێموابوو ئەو درەختەو ئەوگالێشە تەلیسم دروستدەکەن.چوونکە هەرکاتێك لەلایان دادەنیشتم هەرگیزهەستم بەخەم و پەژارە نەدەکرد.ئەوکات نەمدەزانی چونکە منداڵ بووم و هەستم بەخەم نەدەکرد بەڵام ئێستا کە گەورەبووم ئیدی ئەو سیحروجادووە هەرگیز لەمندا شوێنەواریان نەماوە.

- هەمووی چەند لێرەبووی؟

- دووساڵی تەواو پاشانیش ماوەماوە سەری ئێرەم دەدا.ژیانم وەك ژیانی قەرەجان وابوو.بەردەوام لە شارێکەوە بۆشارێك دەچووم.

- واپێدەچێ ئەو خانووە زۆرکۆن بێ؟

- بەڵێ،زۆرکۆنە.باپیرم یانی باوکی دایکم ئەو خانووەی دروستکردووە.

- باپیرت چۆن بنیادەمێك بوو.؟

- خوداباشتردەزانێ.ئەو بەپلەی سەرهەنگی دووەم لەلیوای (سۆرۆف) خزمەتی دەکردو هەمیشەباسی لە لەشکرکێشی کێوەکانی ئالی دەکرد...ڕەنگە لەوبارەیەوە زۆریشی خۆهەڵکێشابێ.

- کەوایە هەربۆیە وێنەی سۆرۆف لەژووری میوانیتان هەڵواسراوە.من زۆرماڵی گەرموگوڕی وەك ماڵی ئێوەم پێخۆشە.لەو ماڵانەداهەست بە بۆنێکی تایبەت دەکەی.

بازارۆف بە باوێشکدانەوە گوتی:

- بۆنی تایبەت،بۆنی چرای ئەوپایانەیە...چەندەی مێش لێن.لەو ماڵە ناسك وکۆنانە...

بازارۆف بێدەنگ بوو ئارکادیش ماوەیەك هیچی نەگوت پاشان لێی پرسی:

- دەمویست بزانم دایك و باوکت لە دەورانی منداڵیتدا زۆرت لەگەڵ تووندبوون؟

- تۆ ئەوانە دەبینی.ئەوانە هیچ کاتێك تووندنەبوون.

- یۆگێنی،ئایابەڕاستی ئەوانت خۆشدەوێن؟

- بەڵێ،ئارکادی.بەڕاستی خۆشمدەوێن.

- ئەوان وەك شێتان خۆشیان دەوێی.

بازارۆف بێدەنگ بوو.دوای ئەوەی دەستی وەبن سەریدا گوتی:

- دەزانی بیرلەچی دەکەمەوە؟

- نا،نازانم.

- بیرلەوە دەکەمەوە کە دایك و باوکم ژیانێکی خـۆش و باشـیان هـەبووەو هەیانـە.باوکم لەتەمەنی شەستساڵیدا هێشتا لەبیری خانوو درووستکردندایە،بەچارەسەری خەڵکی ڕادەگـاو لەگەڵ ڕەعیەتەکان بەمیهرەبانی دەجولێتەوە.بەکورتی ژیانێکی خۆشی هەیە.دایکیشم ژیانێکی باشی هەیە.ڕۆژێ هێندە سەرقاڵی کاری ماڵێیە کە کاتی بیرکردنەوەی نییە.بەلاّم من...

- بەلاّم تۆ؟

- بەلاّم من...منێك کە لەژێر ئەو قۆریەگیایە درێژبووم ڕۆژگارێکی لەبن نەهاتووم لەپێشە کە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بەمنەوەنییە.یان بەشێکی زۆر کەمی هی منە.ئەو بەشەی مـن هێندەبچوکە کەلانی کەم هەرهیچ نییە....ئـەوکاتیش لـەو گەردیلەیە،لەوخاڵـەی ماتماتیکـە کەمێك خوێن دێت و دەچـێت و دەچـێ و ئـاواتی زۆرن...چـەندە گاڵتەجاڕیە!هـەموو ئەوانـە پووچوو بێهوودەن.

- با ئەوەشت وەبـیر بێنمـەوە کـە ئەوانـەی دەیـان لێـی پەیوەنـدی بەهـەموو بوونـەوەرە زیندوەکانەوەهەیە.

- بەڵێ،ڕاستە.دەمویست ئەوەبڵێم کە ئەوانە یانی دایك و باوکم زۆرسـەرقاڵی کاروبـاری خۆیانن هیچ بیرلەحاڵ و باڵی خۆیان ناکەنەوەو لەو بارەیەوە هەست بەنیگەرانی ناکەن....بەلاّم من...جگەلەخەم و پەژارەو کینە هیچ هەستێکی دیکەم نییە.

- کینە؟بۆچی کینە؟

- بۆچی؟بۆ مەگەرلەبیرت چۆتەوە؟

- نـــا،من هیچـــم لەبیرنەچـــووەو لەگـــەڵ ئەوەشـــدا ڕێگـــات نـــادەم دووچـــاری ڕق ببیتەوە.بەڵێ،قبووڵمە تۆ بنیادەمێکی بەدبەختی بەلاّم...

- ڕاسته.ئارکادی نیکۆلاێۆڤیچ دەبینم تـۆش دەربـارەی عـەشـق هەسـتێکی وەك هەسـتی هەرزەکارانت هەیە.ئەوانە تەقریبەن بەتەواوی وجودیانەوە بـەدوای مەعشـوقەکەیان ڕادەکـەن بەلاّم کاتێك مـەعشوقە کەیان ڕووی تێکردن بەپەلەپەل ڕادەکەن.بەلاّم من وەك ئەوانـەنیم...با وازلەوەبێنین.باسکردنی شتێك کە دەرمانی نەبێ بێهوودەیە.

پاشان پالّیدایەوەو درێژەی دایە:

- ئـەو مێـروە بچـووکەی ببینـە کەچـۆن ئەومێشـە نیوەگیانـەی ڕادەکێشـێ.هەولّبدە براله.ڕایکێشەو بیبە.لەوەی کە هەولّدەدا.نائومێێد مەبە.لە هیچ شتێك هەست بـە نیگـەرانی مەکە.تۆ گیانلەبەری و وەك ئێمەی مرۆڤ هێزێکی بەناوی ویژدانت نییە کە بتهاڕێ.

- یۆگینی،دەتوانی پێم بلّێی تۆ کەی خۆت هاڕیووە؟

بازارۆف سەری هەلّێناو گوتی:

- ئەوە تەنیا بابەتێکە کە شانازی پێوەدەکەم.ئێستا من خۆم تێکنەشکاندووە هیچ کاتێـك ژنێك ناتوانێ من تێکبشکێنێ.هەرئەوەندەو بەس.پێویستەواز لەوەبێنین.

هەردووکیان بێدەنگ بوون تا ئەوەی دووبارە بازارۆف دەستیپێکردوە:

- بەلّێ،مرۆڤ بوونەوەرێکی سـەیروغەریبە.ئەگەر دووراودوور سـەیری ژیـانی باوکـەکانمان بکەین دەبینین چ ژیانێکی ئاسوودەو باشیان هەیەو چ شتێك لەوەی باشتر؟بنووبخۆو دلّنیابە کـە باشترین ژیانت هەیە...بەلاّم نا.بەو دۆخەوە خەم و پەژارە بەسەرژیانی مرۆڤـدا زالّـدەبێ.مرۆڤ حەزدەکا لەگەلّ خەلّك تێکەلّبێ...ئەگەر بەجنێویش بێ ، بەلاّم حەتمەن دەبێ لەگەلّیان تێکەلّ بێ.

ئارکادی بیرمەندانە گوتی:

- دەبێ وابژی کە هەر لەحزەیەك گرنگی خۆی هەبێ.

- ئەوەچ قسەیە دەیکەی؟ ئەوەی بەلای تۆوە گرنگە ئەگەرچی دەکرێ شـیرین و دلّگیریـش بێ بەلاّم دەکرێ تێکەلاّو بەدرۆو ڕیاش بێ.لەگـەلّ ئەوانەشـدا دەکـرێ لەگـەلّی ڕابێی...بـەلاّم بەداخەوە ژیان جگە لەپرتەو بۆلّەی گەورەوبچوك لەسـەر بابـەتی دواکـەوتوو لاوەکـی هـیچ شتێکی دیکەنییە.

- ئەگەرمرۆڤ بۆ خۆی نەیەوێ هیچ کاتێك کێشەی بۆ درووست نابێ.

- ئاها...بەلاّم ئەو قسەیەی تۆ کردت پێچەوانەی داب و نەریتە.

- چۆن؟مەبەستت چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە بۆنموونە ئەگەر بلێی کلتوور شتێکی بەکەڵکە ئەوە بڕیاردانێکی گشتییە کە نەریتیش قبووڵی دەکا. بەلاّم ئەگەر بلێی کلتوور زیان بەخشە ئەو کاتە نەریت قبووڵی ناکا.ئەودوو دەربڕینە تەنیا وشەکانیان بەیەکەوە لێك جیان بەلاّم لەڕاستیدایەکن.

- ئەدی ڕاستی لەکام لایە؟

- لەکام لا؟ وەلاّمی من لە دەنگدانەوەی دەنگی تۆدایە.کام لا؟

- یۆگینی، دەڵێی ئەمڕۆ لەکەللەی داوی؟

- پێموایە هەقی تۆیە.هەتاوی ئەمڕۆ زۆر بەتینە...سەرەڕای ئەوەش خواردنی تووتڕکیش زیاد لەپێویست زیان بارە.

- کەوایە باشتروایە بخەوین.

- بەڵێ،دەبێ وابکەین.بەلاّم تکادەکەم لەکاتی نووستندا سەیرم مەکە.چوونکە ڕووخساری مرۆڤێك کە نووستووە حاڵەتێکی گەمژانەی هەیە.

- بۆمەگەر ئەو بابەتە بەلاتەوە گرنگە کە خەڵکی لەبارەی تۆوە چۆن بیردەکەنەوە؟

- نازانم چۆن وەلاّمت بدەمەوە.مرۆڤی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە هەرگیز ئەو شتانەی بەلاوە گرنگ نەبن.مرۆڤی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە یاندەبێ پەیڕەوی لێبکا یان دژی بێت.

ئارکادی بیری کردەوەو گوتی:

- زۆرسەیرە.من ڕقم لەکەس نابێتەوە.

- بەلاّم من لەزۆران. تۆ زۆر میهرەبان و دڵسافی ڕێك وەك...چۆن دەتوانی هەستی ڕق لێبوونەوەت هەبێ لەکاتێکدا بڕوا بەخۆبوونی پێویستت نییە.

ئارکادی قسەکانی پێبڕین و پرسی:

- تۆ ئەو بڕوابەخۆبوونەت هەیە؟ تۆ بڕوات بەخۆت هەیە؟

بازارۆف کەمێك بێدەنگ بوو پاشان بەپێداگرتن لەسەر هەروشەیەك گوتی:

- هەر کاتێك لەگەڵ کەسێك ڕووبەڕوو دەبم ئەگەر کەسەکە گوێڕایەڵم نەبێ ئەو کاتەبیروڕام پێچەوانە دەکەمەوە.بێزاربوون،بەڵێ،بێزاری،بۆنموونە ئەمڕۆ بەلای خانووی فیلیپ کوێخای ئاواییدا تێپەڕیم،تۆ گوتت: (خانوویەکی چەندەسپیە! ڕووسیا ئەو کاتە بەختەوەردەبێ کە هەژارترین گوندنشینەکانی خانوویەکی ئاوایان هەبێ.ئەوەش ئەرکی ئێمەیە کە لەوڕێگایەدا

تێبکۆشین...) بەلاّم من لەهەولّ و تێکۆشان بۆ ئەو فلیپانەو هەتا نەبیستنی سوپاسێکیش، بێزارم...جگە لەوانەش بەکەڵکی چی دێ؟ گریمان کە ئەویش لەخانوویەکی سپیدا ژیاو لە سەر گۆڕی منیش گیابڕوێ،باشە،ئەدی پاشان چی؟

- وازبێە یۆگینی.ئەگەر ئەمڕۆ کەسێك گوێی لەقسەکانی ئێمەبووبێ دەڵێ ئێمەمرۆڤێکین بڕوامان بە هیچ شتێك نییە؟

- تۆش وەك مامت قسەدەکەی.هەرگیز بنەمایەك بوونی نییە کە ئێمە بڕوامان پێی بێ.چۆنە تا ئێستا نەتتوانیوە ئەوە تێبگەی.لە دنیادا هەمووشتێك بەدەوری هەستدا دەخولێتەوە.

- چۆن؟

- زۆر ئاسانە.بۆنموونە من. گرفتاری هەستی ڕەش بینی بووم . حەزدەکەم هەموو شتێك ڕەت کەمەوە. مێشکی من ئاوا کار دەکات . بۆچی من حەزم لە کیمیایە ؟ بۆچی تۆ حەزت لە سێوە ؟ هەستەکان و هەموو شتێکیش هەر ئاوایە ... مرۆڤ هیچ کاتێك لەوە باشتر بیرناکاتەوە هیچ کەسێکیش ئەو بابەتەت پێ نالێ باوەڕکە منیش جارێکی دیکە ئەو بابەتەت لەگەڵ باس ناکەمەوە.

- بەوپێیەبێ ڕەسەنایەتیش شتێك نییە جگە لەهەست.؟

ئارکادی بەڕاوێژێکی خەمناکەوە گوتی:

- یۆگینی...

بازارۆف قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- دەتەوێ بڵێی چی؟ دیارە ئەوبابەتەت پێخۆش نییە؟نا براله.ئێستا کە نیازی دروونەوەی هەمووشتێکت هەیە دەبێ داس لەپێی خۆشت بدەی.ئێمەزۆر دم بەدمەمان کرد.پۆشکین دەڵێت: (سرووشت بێدەنگی خەو فراوان دەکات)

ئارکادی دژی وەستایەوە:

- پۆشکین هیچ کات شتی وای نەگوتووە؟

- نەیگوتووە؟! بەلاّم ئەو شاعیرەو دەبوایە وەکو شاعیر شتێکی وابڵێ.هەرچەندە پۆشکینیش کەسێکی سووپایی بووە؟

- پۆشکین هیچ کاتێك کەسێکی سەربازی نەبووە.

- کەواتە بۆچی لەهەرلاپەڕەی کتێبێکیدا دەڵێت: (خەبات لەپێناوی ڕووسیا)

- ئەوانە بۆخۆت درووستتکردوون.

- لەخۆمەوە هێناومن؟ هیچ گرنگ نییە؟ بزانە چۆن دەتەوێ بمترسێنی.هەر تۆمەتێك هەتا زۆریش گەورەبێ بیدەیەپاڵ هەر کەسێك ئەگەر باش لێی وردبییەوە دەبینی شایانی لەوەش خراپترە.

ئارکادی بە دڵگرانییەوە گوتی:

- کەوایە ئیزن بفەرموون تا سەرخەوێکی بشکێنم.

- فەرموو،فەرموو.

بەڵام هیچ کامێکیان نەنووستن.جۆرە هەستێکی شەڕانی ناخی هەردووکیانی پڕکردبوو.دوای چەند دەقیقەیەك چاویان هەڵێناو بێدەنگ لە یەکترەوە ڕامان.

ئارکادی لە ناکاو گوتی:

- گەڵای داری ئیفرا هەڵدەوەرن.جولانەوەی ئەو گەڵایە لەکاتی کەوتنەخوارەوەدا وەکو فڕینی پەپوولەوایە.ئەوە سەیرنییە کە مردووترین شت تا ئەو ڕادەیە بەزیندووترینی ئەوانەبچن؟

بازارۆف بەگاڵتەپێکردنەوە گوتی:

- هاوڕێی ئازیز،تەنیا داوا کایەکی کەهەمە ئەوەیە وشەی جوان ڕیزمەکە.

- چۆن ئاسوودەبم واقسەدەکەم...ئەوەش جۆرێکە لەسەرەڕۆیی....شتێك بەمێشکم داهاتووە بۆچی دەری نەبڕم؟

- ڕاستە،شتێك بەمێشکم دا هاتووەو دەری دەبڕم.ئەگەر ڕای منت بوێ شیرین زمانی کارێکی باش نییە.

- چ شتێك جوانە؟ جنێودان؟

- بەه بەه! تۆش ڕێك بوویتەمامت.ئەو گەمژەیە چەندەخۆشحاڵ دەبێ ئەگەر ئاوابتبینێ.

- تۆچۆن لە پاڤێڵ پترۆڤیچ گەیشتووی؟

- هەروەك ئەوەی کەهەیە...گەمژە.

ئارکادی هاواری کرد:

- ئەوەم پێ قبووڵ ناکرێ.

بازارۆف زۆرلەسەرخۆ گوتی:

- دووباره هەستی خزمایەتیت سەری هەڵدایەوە.من تێگەیشتووم کە ئەو هەستە لەناخی مرۆڤە کاندا تاچ ڕادەیەك ڕەگی داکوتاوە.مرۆڤ ئامادەیە ئینکاری زۆرلە پیرۆزیەکانی بکا بەڵام ئامادەنییە ئەوەی قبوولّ بیّ بۆنموونە براکەی دەسماڵێکی دزیووە.ئەوە لەسەرووی تەحەمولی ئەوە.بەڵێ، چۆن دەکریّ کە هاوڕێکەی من نابغەیەك نەبیّ؟! شتێکی ئاوا چۆن دەکریّ وانەبیّ؟

ئارکادی بەتووڕەییەوە گوتی:

- لەناخی مندا هەستی دادپەروەریە کە وەئاگا هاتۆتەوە نەك هەستی خزمایەتی.هەرچەندە تۆ ئەو هەستەش ناناسی و هەقی قسەلەسەر کردنیشت نییە.

- یانی مەبەستی تۆ ئارکادی کیرسانۆف ئەوەیە، کەشعووری من دەرك بەوشتانە ناکا.کەوایە قبوولّمەو پەیڕەوی دەکەم.

- یۆگینی،تکادەکەم وازبێنە.دەترسم تووشی دلّ ئێشان بین.

- ئارکادی وەرەوچاکەیەکم لەگەلّ بکە.کارێکی وابکە یەکتری دارکاری بکەین.

- لەوەی دەترسم کارەکە قۆڕبیّ...

- باقۆڕبیّ.بۆچ عەیبێکی هەیە؟ لێرەو لەوشوێنە دوورە دەست و دوور لەچاوی خەلّکی لەسەر ئەوکایە بۆخراپە؟ من هەرئێستا ملت بادەدەم.بەڵام دەڕۆستم نایەی...

بازارۆف پەنجە درێژەکانی لێککردنەوە.

ئارکادی وەرسووڕاو هەولّیدا بەگاڵتە پارێزگاری لەخۆی بکا.بەڵام ڕووخساری هاوڕێکەی هێندە زاڵمانەبوو کە ئارکادی ترسا.

لەناکاو دەنگی ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ هات کە دەیگوت:

- تەماشا، لەکویّ خۆیان شاردۆتەوە؟

پزیشکی سووپا بەچاکەتێکی کەتان و کلاوێکی حەسیریەوە دەرکەوت و گوتی:

- بەدوای ئێوەدا دەگەڕام بەڵام ئێوە شوێنێکی باشتان بۆخۆشاردنەوە هەڵبژاردووە....لەسەرزەوی درێژبوون و سەیری ئاسمان دەکەن.خۆزگە منیش لەجێگای ئێوەبام.

بازارۆف بەمنگەمنگەوە گوتی:

- ئێمە تەنیا لەکاتی پژمیندا سەیری ئاسمان دەکەین.

پاشان ڕووی لە ئاسمان کردو گوتی:

- له كاتێكی خراپدا هاتی.

ئاركادی لەسەرەخۆ گوتی:

- ئیدی كۆتایی پێبێنە.

بەدزیەوە دەستی هاوڕێكەی گوشی.

بەلاّم هیچ دۆستایەتیەك ناتوانیّ تاقەتی ئـەوجۆرە ڕووداوانـەی هەبیّ.ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ خۆی هاویشتبووە سەر ئەوگۆچـانە سـەیرەی،كەخۆی درووسـتیكردبوو لـەجێگای دەسـكەكەی پەیكەرێكی لیّ قایم كردبوو لە كاتێكدا سەری ڕاوەشاند گوتی:

- سەیری دووهاوڕیّ گەنجەكەم دەكەم...سەیرتان دەكەم و چێژ وەردەگرم....لە ئێوەدا هێزی گەنجی و توانای بەڕادەی پێویست هەیە.ڕێك وەك (كاستۆرو پۆلۆكس)[1]

بازارۆف گوتی:

- چۆن بوو یەكسەر كەوتییە بیری ئەفسانەكانی یۆنان و ڕۆمی كـۆن؟ بەئاسـانی دەتـوانی تێبگەی كە لەكاتی خوێندن لەكاری ئەفسانەدا زۆرپێشكەوتووی.دەڵێی گوتووتـە كـە بـەهۆی نووسینی داڕشتنەوە مەدالیای زیوت وەرگرتووە،وانییە؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ تەنیا گوتی:

- دیۆسكۆری دیۆسكۆری[2]

- بابەگیان لەوە زیاتر پێیان هەڵمەڵیّ.

پیرەمێرد لەبن لێوانەوە گوتی:

- ساڵی جارێك خراپ نییە.بەلاّم كـە بەدواتانـدا دەگـەڕام مەبەسـتێكی دیكـەم هـەبوو، دەمویست بڵێم نانی نیوەڕۆ ئامادەیە.دووەمیش دەمەویّ بەیۆگینی بڵـێم كـە...تۆ گـەنجێكی تێگەیشتووی.زۆرباش ژنان دەناسی و ...دایكت نیازی وایـە بـەهۆی پێوقـەدەمی هاتنـەوەت كۆڕێكی دووعا خوێندن سازبكا. پێویست ناكا تووڕەبی.تۆ ناچانی بەشـداربی چـوونكە كـاری دووعاخوێندن تەواوبووە بەلاّم باوكە ئالەكسی...

- قەشەكەی دەڵێی؟

---

١- كوڕانی زیئۆس.

٢- نازناوی كاستۆر و پۆلۆكسە.

- بەڵێ قەشە.قەرارە نانمان لەگەڵدابخوات.من چاوەڕوانی شتێکی لەو بارەم نەبوو پێشم خۆشنەبووکە...بەلاّم کارلەکار ترازاوە...ئەو لەمەبەستم تێنەگەیشت...جگە لەوەش ئاریناڤلا سۆنا...با ئەوەش بڵێم کە ئەوکابرایە پیاوێکی باش و تێگەیشتوویە.

بازارۆف پرسی:

- خۆبەشی ئێمەناخوات.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەپێکەنینەوە گوتی:

- ئەوەچ قسەیەکەی دەیکەی؟

- منیش ناڕازی نیم و هەرکەسێك بیّ لەگەڵی دادەنیشم.

- دڵنیام کە تۆ لەهەموو دەمارگیریەك بەدووری و کاتێکیش سەیری خۆم دەکەم لەگەڵ ئەوەی تەمەنم شەست و دووساڵە پابەندی هیچ جۆرە دەمارگیرییەك نیم. ( ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەوەی کە دەیەویّ بەشداری کوڕی دووعاخوێندن بیّ شەرمی دەکرد.) باوکی ڕووحانی زۆرحەزدەکا بتناسیّ. تۆش حەتمەن پێت خۆشدەبیّ. یاری وەرەق کردنیشی پیّ ناخۆش نییەو هەتا...با ئەوە لەنێو خۆمان دا وەمێنیّ سەبیلەش دەکێشیّ.

- ئاوا! دوای نیوەڕۆ دەستێك یاری لەگەڵدادەکەم و لێی دەبەمەوە.

- هێندەش دڵنیا مەبە.

بازارۆف گوتی:

- ڕەنگە تۆش کەوتبیتە بیری دەورانی گەنجێتیت؟

ڕوومەتەکانی ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ سوورهەڵگەڕان و گوتی:

- شەرمیّ بکە یۆگینی...ئەوەی ڕابرد ڕابرد.بەڵیّ، پێی لێدەنێم کە لەگەنجیدا هەوای ئەو کارانە لەکەللەی داوم و زەرەرەکەشیم دیوە...ئەریّ هەواکەی زۆر گەرمە.ڕێگام بدەن لەلای ئێوە دانیشم.خۆکاتم نەگرتوون.؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دوای ئەوەی دانیشت  گوتی:

- ئەوشوێنەی ئێوە لێی دانیشتوون دەمباتەوە دەورانی بیابان و سەربازی و مەرکەزی برین پێچی ... ئەگەر کا شمان دەست کەوتبا شوکرانەی خوامان دەکرد.

پیرەمێرد هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو درێژەی دایە:

- له ژیانمدا تووشی زۆرشتان هاتووم.بۆنموونـه ئەگـەرپێتان خـۆش بـێ چـیرۆکی کـۆلێرای بسارابیتان بۆدەگێڕمەوە کە هەر ئێستا وەبیرم هاتەوە...

بازارۆف دەستبەجێ قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- هەمان بەسەرهاتی کە تۆتێیدا مەدالیات وەرگرت...ئەوەم پێشـتریش بیسـتووە...ئەرێ بەڕاستی بۆچی مەدالیاکان بەسنگتەوە ناخەی؟

- پێم گوتبووی کە گرنگی بەوجۆرە شتانەنادەم. ( هەردوێنێ بوو کە ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ دەستووری دابوو تا نیشانەسوورەکەی سەرپالْتۆکەی لێبکەنەوە.)

پیرەمێرد پاشان ڕووداوەکەی کۆلێرای گێڕایەوەو لە کۆتاییدا سەری هێنابن گوێی ئارکـادی و گوتی:

- خەوی لێکەوتووە.

پاشان بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- یۆگینی هەستە بابڕۆین نانی نیوەڕۆبخۆین.

بـاوکی ڕووحـانی پیرەمێردێکـی ڕووخـۆش و لەبـەردلاْن بوو.پرچـی پڕووخورمـایی بـوون و بەسەرجلکە ئاوریشمیەکانیدا هاتبوونەخوار کەمەر بەندێکی چنراویشی بەستبوو.پیاوێکی زیرەکو تێگەیشتووبوو.بێ هـیچ کێشـەیەك تێگەیشـتبوو کـە نـە یـۆگینی و نـە ئارکـادی پێویسـتیان بـەدووعای ئەونییە.دەسـت بـەجێ هـەنگاوی هـەلْێناو دەسـتی ئـەوانی گوشی.لەسـەریەك هەلْسوکەوتی خۆمانەبوو.نەخەلْکی ئازاردەداو نـە خۆیشـی نیگـەران دەکرد.هەنـدێجار گالْتـەی بەدەرسی لاتینی دەکردو هەندێجاریش بە توندی پشـتیوانی لەبەرپرسـەکەی خـۆی دەکـرد.دوای خواردنەوەی دووپێك شەراب،لەخواردنەوەی پێکی سێیەم خۆی بواردو لە بەرامبـەردا پێشـنیاری جگەرەیەکی ئارکادی قبولْ کرد بەلاْم بەبیانووی ئەوەی دەیباتەوە مالْێ نەیکێشـا.ئەوەی جێگـای سەرنج بوو ڕاوەشاندنی دەستەکانی بوو کە مێشەکانی دەڕەواندنەوە یان دەیگرتن.هەنـدێجار لـەو بەربەرەکانییە سەردەکەوت و چەند دانەیەکی دەپلْیشاندنەوە.دوای ئـەوە لەپشـت مێـزی قومـار دانیشت و لەکۆتاییدا دوو ڕۆبلْ و پەنجاکوپەك ئەسکیناسی لە یۆگینی بردەوە.

لەمالْی ئاریناڤلاسۆنا کەس بـیری لـەپارەی زیـو نەدەکردەوە.ئاریناڤلاسـۆنا لـە تەنیشـت کوڕەکەی دانیشتبوو. ئەو یاری نەدەکرد تەنیا وەکو هەمیشە دەستی خستبووە ژێرچـەناگەی و تەنیا کاتێك کە فەرمانیدەدا خواردن و خواردنەوەبێنن لەشوێنی خۆی هەلْدەستا.

لەلا واندنەوەی بازارۆف دەترسا بازارۆفیش ئەوەی دەویست.سەرەڕای ئەوەش ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ وەبن گوێی هەڵێنابوو کە یۆگینی بێزارنەکا چونکە گەنجەکان ئەوەیان پێخۆش نییە.

ڕەنگەپێویست نەکا لەبارەی ئامادەکاری نیوەڕۆخواردن زۆر بدوێین.گۆشتەکە تیمۆڤیچ لەشوێنێکی زۆر دوور هێنابووی.کوێخا خۆی بەدوای پەیداکردنی ماسی و قرژاڵدا گەڕابوو ژنانی ئاوایش بەدوای دەستکەوتنی کارگ چل و دوو کوپەکی سپیان دەستکەوتبوو...

لە چاوەکانی ئاریناڤلاسۆنادا کە بەردەوام لە بازارۆفی دەڕوانی نەك تەنیا خۆشەویستی دەبینرا بەڵکوجۆرە خەمێکیش بەترسەوە دەبینرا.بەلاّم بازارۆف خەمی ئەوەی نەبوو کە لەچاوەکانی دایکیدا چ خەمێك شاردراوەتەوە.بەدەگمەن قسەی لەگەڵ دایکی دەکردو هەموو قسەکانیشیان لەچەند پرسیارو وەلاّمێکی کورت تێنەدەپەڕی.تەنیا جارێك داوای لەدایکی کرد کە وەکوبەخت وەرەقەکانی بۆڕاکێشێ.دایکی بەهێمنی دەستە بچوکو نەرمەکانی لەناو دەستە پان و پتەوەکانی ئەوناو پرسی:

- یارمەتیت ناوێ؟

بازارۆف بەتەوسەوە گوتی:

- خراپتربوو.

ئالکسی دەستی بەڕیشیداهێناو گوتی:

- ئەو بێبوار لەڕووباری دەدا.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ تەکەکەی خۆی لە زەویداو گوتی:

- ئەوە یاسای ناپلیۆنە.

قەشەگوتی:

- هەر بەویاسایەبوو کە بۆسانت هلن دوورخرایەوە.

ئاریناڤلاسۆنا پرسی:

- حەزت لەشەربەتی مێوژنییە؟

بازارۆف لەوەلاّمدا شانی هەڵتەکاند.

* * *

ڕۆژی دوایی بازارۆف بە ئارکادی گوت:

- نا،من بەیانی لێرەدەڕۆم.لێرە بێتاقەت دەبم.حەزدەکەم کار بکەم و لێرەش هیچم پێ ناکرێ.حەزدەکەم بێمەوە گوندەکەی ئێوە.هەمووکەل و پەلەکانی ئیش کردنم لەوێ داناون.لەماڵی ئێوە لانیکەم ئەوەم بۆدەکرێ دەرگا لەسەرخۆم پێوەدەم بەلاّم لێرە بابم دەڵێ ژوورەکەی خۆمت دەدەمێ و بۆخۆشی هەنگاوێکم لێ دوور ناکەوێتەوە منیش لەوەنیگەرانم و دەمەوێ بەتەنێ بم...لەودیو دیوارەکەوە گوێم لەدەنگی ئاخ و ئۆفی دایکمەو کاتێکیش دەچمەلای قسەیەکمان نییە پێکەوە بیکەین.

- دایك و باوکت زۆرخەمبار دەبن.

- دووبارە دێمەوەلایان.

- چ کاتێك؟

- لەکاتی گەڕانەوەم بۆ پترۆس بۆرگ.

- دڵم بەدایکت دەسووتێ.

- دەڵێی بەمیوە سەرنجی بۆلای خۆی ڕاکێشاوی؟

ئارکادی سەری نەوی کردوو گوتی:

- تۆ هەرگیز دایکت ناناسی.ئەو نەك تەنیا ژنێکی میهرەبانە،بەڵکو ژنێکی وریاشە.ئەمڕۆنیو کاتژمێر پێکەوەقسەمان کرد.

- حەتمەن هەمووقسەکانتان دەربارەی من بووە.

- باسەکەمان بە تەنیا تۆنەبووی.

- ڕەنگە تۆ کە لەدەرەوەی باشتربیبینی.ئەگەر ژنێك نیوکاتژمێر بتوانێ لەگەڵ کەسێك قسەبکا ئەوە نیشانەیەکی زۆر باشە.بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەردەڕۆم.

- بەلای تۆوە گرنگ نییە کە هەواڵی ڕۆیشتنتی بدەیەی؟ ئەوانە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بۆ دووهەفتە کە لێرە دەمێنینەوە چ بەرنامەیەکیان داناوە.

- قسەی تۆیە،بەلاّم دەڵێی ئەمڕۆشەیتان چۆتە ناو کەوڵم کە سەرم خستەسەر باوکم.ماوەیەك لەمەوبەر باوکم فەرمانیدابوو تا یەکێك لە ڕەعیەتەکانی دارکاری بکاو کارێکی باشیشی کرد کە ئەو فەرمانەیدا،بەڵێ،کارێکی باشیکردو پێویست ناکا ئاواسەیرم بکەی.کارێکی زۆرباشیکرد چونکە ئەوپیاوە هەم دزبوو هەم مەیخۆرەوەیەکی بێ تام.تەنیاشت

ئەوەبوو کە باوکم نەیدەزانی من ئەوشتانەم زانیوە کاتێك پێی زانی زۆرنیگەران بوو...ئێستاش ناچارم بەڕۆیشتنم باوکم لە ڕادەبەدەر نیگەران بکەم.هەرچەندە زووش لەبیری دەکات.

ئەگەرچی بازارۆف گوتبووی کە ئەومەسەلەیە هێندەگرنگ نییە بەلاّم یەك ڕۆژی تەواوی پێچوو تا توانی باوکی لەو بڕیارەی خۆی ئاگاداربکاتەوە.سەرەنجام لە ژوورەکەی باوکی بە باوێشکدانەوە گوتی:

- بەڕاست خەریکبوو لەبیرم بچێتەوە.فەرمانبدە تا ئەسپەکانمان بەرنەلای فەدۆت تا بۆڕۆیشتن ئامادەیان بکات.

- بۆچما بەڕێز کیرسانۆف نیازی ڕۆیشتنیان هەیە؟

- بەڵێ، منیش لەگەڵی دەچم.

- تۆش دەڕۆی؟

- بەڵێ،ناچارم بڕۆم...تکات لێدەکەم فەرمانبدە ئەسپەکان ئامادەبکەن.

پیرەمێرد بەزمان گیرانەوە گوتی:

- زۆرباشە...بۆڕۆیشتن...ئامادەیان دەکەم...بەلاّم...بەلاّم...ئاخر...

- ناچارم بۆ ماوەیەکی کەم بچمەلای و پاشان دەگەڕێمەوە.

- بۆماوەیەکی کەم...زۆرباشە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دەسرەکەی لەگیرفان دەرهێنا داهاتەوە تا قوڕگی پێ پاك بکاتەوە.

- دەتوانم چی بکەم...هەمووشتێك ئامادە دەبێ بەلاّم...پێموابوو کەتۆ...زۆرترلەلامان دەمێنییەوە...ئاخردوای سێ ساڵان،سێ ڕۆژ زۆر کەمە.

- پێمگوتی زوو دەگەڕێمەوە پێمگوتی ناچارم دەبێ بڕۆم.

- ناچاری؟...گرنگ نییە...ئەرك لە هەمووشتێك لەپێشترە...دەڵێی ئەسپەکان بنێرم؟...

هەرچەندە من و ئارینا بەهیچ شێوەیەك چاوەڕوانی شتێکی وامان نەدەکرد...تازە لەماڵە دراوسێکەمان هەندێك گوڵی هێنابوو تاژوورەکەت بڕازێنێتەوە.(ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ سەبارەت بەو بابەتە شتێکی نەگوت کە ڕۆژانە بەپێخواسی ڕاوێژ بەتیمۆڤیچ دەکات و بە دەستە لەرزۆکەکانی پارە دڕاوەکانی دەمستێ داوێ تابچێت شەراب و خواردن و ئەوشتانەبێنێ کە دووگەنجەکە حەزیان لێیبوو.) دیارە ئازادی لەهەمووشتەکان گرنگترە...ئەوە گەورەترین تێزە کەمن بڕوام پێی هەیە...بەڵێ،من بەزۆر کار بەسەرکەسدا نا سەپێنم.

لەناکاو بێدەنگ بوو بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت.

- بەڵام باوەڕم پێبکە باوکە بەزوویی یەکتردەبینینەوە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ،تەنانەت ئاوڕیشی نەدایەوە تەنیا دەستی ڕاوەشاندو چۆدەرێ.کاتێك گەیشتە ژووری نووستنەکەی خۆی ئاریناڤلاسۆنای دیت کە خەوی لێکەوتبوو.لەبن لێوانەوە دووعای شەوی خوێندوو هەوڵیدا هاوسەرەکەی وەخەبەرنەیەنێ لەگەڵ ئەوەشدا ئاریناڤلاسۆنا وەخەبەرهات و گوتی:

- ئەوە تۆی ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ؟

- بەڵێ،خۆمم.

- لەژووری نیۆشا دێیتەوە؟ دەتزانی...دەترسم شوێنی نووستنەکەی باش نەبێ.بە ئانفیسیام گوتووە تا سەرین و دۆشەکەکەی تۆ بباتە ژوورەکەی ئەو.ویستم دۆشەکە تووکەکەی خۆمانی بدەمێ بەڵام وەبیرم هاتەوە کەئەوحەزی لەشوێنی نەرم نییە.

- گرنگ نییە.ئازیزەکەم.گوێ مەدەیە.

پاشان دەستیکردەوە بەدووعاخوێندن و گوتی:

- خودایە لە گوناهەکانمان خۆشبە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دڵی بەحاڵی خۆی و هاوسەرەکەی سووتا بەڵام نەیویست بەو نیوەشەوە ئەوخەبەرە ناخۆشەی بداتێ.بۆ سبەینێ ئارکادی و بازارۆڤ ڕۆیشتن.هەر لەوکاتەدا بێدەنگی باڵی بەسەر ئەوماڵەدا کێشا.چەند دەفرێك لەدەستی ئانفیسا کەوتن و شکان.تەنانەت فەدکاش پێی سەیربوو کەچ شتێك بۆتە هۆکاری ڕۆیشتنی میوانەکان،هەچەندی بیریدەکردەوەو لێکی دەدایەوە بیری بەهیچ شتێك نەدەگەیشت سەرەنجام لەبیرکردنەوە ماندووبوو پێڵاوەکانی داکەندن.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لە هەموان زیاتر شڵەژابوو.هەوڵیدەدا خۆی ئارام نیشان بدا.بەدەنگی بەرزقسەی دەکردو هەنگاوی هەڵدێنان.بەڵام دەم وچاوە باریك و کزەکەی بەردەوام بەدوای بازارۆڤدا دەگەڕا.

ئاریناڤلاسۆنا بێدەنگ فرمێسکی دەڕشت.ئەگەر مێردەکەی بەیانی دووسێ کاتژمێر دڵی نەدابایەوەو ئامۆژگاری نەکردبا حەتمەن وەزگی دەدا.

کاتێك بازارۆف دوای دووپاتکردنەوەی ئەو بەڵێنەی کە مانگێکی دیکە دەگەڕێتــەوە،خۆی لەباوەشی باوکی دەرهێناو لەناو گالیسکەکە دانیشت.کاتێك ئەسپەکان جولاَن و زەنگوڵەکانیان زرنگاندنەوە تایەی گالیسکەکەش کەوتنەسووڕان.

وەختێك لەبەرچاوان ونبوون و تەنیا تەپوتۆز دەبینرا،تیمۆڤیچ بەلەش و لاری چەماوەو لــەر زۆکــەوە گەڕایــەوەماڵێ.کاتێك دایــك و بــاوکی پــیر لەماڵێکــدا کــە دەتگــوت لەپڕێکــدا پیروپەککەوتەبوون بەتەنێ مانەوە.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کە ماوەیەك لەمەوبەر قیت و قنج لەپەنا دەرگــا ڕاوەســتابوو وەك گــەنجان دەســرۆکەی هەڵدەســووڕاند لەســەر کورســیەکە کرووشــم هەلاَتبوو.سەری بەردابۆوەو ورتەورتی دەکرد:

- بەجێی هێشتین.بەڵێ،بەجێی هێشتین.لێمان وەڕەزبوو.ئێستا بەتەنێ ماینــەوە ڕێــك وەك پەنجەی دەستێك.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کاتێك ئەو قسەیەی دەکرد پەنجەی گەورەی جیاکردەوەو تێیەوەڕاما.

ئارینافلاسۆنا هاتەلای.سەری وەسەری مێردەکەی کردو گوتی:

- دەتوانین چی بکەین ڤاسیا؟ کــوڕ وەك باڵندەیــەکی ڕاوکــەرە.وەك شــەهێنە.هەر کاتێــك حەزی لێبێ دێت و هەر کاتێکیش پێی خۆشبێ دەڕوات.بەلاَم من و تۆ وەك مووروەدارێك وایــن کە ناتوانین بێین و بڕۆین.ئێمە هەمیشەپێکەوە دەبین.

ڤاسیلی ئیڤــانۆڤیچ دەســتی لــە دەموچــاوی کــردەوەو هاوســەرو هــاوڕێی چەندســاڵەی وا لەباوەشگرت کە تەنانەت لەدەورانی گەنجیشدا ئاوای لەباوەش نەگرتبوو.

ئارینا مەرهەمێکی لەسەردڵە بریندارەکەی دانابوو.

## (٢٢)

هەردووکیان بەدرێژایی ئەورێگایە یـەك دوو قسـەنەبێ بەیەکـەوەیان نـەکرد.بازارۆف ئـەو کارەی کە کردبـووی لێـی ڕازی نـەبوو ئارکـادیش هێنـدەی خۆشنەدەویسـت.بازارۆف خـەم و پەژارەیەك دایگرتبوو کە تەنیاگەنجان دووچاری دەبن.

گالیسکەچی ئەسپەکانی گۆڕین و هەرکە لەجێی خۆی دانیشتەوە پرسی:

- بەلای ڕاستدابڕۆم یان بەلای چەپدا؟

ئارکادی لەشوێنی خۆی تەکانێکی دا. ڕاستەڕێیەکە بەرەولای شارو ماڵی خۆیان دەڕۆیشت و ڕێگای دەستی چەپیش بەرەولای ماڵی ئادینسۆڤا.

ئارکادی چاوی لە بازارۆفەوە بڕی و پرسی:

- یۆگینی،بەرەولای چەپ؟

بازارۆف ڕووی وەرگێڕاو لەبن لێوانەوە بەپرتەپرت گوتی:

- ئەوەچ کارێکی گەمژانەیە.؟

- دەزانم کارێکی گەمژانەیە.بەلاَم چی تێدایە؟بۆ چما ئەوە یەکەم جارە؟...

بازارۆف کلاَوەکەی هێنا سەر ناوچەوانی و گوتی:

- چۆنت پێخۆشە باوابێ.

ئارکادی هاواریکرد:

- بەرەولای چەپ!

گالیسکە بەرەولای نیکلسکۆی وەڕێکەوت.دوای ئەو کـارە گەمژانەیـە هـەردووك هـاوڕێ بێدەنگ بوون.تەنانەت تووڕەش دەهاتنەبەرچاو.

* * *

هەرلەو پێشوازیەی کە خزمەتکارەکەی ئادینسۆڤا لێیکردن تێگەیشـتن کارەکـەیان چـەندە گێلانەبووە.تێگەیشتن کە عەقڵ خستنە ژێر ڕکێفی دڵ چەندە کارێکی شێتانەیە.هیچ کەس لـە چاوەڕوانی هاتنیاندا نەبوو.ناچاربوون بەقیافەی گێلانەیان تا کاتی هاتنی ئادینسۆڤا لە ژووری

پێشوازیدا بمێننەوە.ئانا هەرچەندە بەمیهرەبانی هەمیشەیی خۆیەوە پێشـوازی لێکـردن بـەڵام دەرکەوت کە لە هاتنیـان سـەری سـوورماوە.تا ئەوجێگایـەی لـە هەڵسـوکەوتی بەپەلەپـەلی دەخوێندرایەوە هەرگیز لە هاتنیان خۆشحاڵ نییە.دووهاوڕێ گەنجەکە بەشڵەژانەوە گوتیان پێیان باشبوو لە گەڕانەوەیاندا سەرێکیان لێبدەن و لەچەند کاتژمێرێك زیاتر نامێننەوە.ئادینسۆڤاش تەنیا بەنیشاندانی سەرسووڕمانی لێگەڕاو پاشان بە ئارکادی گوت سڵاوی بە باوکی بگەیەنێ و بەدوای پووریدا نارد.شازادەخانم بەدەم و چاوی خەواڵو و پڕلە گنج و لۆچەوە کە ئەوی لـەجاران تووڕەتر نیشاندەدا دەرکەوت.کاتیا نەخۆشبوو لە ژوورەکەی نەهاتەدەر.

ئارکـادی تێگەیشـت کەمـەیلی دیـداری کاتیـا بـۆوی هـیچ کەمترنییـە لـە دیـداری ئاناسرگیۆنا.چوار کاتژمێری تەواویان بەباسی بابەتی دواکـەوتوویی تێپەڕاند.ئاناسـرگیۆنا بـێ ئەوەی بزەیەکی بێتێ هەم قسەی دەکرد هەم گوێی لەقسەی میوانەکانی ڕادەگرت.تەنیا کـاتی ماڵئاوایی هەمان سۆزی پێشووی تێدا دەرکەوت و گوتی:

- من ئێستا کەمێك خەمبارم.هیوادارم لێم دڵگیر نەبوون.تکاتان لێدەکەم کـە توانیتـان دووبارە سەرمان لێبدەنەوە.

لەبەرامبەردا ئارکادی و بازارۆف ئیکلامێکیان کێشـاو چـوونەوە نـاو گالیسـکەکەیان.بێ ڕاوەستان بەرەوشوێنی مەبەست وەڕێکـەوتن و شـەوی دواتـر گەیشـتنەجێ.بە درێـژایی ڕێگـا هیچیان باسی ئادینسۆڤایان نـەکرد.بازارۆف تەقریبـەن هـیچ قسـەیەکی نـەکردو بەدرێـژایی ڕێگاکە لەجادەکەوە ڕاما.

کاتێــك گەیشــتنەجێ هــەموو لــە دیتنیــان زۆرخۆشــحاڵ بوون.ونبــوونی لــە ڕادەبــەدەری ئارکادی،ببووەهۆی خەم و پەژارەی نیکۆلای پترۆڤیچ.هەرکە فنیچکا بەچاوە گەورەکانییەوە هاتـەژوورو هاتنی میوانەکانی ڕاگەیاند،نیکۆلای پترۆڤـیچ لەخۆشـیان هـاواریکردو پێـی ڕاوەشـاندن.هەتا پاڤێـل پترۆڤیچـیش لــەهاتنیان خۆشــحاڵ بــوو و دەســتی گوشــین.دەرگای گفتوگــۆ لــە هەموولایــەك کرایەوە.ئارکادی لەهەموان زیاتر قسەی دەکردو ئەو گفتوگۆیە تانیوەشەو درێژەی کێشا.

نیکۆلای پترۆڤیچ بەخۆشی کوڕەکـەی، ئـەو بتڵەشـەرابانەی کـە لەمۆسـکۆوە هێنـابوونی کردنیــەوەو بۆخۆشــی هێنــدەی خــواردەوە کــە کوڵمــەکانی ســوورهەڵگەڕابوون.بەردەوام پێدەکەنی.پێکــەنینێکی بــە تــەواوی وجــودی و لــەناخی دڵیەوە.خۆشــحاڵیەکەی کــاری لەخزمەتکارەکانیشی کردبوو.

دوونیا بەردەوام دەهات و دەچوو دەرگاکانی دەکردنەوەو پێوەی دەدان.پیووتەریش هەوڵیدەدا بەگیتارەکەی ئاوازێك بژەنێ.کە پەنجەی بەگیتارەکەدا دێنا ئاوازێکی دڵگیروخەمناك بە هەوادا بلاو دەبۆوە بەلام زۆر زوو دەنگی کیتارەکە کپ دەبوو.پیووتەر زۆرهەوڵیدا تا ڤالسی بژەنێ بەلام هیچ کات لە پێشەکیەکە زیاتر نەدەڕۆیشت.سرووشت توانای مۆسیقای وەك هەموو تواناکانی دیکەی لێوەرگرتبۆوە.

*　　*　　*

سەرەڕای ئەوانەش،ژیان لە مارینۆ هێندەساناو ئاسان نەبوو.نیکۆلای پترۆڤیچی بێچارە لە هەموولایەکرا کێشەوگرفتی بۆ درووست دەبوو.کوێرەوەری زەوی و زارو کاری کێڵگە هیچ کات تەواو نەدەبوو لەهەمووش خراپتر حاڵی کرێکارانی کێڵگەبوو.قەت نەیدەتوانی لەگەڵیان بسازێ.هەندێکیان داوای کرێی زیادیان دەکرد دەنا کارەکەیان بەجێ دەهێشت و دەڕۆیشتن.هەندێکیش هەرکە پێشەکی پارەکەیان وەردەگرت لێیاندەداو دەڕۆیشتن و هەرگیز نەدەگەڕانەوە.ئەسپەکان نەخۆش و سەکەت ببوون.زین و لغاوی ئەسپەکان لەکۆنیان ڕزیبوون.لەبەڕێوەبردنی کارەکاندا هیچ پێشکەوتنێك نەدەبینرا.

نیکۆلای پترۆڤیچ داوای کڕینی خەرمان کوتێکی کردبوو بەلام هەرکە ئامرازەکەهات،تێگەیشت بەهۆی قورسی لەڕادەبەدەری کەڵکی لێوەرناگیرێ.نیوەی ئاغەڵەکەی بەوهۆیەوە سووتابوو کە یەکێك لەڕەعیەتەکان کە پیرەژنێکی کوێربوو بەمەبەستی ئالیکدانی مانگاکەی بە مەشخەڵێکەوە هاتبووە ناوئاغەڵەکەوە....بەلام پیرەژن پێداگری دەکرد کە هۆکاری ئاگرکەوتنەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێداگریەکانی ئاغا لە درووستکردنی پەنیر بەشێوەی تازە.

سەرکارەکەشی دووچاری تەمبەڵی و سستی ببوو.ئەوە تایبەتمەندی هەرکەسێکی ڕووسییە کە دەستی گەیشتە نانی مفتە دەستبەجێ قەڵەودەبێ.سەرکاریش هەموو ڕۆژێ قەڵەو تردەبوو.هەرکە نیکۆلای پترۆڤیچی دەدی بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە بەردەوام خەریکی کارەکانییەتی پەلەدارێکی تاو دەدایەو دەیهاویشتە بەرازێك یان تانەو تەشەری لە مێرمنداڵێك دەدا.بەلام ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە زۆربەی کاتەکانی بەخەو بەسەردەبرد.

ڕەعیەتەکان لەپێدانی بەشی ئاغا خۆیان دەبواردو لە دارستانەکەی داریان دەدزی.بەردەوام هەمووشەوێك پاسەوانی دارستان هەندێ کەسی دەستگیر دەکردو هەندێجاریش دوای بگرەو بەردەیەکی زۆر ئەسپی دزەکانیان بەغەنیمەت دەگرت و دەیان هێنان.سەرەتا نیکۆلای پترۆڤیچ بڕیاریدا بۆئەوەی تەمبێ یان بکا، بۆماوەیەك ئەسپەکان لەلای خۆی بگێڕێتەوە بەلام ئەنجامی کارەکەی هیچ نەبوو جگەلەوەی چەند ڕۆژان ئەسپەکان وێنجەی مفت بخۆن.

لەهەمووی خراپتر ئەوەبوو کە هەندێجار لەنێو ڕەعیەتە کانیشدا شەڕوهەرا درووستدەبوو.بۆنموونە دووبرا کەماوەیەکی زۆر بەیەکەوە ژیابوون لەبەر ئەوەی ژنەکانیان پێکەوە دانوویان نەدەکولا کەوتنە گیانی یەکتری و دوای ئەوەی باش یەکتریان دارکاریکرد بەسەروسەکوتی شین هەڵگەڕاوەوە هرووژمیان بردە دەفتەری ئاغا، تا داوەریان بکا.وەك هەمیشە سەرەنجامی هەر دەمەقاڵەیەك داوەریەکەی دەدرایە نیکۆلای پترۆڤیچ.دادوهاوارو گریانی ژنەکان تێکەڵ دەبوون.نیکۆلای پترۆڤیچیش ناچاربوو گوێ لەقسەی هەردوولا ڕابگرێ لەگەڵ ئەوەی دەیزانی کە ڕێگا چارەیەك بۆ کێشەکە نادۆزێتەوە،هێندە هات و هاواری دەکرد تا دەنگی دەنووسا.

وەختێك کاتی دروێنەهات دروێنەکەرنەبوون.لەگەڵ ئەوەی ڕەعیەتە هاوسێکەی بەڵێنی پێدابوو کە لەکاتی خۆیدا دروێنەکەرەکان دەگەن و بۆ دروونەوەی هەرپەڵەیەك دووڕۆبڵیان دەداتێ تەنیا درۆی دەکردو ئامانجی تەنیا کلاو لەسەرنانبوو.ژنانی ئاوایش بۆ دروێنەکردن داوای هەقدەستێکی زۆریان دەکردو گوڵەگە نمەکانیش لەحاڵی وەریندابوون.ئەنجومەنی گوندیش پێیان دەکەوشێ نابوو کە دەبێ نیکۆلای پترۆڤیچ سووی ئەوپارانەی کەوەری گرتوون دەبێ بیاندا.

چەندانجار نیکۆلای پترۆڤیچ لەو پەڕی نائومێدیدا هاواریکردبوو گوتبووی:

- ئیدی جاڕس بووم،بۆخۆشم ناتوانم لەگەڵیان دەستەو یەخەبم.لەلایەکی دیکەشەوە پێموایە کە هێنانی پۆلیسیش پێچەوانەی مرۆڤایەتییە،هەرچەندە ئەوانە ئەگەر بە ترس و تەمبێ کردن نەبێ هیچ کارێك ناکەن.

پاڤێڵ پترۆڤیچ بەزمانی فەرەنسی وەلامی دایەوە:

- لەسەرخۆبە. لەسەرخۆ.

بەلاّم بۆخۆشی نەیدەتوانی هێمن بێ.لەبن لێوانەوە جنێوی دەدا،لە نیگـەرانیان سمێڵـەکانی دەجوین.بازارۆفیش خۆی لەو گفتوگۆیانە دەپاراست.سەرەڕای ئەوەی ئەو میوان بوو پێی بـاش نەبوو خۆی لە کارێك هەڵقورتێنێ کە پەیوەندی بەوەوە نەبێ.هەر لەگـەڵ گەیشـتنی خـەریکی بۆقەکان و کولاّندنی پێکهاتە کیمیاییەکان بوو.

ئارکادی بە ئەرکی خۆیدەزانی کە ئەگەر نەشتوانێ یارمەتی باوکی بـدات وانیشـانبدا کـە لەهیچ خزمەتێك خۆ نەبوێرێ.بەسـەرنجەوە گـوێی بـۆ قسـەکانی بـاوکی ڕاگرتبـوو تەنانـەت جارێکیش بـۆ چارەسـەری کێشـەکان چەندپێشـنیارێکی کرد.دیـارە چـاوەڕوانی ئـەوە نـەبوو پێشنیارەکانی لەبەرچاو بگرن، تەنیا مەبەسـتی ئـەوەبوو بیسـەلمێنێ کـە کێشـەکانی بـاوکی هەمووو وەك یەك نین.ئەو کاروباری کشتوکاڵی پێ ناخۆش نەوبوو،حەزی لێبوو ئەگـەر بتـوانێ کاری کشتوکاڵی بکا هەرچـەندە ئێسـتا هـۆش و بـیری لـە جێگایـەکی دیکەبوو.نەیـدەزانی بۆچی،بەلاّم زۆربەی کاتەکان هەر لەبیری نیکلسکۆی دابوو.ئەگەر جاران یەکێك پێیگوتبا بـێ تاقەت نابی هێندە لەگەڵ بازارۆفدا دەژی ئەویش لەماڵی بابتدا ئـەوا لـەوەلاّمی ئەوقسـە بـێ مانایەدا شانەکانی هەڵدەتەکاند.بەلاّم ئێستا بەڕاستی هەستی بەدڵتەنگی دەکردو پێی وابـوو گرفتاربووە.بیری لەوە دەکردەوە کە بەگەڕان و پیاسەکردن خەمەکانی دوورخاتەوە بەلاّم ئەوەش دەردی دەمان نەدەکرد.ڕۆژێك لە کاتی گفتوگۆکردندا لەگەڵ باوکی زانی کە نیکۆلاّی پترۆڤـیچ ئەو نامانەی کە دایکی ئادینسۆڤا بۆ دایکی ئارکادی ناردوون لەلای خۆی هەڵی گرتوون.بۆیـە هێندەی پێداگری کرد تا سەرەنجام پیرەمێرد سندووقی نامەکانی هەڵڕشت و نامـەکانی دایکـی ئادینسـۆڤای هێنانـە دەرو ویێدان.هەرکـە نامـە کـۆن و گچـلاّوەکان کەوتنـە دەسـتی ئارکادی،هەستی بەئارامی کرد.دەتگوت کەسێکی ونبووی دۆزیوەتەوە.لەبن لێوانەوە قسەکەی ئادینسۆڤای دووبارە دەکردەوە:

- داوا لەهەردووکتان دەکەم....

سەرەنجام بڕیاریدا:

- دەڕۆم،حەتمەن دەڕۆم.

بەلاّم دوا ڕووبە ڕوو بوونەوەی لەگەڵ ئادینسۆڤا هێنایـەوە بیرخـۆی و ترسـا.بۆیە بڕیاریـدا ئەوجارە بەتـەنێ و بـەبێ یارمـەتی هـیچ کەسـێك ئـەوکارەی بـە تـەمای بـوو جـێ بـەجێی بکات.هێشـتا لـە هاتنـەوەی بۆگونـدی مـارینۆ دە ڕۆژی تێپـەڕ نـەکردبوو کـە بـەبیانووی

خوێندنەوەی ڕێنوێنی (قوتابخانــەی گەورەســالاْن) چــوو بۆشــارو لــەوێوە ڕێگــای نیکلســکۆی گرتەبەر.

لەڕێگادا بەردەوام گالسکە چییەکەی هاندەدا توندتر بڕوات.بەو ئەفسەرە گەنجانە دەچوو کە دەچنە مەیدانی جەنگەوە.لەلایەك دەترساو لەلایەکی تریش تامەزرۆی گەیشتن بوو.بۆ ئــەوەی دڵی خۆی بداتەوە بەخۆی دەگوت هەرگیز نابێ بیر لەوشتانە بکەیتەوە.

لە بەدبەختی خۆی گرفتاری گالیسکە چییەکی بەدفەڕببوو.تووشی هــەر مەیخانەیــەك بــان ئەسپەکانی ڕادەگرت ن و دەیپرسی:

- بخۆینەوە یان نەخۆینەوە.

بەلاْم ئەگەر کەمێك سەری گەرم بووبا ئەسپەکانی لینگدەدان.سەرەنجام سەربانی خــانووی ئادینسۆڤا دەرکەوت.ئارکادی لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە:

- ئەوەچ کارێك بووکردم؟

دەستبەجێ لێی زیادکرد:

- تازە کار لەکارترازاوە.

ئەسپەکان بەچوارناڵە دەڕۆیشتن.گالیسکەچــی فیتــووی لێــدەداو هاوایــدەکرد.دەنگی سمــی ئەســـپەکان لەســـەرپردە دارەکـــە دەبیســـتراو شـــەقامە ڕازاوە بـــەدار کاجـــەکان نزیـــك کەوتنەوە...کراسێکی سووری ژنانە لەوسەری شیناوەردەکە دیاربوو ڕووخساری گەنجێك لــەژێر چەترێکی هاوینە دەرکەوت.

ئارکادی داوای لەگالیسکەچی کرد ئەسپەکان ڕاگرێ لــە گالیســکەکە دابــەزی و چــووەلای کاتیا.

کاتیا کەچاوی پێکەوت سوورهەڵگەڕاو گوتی:

- ئەرێ،ئەوەتۆی؟ وەرە بابچینەلای خوشکم.لەناو باخەکەیە.بێگومان لە دیتنت خۆشــحاڵ دەبێ.

ئارکــادی کــە ئــەو هەڵســوکەوتەی بەشانســێکی بــاش لێکــدابۆوە لەگــەڵ کاتیــا چــووە باخەکە.پێی وانەبوو، لەدیتنی کاتیا هێندەخۆشحاڵ دەبێ تازە هەمووشتێك هەروەکو ئارەزووی دەکـــرد هاتـــەپێش نەخزمـــەتکارێك و نەتەشـــریفاتێك و....لـــە پێچاوپێچـــی کـــۆلاْنێکی باخەکە،ئارکادی ئاناسرگیۆنای دیت کە پشتی لەوان بوو ڕاوەستابوو هەرکــە گــوێی لــەدەنگی

پێیەکان بوو ڕووی وەرگێڕا.ئارکادی زۆری نەمابوو نیگەران بێ بەڵام هەمان وشەی ئاناسرگیۆنا هێوری کردوە. ئانا لە کاتێکدا بەرەولایان دەهات بزەیەکی هاتێ بۆ ئەوەی ڕووی لە باو خۆرنەبێ ئەوانی لەپێش خۆی گرتن و بەمیهرەبانییەوە گوتی:

- سلاو کاکی ڕاکردوو.کاتیا،لەکوێ دۆزیتەوە؟

ئارکادی گوتی:

- ئاناسرگیۆنا،شتێکم بۆ هێناوی کە هەگیز نەتدەتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە.

- تۆ،بۆخۆت هاتووی لەهەموو شتێك باشترە.

# (٢٣)

بازارۆف دوای ئەوەی ئارکادی بەخەم و گاڵتەپێکردنەوە بەرێکردو تێیگەیاند کە دەزانێ بەچ مەبەستێك دەڕوات و دەچێتەکوێ،گەڕایەوە سەر کارەکەی خۆی.حەزو ئارەزوویەکی شێتانەی بۆ کارکردن هەبوو.ئیدی لەنێوان ئەوو پاڤێل پترۆڤیچدا تێکگیران ڕووینەدەدا.بە تایبەتیش ئەو کاتانەی کە پیرەمێرد لە بەرامبەریدا خانەدانانە سنگی ڕەپێش دەخست و بیروڕای خۆی بەپەلەپەل و لەبن لێوانەوە دەگوتن و دیارنەبوو کە دەڵێ چی.پاڤێل پترۆڤیچ لەو بەینەدا جارێك لەگەڵ ئەونیهلیستە گەنجە کەوتە گفتوگۆ ئەویش دەربارەی مافی خانەدانەکانی دەریای باڵتیك کە پاڤێل پترۆڤیچیش بەیەکێك لەوان دادەنرا بەرگری دەکرد بەلاّم لەپڕێکدا قسەکانی بەنیوەچڵی هێشتنەوەو گوتی:

- هەرچەندە ئەوقسانە بێ فایدەن،چونکە ئێمە زمانی یەکتر نازانین.یان باشتروایە بڵێم من شیاوی تێگەیشتنی قسەکانی تۆنیم.

بازارۆف بەسەر سووڕمانەوەگوتی:

- ئەوەچ قسەیەکەی دەیکەی؟ هەرمرۆڤێك دەتوانێ هەمووشتێك لەجووڵەی هەواوە بگرە تا ئەو گۆڕانکایانەی کە لەخۆردا ڕوودەدەن هەموان بزانێ.ئێستا تۆ چۆن دەتوانی بڵێی کە مرۆڤێك لوتی بەجۆرێك بگرێ،لە مەبەستی تێناگەی؟

پاڤێل پترۆڤیچ بە حەپەساوی گوتی:

- چۆن؟ نووکتە دەگێڕیەوە؟!

لەوێ ڕۆیشت.لەگەڵ ئەوەشدا جارجار پاڤێل پترۆڤیچ لەکاتی تاقیکردنەوەکانی بازارۆفدا دەردەکەوت هەتا جارێك کە دەم و چاوی بە سابوونێکی بۆنخۆش شوشتبوو لە میکرۆسکۆبەکە نزیك کەوتەوە تا ببینێ کە ئەوشلە ڕوونە چۆن ڕەنگە سەوزەکە هەڵدەمژێ و نایهێڵێ.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ زیاتر لە براکەی سەری لە بازارۆف دەدا ئەگەر گیروگرفتی کێڵگە نەبوایە خۆی گوتەنی هەموورۆژێ جارێك دەهاتەلای تا شتێك فێرببێ.ئامادەبوونی ئەو هیچ کات

نەدەبووە هۆی نیگەرانی و کات گرتنی.لە گۆشەیەك دادەنیشت و تەماشای دەکرد.زۆر بەکەمی و ئەویش بەپارێزەوە،پرسیاری دەکرد.لەکاتی نانخواردندا هەولێدەدا بابەتی وتوویژ لە چوارچێوەی فیزیاو کیمیاو زەوی ناسیدا بێت چونکە بۆی هەبوو بابەت گەلی دیکەی وەك سیاسەت و کشتوکاڵی کارەکە بگەیەنێتە دڵ یەشان و تووڕەبوون.نیکۆلای پترۆڤیچ دڵنیابوو کە ڕقوکینەی براکەی بەرامبەر بازارۆف کپ نەبووە.ئەگەر وازمان لەو بەڵگەو هۆکارانەش هێنابا بچوکترین پێشهات دەیسەلماند کە ڕاست دەکات.نەخۆشی کۆلێرا لەگوندەکانی دەوروبەری مارینۆ دەرکەوتبوو تەنانەت دووکەسی ئەو گوندەش تووشی ئەو نەخۆشییەببوون.شەوێك پاڤێل پترۆڤیچ تایەکی زۆری هاتێ تا بەیانی ناڵاندی بەڵام حازر نەبوو لەو بارەیەوە زانیاری لە بازارۆف وەربگرێ.دوای دوو ڕۆژان کە بازارۆف بە مەسەلەکەی زانی گلەیی کرد کە بۆچی لەڕوویان نەداوە،پاڤێل پترۆڤیچ بەڕەنگ و ڕووی بزرکاوەوە گوتی:

- تا ئەوجێیەی لەبیرم مابێ گوتبووت کە قەت باوەڕت بەکاری پزیشکی نییە.

بەوشێوەیە ڕۆژان تێدەپەڕین و بازارۆفیش بەجدی خەریکی کارەکەی بوو.ئەوەمان لەبیر نەچێ لە ماڵەکەی نیکۆلای پترۆڤیچ کەسێك هەبوو کە بازارۆف ئەگەرچی دەردە دڵیشی لەگەڵ نەدەکرد بەڵام بەتامەزرۆییەوە لەگەڵی دادەنیشت و دەدوا.ئەوکەسەش کێ بوو فنیچکا.

بەردەوام هەموو بەیانییەکی زوو،بازارۆف،فنیچکای لە ناوباخ یان لە حەوشە دەدیت.هەرگیز نەدەچووە ژوورەکەی.فنیچکاش تەنیا جارێك،ئەویش بۆ ئەوەی لێی بپرسێ منداڵەکەی بشوا یان نا،چووە ژوورەکەی.فنیچکا نەك لە بازارۆف نەدەترسا بەڵکو لەبەرامبەریدا هەستی بەئارامی دەکرد کە ئەو ئارامییەی لەبەرامبەر کەسانیدیکەداو هەتا لەبەرامبەر نیکۆلای پترۆڤیچیشدا هەست پێنەدەکرد.هۆکاری ئەو بابەتە بۆخۆشی بەچاکی نەیدەزانی.ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوە بووبێ کە فنیچکا بێ ئەوەی بۆخۆشی ئاگای لێبێ لەبازارۆفدا ئەوخانەدانییەی کە هەمیشە لێیدەترسا بەدی نەدەکرد.

بەبڕوای ئەو بازارۆف هەم بنیادەمێکی باش و هەم پزیشکێکی دەست ڕەنگین بوو.بێ ئەوەی لەلای بازارۆف بێتاقەت بێ یاری لەگەڵ منداڵەکەی دەکرد.تەنانەت ڕۆژێکیش کە لە ناکاو دووچاری سەرەگێژە هاتبوو کەوچکی دەرمانی بەدەستی بازارۆف خواردبوو.لەبەرچاوی نیکۆلای پترۆڤیچ وەك بێگانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بازارۆف دەکرد.دیارە ئەو کارەشی وەکو مەکروحیلە نەدەکرد،هۆکارەکەی ئەوەبوو کە ئەوجۆرە ڕەفتارانەی بەشتێك لە ئینسانییەت و

ڕێز لەقەڵەم دەدا.لە هەمووکاتێك زیاتر لە پاڤێل پترۆڤیچ دەترسا.لەبەر ئەوەی ماوەیەك بوو شووبراکەی وەکو سێبەر چاودێری دەکرد.بۆ هەرجێگایەك چووبا پاڤێل پترۆڤیچی بەوجلو بەرگە شینە ئینگلیزیە بەدوای خۆیەوە دەبینی.فنیچکا زۆرجاران لەلای دوونیاش دەردەدڵی دەکرد:

- کەلەو حاڵەتانەدا دەیبینم خەریکە دەمەتنۆکە ئاوێك.

بەلاّم دوونیاشا لەوەلاّمدا تەنیا ئاخێکی هەڵدەکێشاو بیری لەو کەسە بێ هەستە دەکردەوە کە لەوماڵەیە.بازارۆف بێ ئەوەی بزانێ ببووە مایەی ئازاری ڕووحی دوونیاشا.بەو ڕادەیەی کە فنیچکا بازارۆفی خۆشدەویست،بازارۆفیش لەدیداری ئەو خۆشحاڵ دەبوو.تەنانەت بازارۆف لەکاتی قسەکردن لەگەڵ فنیچکا ڕووخساری دەگۆڕاو گەش دەهاتە بەرچاو.فنیچکا ڕۆژ بەڕۆژ جوانتردەبوو.لە تەمەنێکدابوو کە ژنان وەکو گوڵی هاوینە لەناکاو دەپشکوون و دەکرێنەوە.کاتێك جلی سپی لەبەر دەکرد هەستیدەکرد سپیترووسووکترە...خۆی لەهەتاو دەپاراست بەلاّم نەیدەتوانی خۆی لەگەرما بپارێزێ.گەرما گۆناکانی سوورهەڵدەگێڕان و سست و خاوبوونەوەیەکی چێژ بەخشی پێدەبەخشی.کاتێکیش ئەوخاوبوونەوەیە چاوە جوانەکانی دادەگرت،ئیدی نەیدەتوانی هیچ بکات،دەستی لەسەر ئەژنۆیان دادەناو بەقورسی دەجولاّو بەناڵەوە گلەیی لەوحاڵەی خۆیدەکرد.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ دەستووری دابوو تا چادرێك بەدەوری مەلەوانگەکەدا بکێشن تا بۆ خۆشتن کەڵکی لێوەربگرن.

- تۆدەبێ زیاترخۆت بشۆی.

- ئای،نیکۆلاّی پترۆڤیچ.بنیادەم تا دەچێتە مەلەوانگەکەو دەگەڕێتەوە لەپەلەپۆ دەکەوێ.تۆزە سێبەرێك لەو باخەیدا پەیدانابێ.

نیکۆلاّی پترۆڤیچیش ناوچەوانی تێکدەناو دەیگوت:

- بەڵێ،سێبەرێك لەو باخەیدا پەیدانابێ.

ڕۆژێك دەورووبەری کاتژمێرحەوت کاتێك بازارۆف لە پیاسەکردن دەگەڕایەوە فنیچکای لە ژێر کەپرەکە بینی.ئەو یاسانەی کە کەپرەکەیان داپۆشیبوو هەرچەندە ماوەیەك بەسەر گوڵ کردنیان تێپەڕیبوو بەلاّم هێشتا هەرگەش و جوان بوون،فنیچکا لەسەر نیوتەختێك دانیشتبوو وەك هەمیشە دەسماڵێکی سپی بەسەر سەری دادابوو.لەپەناشی کۆمایەك گوڵی سپی و سووری لێبوون کە هەندێکیان شەونمیان هەر لەسەربوو.

بازارۆف سلاوی کرد.فنیچکا بەهێمنی گوتی:
- ئای،یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ ئەوە تۆی؟
هەر کەدەستی بۆ دەسماڵەکەی سەری برد تا باشتر بازارۆف ببینێ،دەستی تا ئانیشکی بەڕووتی دەرکەوتن.بازارۆف لەکاتێکدا لەسەر نیوتەختەکەی تەنیشتی دادەنیشت گوتی:
- لێرەخەریکی درووستکردنی چەپکەگوڵانی؟
- بەڵێ،نیکۆلای پترۆڤیچ زۆرحەزی لەچەپکەگوڵە لەسەر مێزی نانخواردنی بەیانی.
- ئێستا زۆرمان ماوە بۆ قاوەڵتی.زۆرت چنیون.
- هەر ئێستا چنیومن دەنا ئەگەر هەواگەرم بێ لەبەر هەتاودا ناتوانم لێیان بکەمەوە.زۆر لەگەرما بێزارم دەترسم لەپەلوپۆم بخا.
- چ قسەیەکە دەیکەی!بالێدانی دەستت بگرم.
بازارۆف دەستی گرت و دوای ئەوەی دەماری لێدانی دڵی دیتەوە بێ ئەوەی بیانژمێرێ گوتی:
- تۆ سەدساڵی دیکەش دەژی.
دەستی بەردا،فنیچکا هاواریکرد:
- خوانەکا!
- بۆ؟چماحەزناکەی سەرد ساڵ بژی؟
- سەدساڵ! نەنکم تەنیا هەشتاوپێنج ساڵ ژیا.پشتی چەمابۆوەو بەردەوام دەکۆکی.تەنانەت بۆخۆشی ببووە مایەی ئازار.ئەو جۆرە ژیانە بەکەڵکی چی دێ؟
- واباشە مرۆڤ هەمیشە بەگەنجی بمێنێتەوە.
- بێگومان.
- سوودی گەنج مانەوەچییە؟ دەکرێ پێم بڵێی؟
- چۆن سوودی چییە؟! بۆنموونەمن ئێستا گەنجم.دەتوانم کاربکەم،بەڕێگادا بڕۆم،شت هەڵبگرم،دانیشم،هەستم و هەموو کارێك بکەم.پێویستیش ناکا داوا لەکەس بکەم کارێکم بۆبکا...سوود لەوەی باشتر؟!
- بەڵام بۆمن فەرق ناکا کەپیربم یان گەنج.
- قسەی سەیرسەیر دەکەی،شتی وانابێ.

- فدۆسیانکلاێۆنا،بۆخۆت داوەربە.ئەو گەنجیە بۆمن چ نرخێکی هەیە؟من کە بەتەنیاو ئاوارەو سەرگەردان....

- ئەوە لەدەست خۆتدایە.

- نا،بەدەست خۆم نییە.لانی کەم دەبێ کەسێك هەبێ دڵی بەحاڵی من بسووتێ.

فنیچکا بەتیلە نیگایەك لەبازارۆفەوە ڕاماو هیچی نەگوت.دوای ماوەیەك باسەکەی گۆڕی و پرسی:

- ئەوکتێبە چییە؟

- ئەوە؟ کتێبێکی زانستی بەگرێوگۆڵە.

- تۆ لەو هەموو وانەخوێندنە ماندوونابێ؟ پێموایە تۆ هەمووشتێك دەزانی.

- پێناچێ وابێ.ئەو کتێبەی بگرەو بیخوێنەوە.

- من هیچ لێی تێناگەم.

کتێبەکەی بە هەردووك دەستان گرت.

- چەندەقورسە! ئەوکتێبە ڕووسیە؟

- بەڵێ.

- جیاوازی نییە.چونکەمن هیچی لێ نازانم.

- منیش نامەوێ تێیبگەی.تەنیا دەمەوێ سەیری کتێب خوێندنەوەت بکەم.چونکە کاتێك شتێك دەخوێنییەوە لوتەناسکەکەت بەشێوەیەکی جوان دەجوڵێ.

فنیچکا کەخەریکبوو بەحنجە وشەکانی دەخوێندەوە کتێبەکەی وەلانا...کتێبەکە لەسەر نیوتەختەکە خزی و کەوتەخوارێ.

بازارۆف گوتی:

- هەتا چێژ لە پێکەنینەکەشت وەردەگرم.

- ئای تکات لێدەکەم وازبێنە.

- لە بیستنی قسەکانیشت چێژ وەردەگرم.کاتێك قسە دەکەی دەڵێی کانیاوێك هەڵدەقوڵێ.

فنیچکا ڕووی وەرگێڕا.دەستی بەسەر گوڵەکاندا هێناو گوتی:

- چ قسەیەکە دەیکەی؟ تۆ لەگەڵ زۆرخاتوونی خوێندەوار دانیشتووی...گوێکرتن لە قسەکانی من چ سوودێکی هەیە بۆتۆ.

- ئاخ،فدۆسیا نیکلاێۆنا! تاڵە موویەکی تۆ هەمووخاتوونە خوێندەوارەکان دێنێ.
فنیچکا دەستەکانی گوشین و گوتی:
- چ درۆیەکی سەیروسەمەرە دەکەی.
بازارۆف کتێبەکەی هەڵگرتەوەو گوتی:
- ئەوە کتێبێکی پزیشکییە بۆوەلای دەنێی؟
فنیچکا دووبارەی کردەوە:
- پزیشکی!
پاشان گەڕایەوەلای بازارۆف و گوتی:
- بەڕاستی لەو ڕۆژەی ئەو دەرمانەی داوتە میتیا زۆر ئاسوودە دەنوێ.نازانم چۆن سوپاست بکەم.زۆرباش و میهرەبانی.
بازارۆف بزەیەکی هاتێ و گوتی:
- بێگومان دەبێ پاداشتی پزیشکان بدرێتەوە.بۆ خۆشت دەزانی خواستی پزیشکان زۆرە.
فنیچکا چاوەکانی کە ئێستا ڕەشتر دەردەکەوتن لە بازارۆفەوە بڕین.نەیدەتوانی تێبگا گاڵتەی لەگەڵ دەکا یان بە ڕاستییەتی.
- ئەگەر پێت باشە،بەوپەڕی تواناوە...دەبێ لە نیکۆلاێ پترۆڤیچ بپرسم...
- مەبەستی من پارەنییە.داوای پارەت لێناکەم.
- ئەدی چتدەوێ؟
- بۆخۆت لێکی بدەوە.
- من و لێکدانەوە!
- زۆرباشە،بۆخۆم دەیڵێم...من یەکێك لەو گوڵانەم دەوێ.
فنیچکا دووبارە پێکەنی.ئەو داوایەی بازارۆفی هێندەپێ منداڵانەبوو کە پێدەکەنی و دەستی لێکدەدان.بازارۆف لێی ڕامابوو.سەرەنجام فنیچکا گوتی:
- چ ڕەنگێکت پێ جوانە،سپی یان سوور؟
- سوور،بەڵام بازۆر گەورە نەبێ.
فنیچکا هەستاو گوتی:
- فەرموو،بیگرە.

بەلاّم دەستبەجێ دەستی کێشایەوەو لێـوی خـوارەوەی بـەددان کەست.چـاوی لـە دەرگـای کەپرەکە بڕیبوو.بازارۆف پرسی:

- چی بووە؟نیکۆلاّی پترۆڤیچ بوو؟

- نا...ئەوچـــۆتەدەرێ...جگە لـــەوەش مـــن لـــەوی ناترســـم.تەنیا لـــە پاڤێـــلّ پترۆڤیچ...پێموابووکە...

- کەچی؟

- پێموابوو ئەو بێرەدا دەڕوا...نا کەس نەبوو...فەرموو.

فنیچکا گوڵەکانی دایە بازارۆف.

- بۆلە پاڤێلّ پترۆڤیچ دەترسی؟

- ئەو هەمیشە دەبێتە مایەی ترس بۆمن.هیچ قسەناکا بـەلاّم زۆر سـەیر دەڕوانێ.تـۆش ئەوت خۆش ناوێ.پێشتر هەمیشە تێکدەگیران.من هیچ لە قسەکانی تۆو ئەو نەدەگەیشتم.بەلاّم هەر تۆ ئەوت ڕێکدەگوشی و...

فنیچکا بە دەستەکانی نیشانیدا کە بازارۆف چۆن پاڤێلّ پترۆڤیچـی ڕێکدەگوشـی.بازارۆف بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- ئەگەر ئەو سەرکەوتبا چی؟تۆ پشتیوانیت لەمن دەکرد؟

- من لەکوێ،تۆ لەکوێ؟ چۆن دەمتوانی پشتیوانیت لێبکەم؟پێموایـە کـەس نـاتوانێ تـۆ ببەزێنێ.

- بەلاّم دەستێك دەناسم ئەگەرحەزی لێبێ دەتوانێ وردووخاشم بکا.

- چ دەستێك؟

- تۆنازانی؟ ئەو گوڵەی بگرەو بۆنی بکە.بزانەبۆنی چەندە خۆشە.

فنیچکا گەردنی درێژکرد تـا بـۆن بەگوڵەکەوەبکا.دەسماڵەکـەی لـە سـەر سـەری خـزی و پرچەنەرم و ڕەشەکەی کە کەمێك ئاڵۆزببوو وەدەرکەوتن.بازارۆف گوتی:

- ڕاوەستە با بەیەکەوە بۆن بەو گوڵەوە بکەین.

داهاتەوەو ماچێکی گەرمی لە لێوەکانی کرد.فنیچکا تێکڕابوو پاڵێکی پێوەناو لـە خـۆی دوورخستەوە بەلاّم ئەوپاڵە هێندە هێواشبوو کە بازارۆف توانی ماچەکەی درێژتربکاتەوە.

دەنگی کۆکەیەکی نزم بیسترا.فنیچکا دەستبەجێ خۆی بەلای نیوتەختەکەوەدا.پاڤێل پترۆڤیچ دەرکەوت و دوای ئیکلام کێشانێکی کورت بەڕاوێژێکی ڕق ئەستوورانەوە گوتی:

- ئێوەلێرەن؟

لەوێ دوور کەوتەوە.فنیچکا دەستبەجێ گوڵەکانی کۆکردنەوەو لە کەپرەکە چۆدەرەوە.کاتی ڕۆیشتنی بەئارامی و ڕاوێژێکی سەرکۆنانەوە گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ،تاوان لەتۆبوو.

بازارۆف دیمەنێکی دیکەی هێنایەوە بەرچاوی خۆی و شەرمەزاربوو.بەڵام دەستبەجێ سەری ڕاوەشاندو لەوەی کە وەك هەرزەکارێك دەرکەوتووە پیرۆزبایی لەخۆی کردو چووە ژوورەکەی.

پاڤێل پترۆڤیچ لە باخەکەوەچووە دارستان و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە.کاتێك بۆ نانخواردنی بەیانی گەڕایەوە زۆر تێکچووبوو کە نیکۆلای پترۆڤیچ لێی ترساو پرسی:

- حاڵت باشنییە؟

-دەزانی هەندێجار زەرداوی منیش تێکدەچێ.

**(٢٤)**

دووکاتژمێر دواتر پاڤێڵ پترۆڤیچ له دەرگای ژووری بازارۆفیداو گوتی:

- لەوەی کە کاتی خوێندنەوەی زانستی جەنابت دەگرم داوای لێبووردن دەکەم.

لە کاتێکدا خۆی بەگۆچانەکەیەوە گرتبوو لەسەر کورسییەکە دانیشت.( زۆر بەدەگمەن بۆ ڕۆیشتن گۆچانی هەڵدەگرت.)

- بە ناچاری داوا لە بەڕێزتدەکەم پێنج دەقیقە کاتم بدەنێ.پێنج دەقیقە.

بازارۆف کە لەهاتنی نیگەران ببوو گوتی:

- تەواوی کاتم لەخزمەت جەنابتدایە.

- نا،پێنج دەقیقەبەسە.دەمویست پرسیارێکت لێبکەم.

- چ پرسیارێك؟

- تکایە گوێبگرە.هەر لەیەکەم ڕۆژی هاتنت شانازی ئەوەم پێبڕا دەربارەی زۆربابەت پێکەوە گفتوگۆ بەکەین،بەڵام نایەتەوەبیرم کە دەربارەی ( دوئێل)[1] پێکەوە شتێکمان گوتبێ.دەمەوێ ڕای ئێوە لەو بارەیەوە بزانم.

بازارۆف کە لەشوێنی خۆی هەستابوو بەپێشوازی پاڤێل پترۆڤیچەوەچوو دەستی لێك گرێدان و لە گۆشەیەك دانیشت و وەڵامی دایەوە:

- پێموایە لەڕوانگەی زانستییەوە،دووئێل کارێکی قێزەونایە بەڵام لەڕوانگەی پراکتیکییەوە ئەگەرسەیری بکەین...ئەوەقسەیەکی ترە.

- ئەگەر بەهەڵە نەچووبم مەبەستی تۆ ئەوەیە کە هەرچی زانست بیەوێ دەربارەی دووئێل بیڵێی لەحاڵی حازردا گرنگ ترینیانە بەڵام لەڕوانگەی پراکتیکی یەوە ئەگەر کەسێك بیەوێ سووکایەتیت پێ بکا ئامادەنی بەکردەوە وەڵامی بدەیەوە.

- تۆ زۆرباش مەبەستی منت وەڵام دایەوە.

---

١- دوئێل: شەڕی گێڕانەوەی ئابڕوو، کە لە ئەورووپای کۆندا زۆر باو بوو.

- زۆرباشە،لەوەی کەچ جۆرە ڕایەکت هەیە زۆرخۆشحالم.قسەکانت منی لە دوودلی و گومان نەجاتدا.

- مەبەستت لە بڕیارنەدانە؟

- چ جیاوازیەکی هەیە قوربان.مەبەستی من لە گفتوگۆکردن ئەوەیە کە مەبەستی خۆم دەربېڕم دەنا هێندە شێرو ڕێویان ناهێنمەوە.قسەکانی تۆ منیان لە گومان و دوودلێەکی گەورە نەجاتدا.من دەمەوێ لەگەڵ تۆدا دووئێل بکەم.

بازارۆف چاوی پێ دەپەڕین:

- لەگەڵ من؟

- بەڵێ،لەگەڵ تۆ.

- بەخودا سوێندت دەدەم،بۆ دەتەوێ ئەو کارەبکەی؟

- دەتوانم هۆکارەکەت پێبڵێم بەلاّم پێم باشترەلێی گەڕێم.پێموایە بوونی تۆ لێرە زیادەیە.بوونی تۆم پێ تەحەموول ناکرێ.نەفرەت لەتۆ.ئایا ئەوەندە بەس نییە.

پاڤێل پترۆڤیچ چاوەکانی بریسکەیاندا.لە چاوەکانی بازارۆفیشدا تیشکێك دەرکەوت.سەرەنجام بازارۆف بە هێمنی گوتی:

- زۆرباشە،تۆ بڕیارتداوە پیاوەتی و گەورەیت بەسەرمندا تاقی بکەیتەوە.هەرچەندە دەتوانم دژی ئەو داوایەی تۆبم،بەلاّم ئەوەی دەبێ بلاّببێ.

- سوپاسی لوتفی بەڕێزتان دەکەم کە داواکەی منت بۆ دووئێل قبوولّ کرد بێ ئەوەی ناچارت بکەم.

بازارۆف لەسەرخۆ گوتی:

- مەبەستت ئەوەیە کە تۆ بەگۆچان ناچارت نەکردووم؟ نا پێوست بە کەڵك وەرگرتن لەو لەتکە دارەناکا...بەهەرحاڵ جەنابت دەتوانی بەهەمان حاڵەتی جوامێریتەوە داوەتەکەت پێشنیاربکەی و منیش بەهەمان حاڵەتەوە داوەتەکەت قبولّ دەکەم.

پاڤێل پترۆڤیچ لە شوێنی خۆی هەستاو گۆچانەکەی لەگۆشەیەك داناو گوتی:

- ئێستا دەبێ دەربارەی شەرتی دووئێل چەندقسەیەك بکەین...لەبیرم چوو لێت بپرسم پێتخۆشە بەر لە دووئێل دم بەدمەیەکی کورت بکەین تا پێشینەی دووئێل بڕەخسێنین یان نا؟

- نا، پێویست بەو پێشینەیە ناکا.

- منیش لەگەڵ تۆ هاوڕام.ئێمە لەیەکتر بێزارین و ئەوەندەش بۆ دووئێل بەسە.

بازارۆف بەتوانجەوە گوتی:

- بەڵێ، ئەوەندە بەسە.

- ئەدی دەربارەی شەرتی دووئێل.ئێمە پێویستمان بە شـایەدێك نابێ.چـونکە پەیـداکردنی شایەد کارێکی ئەستەمە.

- بەڵێ،هیچ پێویستمان بەشایەد نییە.

- کەوایە شانازیە بۆمن کە پێشنیار بە جەنابتان بکەم بەیانی زوو، بۆنموونە کاتژمێر شەش لە پشت باخچە،بە دەمانچەوە،بە ئەندازەی دەپێ...

- بۆدەپێ؟ چما ئێمە بەڕادەی دەپێ یەکدی دەبووغزێنین؟

- ڕەنگە هەشت پێ باشتربێ؟

- ڕەنگە.

- هەریەکەو دووگوللان داوێین و واباشە بۆ ئایندە هەر یەکەو کاغەزێك لە گیرفانمانـدابێ و مەرگی خۆمان لە ئەستۆی خۆمان بگرین.

- نا، دژی ئەوەیانم.چونکە وەك چیرۆکە ڕۆمانسییە فەرەنسییەکان دەچێ کە لە ڕاستییەوە دوورە.

- لەوانەیە هەقی تۆبێ.بەڵام ئەوەش بزانە کە هەرکەسێك خـەتای مـەرگی خـۆی باوێتـە ئەستۆی خۆی،کارێکی ڕاست نییە.

- قبوڵمە...بەڵام ڕێگا چارەیەکی دیکەم بەخەیاڵ دادێ کـە کارەکـە بەشـێوەیەکی باشـتر بەڕێوەبچێ...بۆنموونە دەتوانین شایەدێك مان هەبێ.

- دەتوانم بپرسم بۆ شاهید چ کەسێکت پێ باشە؟

- بۆنموونە پیووتەر.

- کام پیووتەر؟

- خزمەتکارە تایبەتەکەی براکەت.کە سێکی داب و دەستوورناسەو دەتوانێ ڕۆڵـی خـۆی بەباشی ببینێ.

- گاڵتەدەکەی!

- هەرگیز ئەگەر کەمێك لە پێشنیارەکەم وردبیتەوە بەشتێکی باشـی دەزانی.دیـزە بـەدەر خۆنەکردنی ئەوکارە شتێکی مەحاڵە بەڵام من پیووتەر بۆ ئەوکارە ئامادەدەکەم.

پاڤێڵ پترۆڤیچ لەشوێنی خۆی هەستاو گوتی:

- ئێستاش دڵنیام گاڵتەدەکـەی.دووبارە بـەهۆی ئـەوەی داوەتەکـەی منـت قبـوڵ کـردوە سوپاست دەکەم و هیچی دیکەم نییە...ئەرێ دەمانچەت هەیە؟

- پاڤێڵ پترۆڤیچ بۆ دەبێ دەمانچەم هەبێ؟ بۆچما من کەسێکی سوپاییم؟

- کەوایە من دەمانچەکەی خۆمت دەدەمێ،دڵنیابە پێنج ساڵە بەکارم نەهێناوە.

- هەواڵێکی زۆرخۆشە.

پاڤێڵ پترۆڤیچ خۆی بەسەرگۆچانەکەیدا شۆڕکردەوەو ویستی بڕوات.

- ئێستا من هیچ کارێکم لێرەنەماوە دووبارە سوپاست دەکەم و بوومەهۆی ئەوەی لەکاتی خوێندنەوەت بگرم.ئێستا بەیارمەتی جەنابتان من دەڕۆم.

بازارۆف پاڤێڵ پترۆڤیچ بەڕێکردو گوتی:

- خودائاگادارت بێ، ئاغای بەڕێز.

دوای ڕۆیشتنی پاڤێڵ پترۆڤیچ،بازارۆف لەبەر دەرگا ڕاوەستاو گوتی:

- شەیتان بەلەعنەت بێ...چەندە جوان و گێلانەبوو! چ گاڵتەجاڕیـەکی بێوێنەیـە! سـەگە ڕاهێنراوەکانیش ئاوا لەسەر چنگان ڕادەوەستن و کلکەسووتەی دەکەن...بـەڵام نەشـدەکرا خـۆ لەوپێشنیارەی وەدزی.ئەگەر وام کردبـا حەتمـەن بـەو گۆچـانەی دام دەگژایـە...(بازارۆف بـە هێنانەبەرچاوی ئەو دیمەنە تێکچوو) ئەوکات ناچاردەبووم وەکو بێچوەپشیلەیەك بیخنکێنم.

پاشان گەڕایەوە ژوورەکەی و چووەلای میکرۆسـکۆبەکەی بـەڵام پەرێشـان بوو.لەگـژفکران ڕاچوو:

- ئەورۆ دیتمی...بەڵام ئایا بەڕاستی نیازی وی پارێزگاری لە ئـابڕووی براکەیـەتی؟ باشـە ماچێك چ گرنگیەکی هەیە؟ حەتمەن هۆکارەکەی شتێکی دیکەیە.ڕەنگە ئـەویش عاشـق بـێ؟ بێگومان عاشقە.ئەو مەسەلەیە وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە...دۆخێکی زۆر نالەبارە. هەرچۆنێکی لێکی بدەیەوە نالەبارە.سەرەتا دەبێ ناوچەوانت بەگوللەوە بنێی و ئەگەر تەمەنیش بـاقی بـوو دەبێ ئێرەجێبێڵی.ئەدی ئارکادی و ئەو کەسەبێ خەتایە،نیکۆلای پترۆڤیچیش لەوێ...دۆخێکی زۆردژوارە.

باقی ڕۆژەکە بەوپەڕی ئـارامی تێپـەڕی.دەتگوت هـیچ فنیچـکایەك لەگۆڕێـدا نییە.ئـەو لەژوورەکەی خۆی دانیشتبوو دەرگای لەسەرخۆی پێوەدابوو.نیکـۆلای پترۆڤـیچ گێرەوکێشـەی زۆربوون.وابلاۆببۆوە کە ئەوگەمانەی ئەو زۆری پیێ باشبوون کرم لیێداوە.

پاڤێل پترۆڤیچ تەواوی دانیشتوانی ماڵیێ تەنانـەت پراکفیۆڤیچـیش کـەپیاوێکی سـاردوو بێدەنگ بوو وەزاڵەهێنابوو.

بازارۆف دەستیکرد بەنووسینی نامەیەك بۆ باوکی بەلاّم بە نیوەچڵی وازی لیێهێناو دڕانـدی و لەبەرخۆیەوە گوتی:

- دوای مردنم هەمووشتێك دەزانیێ...بەلاّم من نامرم و دووبارە ئازاری زۆر دەکێشم.

پاشان بە پیووتەری گوت سبەی بەیانی زووبێتە ژوورەکەی.پیوتەر پیێیوابـوو لەگـەڵ خـۆی دەیباتـە پـترۆس بۆرگ.بـازارۆف زۆر درەنـگ چووەسـەرجێگا تـەواوی ئـەو شـەوە خـەونی سەیرسەیری دەدیت.ئادینسۆڤا لەبەرچاوی قوتدەبۆوە.دەتگوت ئەویش ڕۆڵـی دایکـی بـازارۆف دەگێڕیێ.دوای ئەویش بێچوەپشـیلەیەکی سمێـڵ ڕەش دەرکـەوت ئەوپشـیلەش کەسـێك نـەبوو جگەلە فنیچکا...لەبەرچاوی پاڤێل پترۆڤـیچ بـە دارسـتانێك دەچـوو واش ناچـاربوو لەگـەڵی بەشەڕبیێ.

کاتژمێر چوار پیوتەر وەخەبەری هێنا.دەستبەجیێ خـۆی گـۆڕی و لەگـەڵ خزمەتکارەکـەی نیکۆلای پترۆڤیچ وەدەرکەوت.

* * *

بەیانییـەکی دڵگیربوو.هـەورە بچـوکەکان بـە کۆمەڵەمـەڕێك دەچـوون کـە بەئاسمانـەوە لکابن.گوڵەکان شەونمیان لەسەرکەوتبوو بەسەر تەونی جاڵجاڵۆکە کانەوە دەتگوت دەنکـەزێون کـەوتوون.زەوی ڕەش و تـەڕوبوو دەتگـوت هێشـتا سـوورایی خۆرنشـینی بەسـەرەوە ماوە.لەهەرلایەك چـریکەی مـەلان دەهات.بـازارۆف کاتێـك گەیشـتە بیشـەلانەکەو لەسـەر مووردەدارێـك دانیشـت، دەپیووتـەری گەیانـد کـە بۆچـی بـۆ ئێـرەی هێنـاوەو چ کـارێکی پیێیە.خزمەتکاری تەربیەت دراو خەریکبوو لەترسان زراوی بچیێ.بەلاّم بازارۆف دڵنیای کـردەوە کە ئەو هیچ ناکات تەنیا ڕادەوەستیێ و تەماشا دەکاو هیچ پەیوەندی بەو ڕووداوانەوە نییە کـە ڕوودەدەن لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی ورەی وەبەرنیێ گوتی:

- بزانەچ ئەرکێکی گەورەیان پیێ سپاردووی.

پیووتـەر دەسـتەکانی ڕێکگوشـین.پاڵی وەدار سـپیدارێکداو لـە زەویەکـەوە ڕامـا.ڕەنگی بەڕوانەوە نەمابوو.جادەی مارینۆ بەپەنا بێشەکەدا تێدەپەڕی.هێشتا شوێنەواری تایەیـەك یـان پێی بنیادەمێك بەسەرجادەکەوە دیارنەبوو.بازارۆف لەخۆڕا چاوی لەجادەکـەوە بڕیبوو.پنچـکە گیایەکی هەڵپساندو بەددانی گرتی و لەبەرخۆیەوە گوتی:

- چ گەمژەییەکە!

شنەی بەیانی چەندجارێك تەزووی بەلەشدا هێنا، پیووتەر بە ئەفسووسەوە لێی ڕاما بـەلاَم لەبەرامبەردا بزەیەکی وەرگرتەوە.بازارۆف هەرگیز نەدەترسا.دەنگی نـاڵی ئەسـپێك لـەجادەوە بیسترا.ڕەعیەتێك لەپشت درەختێکەوە دەرکەوت کە دووئەسپی وەپێش خۆی دابوو.هەوسـاری ئەسپەکان لێك گرێدرابوون.کابرای دێهاتی کاتێك بـە پـێش بازارۆفـدا تێدەپـەڕی بـەجۆرێکی سەیرتەماشای کردو کلاَوەکەی هەڵنەگرت.پیووتەر ئەوەی بە بەدبەختی لەقەڵەمـداو نیگـەران بوو.پیووتەر لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:

- ئەو ڕەعیەتەش بەیانی زوو لەخەو هەستاوە.ئەو دەچـێ کارێـك ڕاپـەڕێنێ لـە کاتێکـدا ئێمەش...

پیووتەر لەسەرخۆ گوتی:

- واخەریکە دێت.

بازارۆف سەری هەڵێناو پاڤێڵ پترۆڤیچی دیت.هاو تاکەی لەکاتێکدا چـاکەتێکی دامـەیی تەنك و شەرواڵێکی سپی لەبـەردابوو بەپەلـە دەهات.سـندۆقەیەکی لـەبن هـەنگڵ نـابوو کـە پارچەماهوتێکی سەوزی تێوەپێچابوو.پاڤێڵ پترۆڤیچ سەرەتا بۆ بازارۆف و دواتر بۆ پیووتەر کە ئێستا پلەی شاهیدێکی فەرمی وەرگرتبوو ئیکلامێکی کێشاو گوتی:

- دەڵێی چاوەڕوانم بوون.هیوادارم بمبوورن...نەمدەویست خزمەتکارەکە هەستێنم.

بازارۆف گوتی:

- گرنگ نییە، ئێمەش ئێستا گەیشتووین.

پاڤێڵ پترۆڤیچ سەیرێکی دەوروو بەری کردو گوتی:

- زۆرباشـە، کەسـێك لـەو دەوروبەرانـە نییـە تـا نارەحـەتمان بکـات...دەتوانین دەسـت پێبکەین؟

- بەڵێ.

- پێموایە پێویست ناکا هیچی دیکەبڵێین؟

- نا پێویست ناکا.

پاڤێلێ پترۆڤیچ دەمانچەکانی لە سندۆقەکە دەرهێنان و گوتی:

- بۆخۆت فیشەك لە چەکەکە باویٚ؟

- نەخێر، جەنابت ئەو ئەزیەتە بکێشە.من مەودایەکە دەپێوم.

بازارۆف دواتر بەگاڵتە پێکردنەوە درێژەیدایە:

- هەنگاوەکانی من درێژترن.یەك دوو سیٚ...

پیووتەر کە لەترسان دەلەرزی بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ تۆ چ دەکەی بیکە، من دەکشێمەوە.

- چوار...پێنج...بەڵیٚ کاکە، تۆ بکشێوە.خۆت لەپشت دارێکدا حەشاردەو تەنانەت ئەگەر حەزت لێبوو گوێیە کانیشت بئاخنە.بەلاٚم چاوت لەقوچ مەنیٚ و ئەگەر یەکێك کەوت یارمەتی بدە.شەش...حەوت...هەشت...

بازارۆف ڕاوەستاو بە پاڤێلێ پترۆڤیچی گوت:

- بەسە یان دووهەنگاوی دیکەش زیادکەم؟

پاڤێلێ پترۆڤیچ کە گوللەی دووەمی لە دەمانچەکە داویشت گوتی:

- بۆخۆت چۆنت پێباشە باوابیٚ.

- کەوایە دووهەنگاوی دیکەش زیاد دەکەم.

بازارۆف بەنووکی پێی نیشانەیەکی کێشاو گوتی:

- ئەوەش سەری خەت...بەڕاستی ئێمەدەبیٚ چەند هەنگاوێك لێك دووربین؟ ئەوە بابەتێکی زۆرگرنگە.دوێنیٚ لەو بارەیەوە قسەمان نەکرد.

پاڤێلێ پترۆڤیچ دەمانچەکانی بەرەولای بازارۆف ڕاداشت و گوتی:

- پێموایە دەهەنگاو.تکایە هەرکامێکت دەویٚ هەڵیبگرە.

- یەکێکیان کەم کەوە...بەلاٚم پاڤێلێ پترۆڤیچ قبوڵت بیٚ کە کارێکی گەمژانە ئەنجام دەدەین...لانیکەم سەیرێکی ڕووخساری شاهیدەکەمان بکە.

- تۆ هەمیشە گاڵتە کردنت پێخۆشە...ڕەنگە کارەکەمان بەڕاستی خەندە ئامێزو گەمژاەبیٚ بەلاٚم ئەوەش بزانە کە من بەجدی نیازی دوئێلم هەیە لەگەڵ تۆدا.

- بەڵێ گومانی تێدانییە کە ئێمە قەستی کوشتنی یەکدیمان هەیە بەڵام بۆچی ئەو کارە بەخۆشی و شادی ئەنجام نەدەین.

پاڤێڵ پترۆڤیچ ئەو قسانەی بەزمانی فەرەنسی گوتن و بازارۆفیش وەڵامەکەی بەزمانی لاتینی دایەوە.

- تۆ بەزمانی فەرەنسی قسەدەکەی و منیش بەلاتینی وەڵامت دەدەمەوە.

پاڤێڵ پترۆڤیچ لەکاتێکدا بەرەولای شوێنی وەستانی خۆی دەڕۆیشت گوتی:

- من بەجدی لەگەڵت بەشەڕدێم.

بازارۆفیش دەهەنگاوی ژماردو ڕاوەستا.پاڤێڵ پترۆڤیچ پرسی:

- ئامادەی؟

- زۆرباش.

- کەوایە دەتوانین لێك نزیك ببینەوە.

بازارۆف بە هێواشی هەنگاوی هەڵێناو هاتەپێش.پاڤێڵ پترۆڤیچیش لە کاتێکدا دەستی چەپی لەگیرفانی نابوو دەمانچەکەی هەڵکێشاو هاتەپێش..بازارۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:

- ئەو لوتی منی کردۆتەئامانج.سەیرکە چ سەرنجێکی بۆ نیشانە گرتن گرتووە.سەیروگاڵتە جارییە...منیش سێرە لە بەندی کاتژمێرە گیرفانییەکەی دەگرم.

شتێك بەویزەویز بە بنگوێی بازارۆفدا تێپەڕی و پاشان دەنگی گوللەیەك هات.بازارۆف بیریکردەوە:

- گوێم لە دەنگی گوللەبوو، بەڵام بەخێر گوزەرا.

پاشان هەنگاوێکی هەڵێناو تەقاندی.پاڤێڵ پترۆڤیچ بە دەستی ڕانی گرت.خەتێکی باریکی خوێن شەرواڵەکەی سوورکرد.بازارۆف چووەلای و گوتی:

- تۆ برینداربووی؟

پاڤێڵ پترۆڤیچ گوتی:

- برینەکەم هیچ نییە.ئێمە قەراربوو دووگوللان باوێین.

بازارۆف گوتی:

- نا، تا ئێرەبەسە.ئەوەی دی دەمێنێتەوە بۆ دوایی.

داهاتەوەو پاڤێلێ پترۆڤیچی ڕەنگ پەڕیوی لە باوەشگرت و گوتی:

- لەوە بەدوا من دکتۆرم نەك جەنگاوەر.دەبێ برینەکەت سارێژبکەم.پیووتەر لەکوێ خۆت شاردۆتەوە؟

پاڤێلێ پترۆڤیچ بە هێمنی گوتی:

- هیچ نییە...پێویستم بەیارمەتی دانی تۆنییە...دەبێ...باقی دووئێلەکە...

ویستی دەستێك بە سمێڵەکانیدا بێنێ بەلاّم دەستی سست بوو و کەوت.پاڤێلێ پترۆڤیچ بێهۆش بوو.

بازارۆف دەسماڵەکەی دەرهێناو خوێنی دەورووبەری برینەکەی پاككردەوەو کەوتە چارەسەرکردن و لەبن لێوانەوە گوتی:

- برینەکە سەخت نییە.ئێسقانی نەگرتووە، تەنیا دەمارێکی برینداربووە.برینەکە هێندەسەخت نییە.دوای دوو سێ ڕۆژان دەتوانێ هەستێتە سەرپێ...بەلاّم لەهۆش چوونی...ئامان لەدەست ئەو کەسە تووڕەو تۆسنە.پێستێکی زۆرناسکی هەیە.

بازارۆف لە دواوەڕا گوێی لەدەنگی پیووتەر بوو:

- کوژراوە؟

بازارۆف ڕووی وەرگێڕاو گوتی:

- بڕۆ کەمێك ئاوبێنە.ئەو زۆر لە من و لەتۆ زیاتر دەژی.

بەلاّم دەتگوت پیووتەر گوێی لەدەنگی ئەونەبووە لە جێی خۆی نەدەبزووت.پاڤێلێ پترۆڤیچ بە ئارامی چاوی هەڵێنان.پیووتەر خاچێکی کێشاو لەبن لێوانەوە گوتی:

- خەریکە دەمری؟

جەنگاوەری بریندار بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- قسەی تۆیە.چ قەدوقیافەیەکی گەمژانەیە!

بازارۆف هاواریکرد:

- بڕۆ ئاوبێنە.

- پێویست ناکا...سەرگێژەیەکی لە ناکاوبوو.یارمەتیم بدەن با دانیشم...دەکرێ ئەوبرینە سەرچیخەی ببەستی...بۆخۆم دەتوانم بچمەوە ماڵێ...ڕەنگە باشتربێ گالیسکەیەکم بۆ

بنێرن...ئەگەر پێت باش بێ دووئێلەکەمان دووبارە ناکەینەوە...ئەمڕۆ ڕەفتارەکەت زۆر پیاونەبوو...

- بیر لە ڕابردووکردنەوە سوودی نییە.ئایندەش ئەو بەهایەی نییە کەلە پێناویدا خۆمان نیگەران بکەین.لەبەر ئەوەی بە زوویی لێرە دەڕۆم.ئێستاش ڕێگابدە برینی لاقت ببەستم.برینەکەت خەتەر نییە بەڵام دەبێ خوێنەکەی ببەسترێ.بەڵام پێش هەمووشتێك ئەوەی وەهۆش بێنینەوە.

بازارۆف یەخەی پیووتەری ڕاوەشاند تا وەهۆش هاتەوەو بەدوای گالیسکەیدا نارد.پاڤێلّ پترۆڤیچ پێیگوت:

- وریابە براکەم نەترسێنی.نەکا قسەیەکی پێبلّێی.

پیووتەر بە پڕتاو بەرەو ڕووبارەکە ڕۆیشت.دوو دوژمن بە تەنیشت یەکەوەو بەبێ دەنگی دانیشتن.پاڤێلّ پترۆڤیچ هەولّیدەدا بازارۆف نەبینێ.قەتیش حەزی نەدەکرد لەگەلّی ئاشت بێتەوە.لەلایەك لەو هەرایەی نابوویەوە شەرمی دەکرد هەرچەندە پێشی وابوو کە ئەو بەزمە بەسەلامەت تێپەڕی.لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:

- لانیکەم لەمەودوا نا بینە ملّۆزمی یەکدی و ئەوەش لە هەمووشتێك باشترە.

بێدەنگییەکی ناخۆش کە هەردووکیانی ئازاردەدا هەروا درێژەی هەبوو.هەردووك لەوەنیگەران بوون کە یەکدیان زۆرباش دەناسی.ئەو دۆخە لەنێوان دووهاوڕێدا دەکرێ پەسەند بێ بەلاّم لەنێوان دوو دوژمندا پەسەندنییە.بەتایبەت ئەگەر ڕێگایەك بۆ چارەسەری گرفتەکان یان لێك جیابوونەوە لەگۆڕێدا نەبێ.سەرەنجام بازارۆف گوتی:

- خۆ برینەکەم  توووند نەبەستووە؟

پاڤێلّ پترۆڤیچ گوتی:

- نا. توووندنییە.

دوای کەمێك گوتی:

- ناتوانم براکەم فریوبدەم.پێیدەلّێم کێشەمان لەسەر بابەتی سیاسی بووە.

زۆرباشە.دەتوانی پێیبلّێی من سووکایەتیم بە عاشقانی شێوازی ژیانی ئینگلیزەکان کردوە.

- هەروای پێدەلّێم.

دوای ئەوە پاڤێڵ پترۆڤیچ هەمان کابرای دێهاتی نیشاندا کە بەرلە دووئێلەکە بەلای بازارۆفدا تێپەڕیبوو.کابرای ڕەعیەت کە ئاغای دیت کلاوەکەی لەسەر هەڵگرت.پاڤێڵ پترۆڤیچ پرسی:

- پێتوایە ئەو کابرایە چۆن بیر لە ئێمە دەکاتەوە؟

- خواباشتر دەزانێ...ڕەنگە هەربیریش نەکاتەوە.جوتیاری ڕووسی کەسێکە کە هیچ کەس شتێکی ئەوتۆی دەربارە نازانێ.ئەو بوونەوەرێکی پڕلەنهێنی و نەناسراوە،کێ دەتوانێ بڵێ جوتیاری ڕووسی بە تەواوی ناسیوە؟ تەنانەت خۆشیان خۆیان ناناسن.

- ئاوا.بیروڕای تۆ دەربارەی دێهاتییەکان ئاوایە...

پاڤێڵ پترۆڤیچ لەناکاو هاواریکرد:

- تەماشاکە ئەو پیووتەرە شێتەی تۆ چی کردووە.براکەمی هێناوە.

بازارۆف وەرسووڕاو ڕووخساری هەڵبزڕکاوی نیکۆلای پترۆڤیچی بینی،کە لە گالیسکە دانیشت بوو.هەرکە گالیسکەکە وەستا.نیکۆلای پترۆڤیچ بازیداو بەرەولای براکەی ڕۆیشت و بە نیگەرانیەوە پرسی:

- چی بووە؟ یۆکینی ڤاسیلیۆڤیچ توخوا ئەوەچ کارێکە؟

پاڤێڵ پترۆڤیچ وەلامی دایەوە:

- شتێکی وانییە.لەخۆڕا تۆیان نیگەران کردووە.من و جەنابی بازارۆف کەمێك شەڕمان بوو.خەتاباری سەرەکیش من بووم.

- بەلام بۆ ئەوە ڕوویدا؟

- زۆر بە باشی نازانم...جەنابی بازارۆف سووکایەتی بە کەسایەتییەکی ناوداری ئینگلیزی کردو منیش نیگەران بووم.پێمگوتی کە خەتاباری سەرەکی منم و بازارۆف خەتای نییە...ئەوە من بووم کە ئەوم بۆ دووئێل بانگهێشت کرد.

- ئەی خوایە گیان تۆبریندار...

- بۆ پێتوابوو دەمارەکانی من ئاویان تێدایە؟ ئەگەر ڕاستیت دەوێ ئەو خوێنڕشتنە بۆمن بەسوودە...وانییە جەنابی دکتۆر؟ تکایە یارمەتیم بدەن لەناو گالیسکە دانیشم...بۆ بەیانی باش دەبم.پێویست ناکا خەم بخۆی...زۆرباشە گالیسکەچی وەڕێکەوە.

نیکـۆلای پترۆڤـیچ بـەدوای گالیسـکە کـەدا وەڕێکـەوت بـەلاّم بـازارۆف لـەجێی خـۆی مایەوە.نیکۆلای پترۆڤیچ ڕووی تێکردو گوتی:

- داوا لەجەنابت دەکەم تا دکتۆر لە شارەوە دێنین ئاگات لەبراکەم بێ.

بازارۆف قسەی نەکردو تەنیا بە نیشانەی ڕازیبوون سەری نـەویکرد.پاڤێل پترۆڤـیچ دوای کاتژمێرێك بەلاقی پێچراوەوە لەناوجێدا لێی درێژبوو.دڵەخورتەو نیگەرانی باڵی بەسەر تەواوی ماڵێدا کێشابوو.فنیچکا تێکچووبوو.لە گۆشەگیریان نیکۆلای پترۆڤیچ زۆری نەمابوو لەخەم و خەفەتان سەرو دەستی خۆی بشکێنێ.بەلاّم پاڤێل پترۆڤـیچ قسـەی خۆشـی لەگـەڵ بـازارۆف دەکردو پێدەکەنی.

کراسێکی تەنك و چاکەتێکی جوانی لەبەر دابوو کلاّوێکیشـی لەسـەر نـابوو نەیدەهێشـت پەردەکان دابدەنەوە لەوەی کەچەند خواردنێکیان لێ قەدەغە کردبوو گلەیی دەکرد.بەلاّم شەوێ تای هاتێ و سەرئێشە گرتی.سەرەنجام دکتۆر گەیشت.( نیکۆلای پترۆڤـیچ گـوێی بـە قسـەی براکەی نەداو کەسێکی ناردبوو بەدوای دکتۆردا.سەرەڕای ئەوە بازارۆف یـان نەیـدەتوانی یـان نەیدەویست تەواوی ڕۆژێ بەسەر سـەری نەخۆشـەکەوە دانیشـێ و بەهـەمان هـۆ گەڕایـەوە ژوورەکەی خۆی و بەرەنگ بزرکاوی لەوێ دانیشت.چەند جارێك لەگەڵ فنیچکا تێك هەڵنگوت بەلاّم ئەو لە بازارۆف دەسڵەمیەوە.)

پزیشك وێڕای سەلماندنی قسەکانی بازارۆف کە خەتەرێك لەگۆڕێ نیە ڕایسپارد بۆ ئـەوەی تایەکەی دابەزێ هەندێك خواردنەوەی ساردی بدەنێ.نیکۆلای پترۆڤیچ بە دکتـۆری گـوت کـە براکەی بەڕێکەوت بریندار بووە.دکتۆریش لەوەلاّمدا تەنیا همێکی گوتبوو بەلاّم هەرکە بیست و پێنج ڕۆبڵەکەی وەرگرت گوتی:

- بەڵێ،ئەوجۆرە ڕووداوانە هەمیشە ڕوودەدەن.

ئەو شەوە کەس چاوی لێك نەنا.تەنانەت کەس نەچووە سـەرجێوبانی نووسـتنیش.نیکۆلای پترۆڤیچ هەر ناوەناوە بەبێ هەستی تا پشت ئەو دەرگایە دەچوو کە براکەی لەودیوی نوستبوو، بەبێ هەستیش دەگەڕایەوە.پاڤێل پترۆڤیچ هەندێجار بێهۆش دەبوو، هەندێك ناڵـەی دەکـردو بەزمانی فەرەنسی داوای لەبراکەی دەکرد کە بڕوا بنـوێ و پاشـان داوای ئـاوی کرد.نیکـۆلای پترۆڤیچ داوای لە فنیچکا کرد کەمێك ئاوی لیمۆی بداتێ.پاڤێل پترۆڤیچ سەیرێکی فنیچـکای کـردو پەرداخەکـەی هەڵقوڕانـد.لای بـەیانی تایەکـەی زیـادی کـردو نـەخۆش کەوتـە

وڕێنەکردن.سەرەتا پاڤێلێ پترۆڤیچ قسەی هەڵێت و پەڵێتی دەگوت بەلاّم هەرکەچاوی هەڵێنا براکەی دیت لێی پرسی:

- پێتوانییە فنیچکا شێوەی لە( نیلی) دەکا؟

- کام نیلی؟

- چ پرسیارێکی گێلانە...وەك شازادە خانم نیلی...بەتایبەتی بەشی سەرەوەی ڕووخساری.

پاشان بەفەرەنسی گوتی:

- فنیچکاش لەهەمان بنەماڵەیە.

نیکۆلاّی پترۆڤیچ وەلاّمێکی نەدایەوە بەلاّم لە زیندوو مانەوەی بیرەوەری لەمێشکی مرۆڤەکاندا سەری سووڕماو لەبەر خۆیەوە گوتی:

- تازە دەستی پێکردووە.

پاڤێلێ پترۆڤیچ دەستی وەبن سەریداو بەناڵینەوە گوتی:

- ئای کەچەندە حەزی ئەو بوونەوەرە مێشکی پڕکردووم.

پاش کەمێك بێدەنگی درێژەیدایە:

- ڕێگا نادەم دەستی هیچ بێ ئابڕوویەك یان توانای...

نیکۆلاّی پترۆڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا بەلاّم نەیزانی کە براکەی باسی چیدەکات.بۆ سبەی بەیانی بازارۆف کە بۆقەکان و جروجانەوەرو باڵندەکانی ئازاد کردن چووەلای نیکۆلاّی پترۆڤیچ.خانەخوێ بەپیریەوە هات و پرسی:

- بۆ ماڵئاواییکردن هاتووی؟

- بەڵێ وایە.

- من هەستت پێدەکەم.هەرچەندە براکەم خەتابارە بەلاّم بەهەرحاڵ ئەو هەقی خۆی وەرگرتووە.پێگوتم ئەو ناچاری کردووی تۆش هەرچەندە دژی ئەو کارەبووی بەلاّم هیچ ڕێگا چارەیەکت بۆ نەمابۆوە.( نیکۆلاّی پترۆڤیچ بەڕەوانی نەیدەتوانی وشەکان دەربڕێ.) دەزانی براکەم لە خەڵکە کۆنەکانە...بنیادەمێکی کەللەڕەق و تووڕەیە...دووبارە جێگای دڵخۆشیە کە بابەتەکە بەو شێوەیە کۆتای هات...هەولّی پێویستمداوە بۆ پەردەپۆشی ئەو ڕووداوە.

بازارۆف بێگرنگیدان گوتی:

- من ناونیشانی خۆمتان بۆ بەجێدێلّم ئەگەر شتێك ڕوویدا بمدۆزنەوە.

- یۆگینی ڤاسلییۆڤیچ هیوادارم هیچ ڕووداوێکی دیکەی نەخوازراو ڕوو نەداتەوە...لەوەی مانەوەی تۆ لە ماڵەکەم بەو شێوەیە کۆتایی هات زۆر بەداخەوەم..زۆریش بەداخەوەم لەوەی کە ئارکادی...

بازارۆف کە لە هەرجۆرە هەستێکی دڵسۆزانە بێزاربوو قسەکانی نیکۆلای پترۆڤیچی بڕی و گوتی:

- بەگریمانەی زۆر ئارکادی دەبینم.بەلاّم ئەگەر نەشم توانی ببینم سلاّوی منی پێبگەیەنن.

لەوەلاّمدا نیکۆلای پترۆڤیچ ئیکلامێکی کێشاو گوتی:

- منیش تکادەکەم کە...

بەلاّم بازارۆف چاوەڕوانی باقی قسەکەی نەکردوو لە ژوورەکەی هاتەدەر.کاتێك پاڤێل پترۆڤیچ بیستی کە بازارۆف نیازی ڕۆیشتنی هەیە، داوی کرد ببینێ و کاتێکیش هاتە ژوورەکەی توند دەستی گوشی هەرچەندە بازارۆف هەروا ساردوو بێ موبالات بوو.ئەو دەیزانی کە پاڤێل پترۆڤیچ دەیەوێ لەبەرامبەریدا پیاوەتی خۆی بنوێنێ.

بازارۆف نەیتوانی ماڵئاوایی لە فنیچکا بکات تەنیا بۆ چرکەساتێك لەپشت پەنجەرەوە دیتی.فنیچکا خەمگین دەهاتە بەرچاو.بازارۆف لەبەرخۆیەوە گوتی:

- ئەوخەمەش کۆتایی دێ...هەرچۆنێك بێ بە سەریدا زاڵدەبێ.

بەپێچەوانە پیووتەر لە کاتێکدا ئەو دەڕۆیشت سەری خستە سەرشانی و دەستیکرد بەگریان تا سەرەنجام بازارۆف هێوری کردەوەو پرسی:

- بۆ مەگەر فرمێسکەکانت لە قوڵتدا شاردبوونەوە؟

دوونیا بۆ ئەوەی کەس هەست بەخەمی دەروونی نەکا چووە ناو بێشەلانەکە.سەرەنجام هۆکاری سەرەکی کێشەکان سواری گالیسکەبوو.جگەرەیەکی داگیرساندو دوای بڕینی چوار فرسەخ ڕێگا کە گەیشتنە گەوەکە، تێگەیشت کە بۆ دواجارە شوێنی کیرسانۆفەکان دەبینێ،تفێکی ڕۆکردوو لەبن لێوانەوە گوتی:

- خانەدانە نەفرەتیەکان!

پاشان خۆی لەجلیقەکەیەوە پێچا.

* * *

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پاڤێلێ پترۆڤیچ باشتر دەبوو بەلاّم ناچارکرا تا یەك هەفتە لـە جێدابێ.ئـەو دەورانی زیندانیەی بەخۆشی تێپەڕاند، تەنیا کاری ئارایشـی زۆر درێـژەی دەکێشـاو بـەردەوام دەستووری دەدا لە ژوورەکەیدا بخوری بۆنخۆش داگیرسـێنن.نیکۆلاّی پترۆڤـیچ ڕۆژنامـەی بـۆ دەخوێندەوەو فنیچـکاش خزمـەتی دەکرد.سـووپ و ئـاولیمۆو هێلکـەی کـولاّو و چـای بـۆ دێنا.لەگەلّ ئەوەشدا هەرکاتێك پێیدێنا ژوور ترسێك سەر تاپای دادەگرت.ئەو کارەی کە پاڤێلێ پترۆڤیچ ئەنجامی دابوو ببوە مایـەی تـرس و دلّەڕاوکـەی تـەواوی دانیشـتوانی مـالّێ تـەنیا پراکیفۆڤیچ بوو کە وەسەرخۆی نەدێناو بەهێمنی دەیگوت:

- لەزەمانی منیشدا ئاغای زۆر دەگژیەك ڕادەچـوون بـەلاّم ئـەو کـارە تـەنیا خانـەدان و ئاغاکان لەنێوخۆیاندا ئەنجامیان دەدا نموونەی وەك ئەو سوالّکەرە برسیانەش دەسـتووریان دەدا تا لەتەویلەدا لەژێر قامچیاندا ڕایان بێخن.

فنیچکا ویژدانی ئازاری نەدەدا بەلاّم هەرکاتێك دەیویست لە هۆکاری سەرەکی دووئێلەکـە تێبگا نیگەران دەبوو.بێجگە لەوە پاڤێلێ پترۆڤیچ بەشـێوەیەکی وا سـەیری دەکـرد کـە هـەتا جاری وابوو کە پشتیشی لە پاڤێـلێ پترۆڤـیچ بـوو قورسـایی نیگاکـانی هەسـت پێدەکرد.ئـەو دلّەڕاوکێیە بووە هۆکاری ئەوەی فنیچکا کزولاوازبێ هەرچەندە ئەو کزولاوازیە ئەوی جـوانتر دەکرد.

بەیانییەك پاڤێلێ پترۆڤیچ هەستیکرد باشـترە، بۆیـە لـە جێوبانەکـەی هاتـەدەرو لەسـەر کورسییەك دانیشت.نیکۆلاّی پترۆڤیچ دوای ئەوەی سەردانیکرد چووەلای خەرمانەکەی.فنیچکا فنجانێك چای هێناو لە سەرمێزەکەی داناو نیازی وابوو بڕوات بەلاّم پاڤێلێ پترۆڤیچ نەیهێشت و گوتی:

- فدۆسیا ننیکلاّیۆنا بۆ وا بەپەلەی؟...مەگەر کاری زۆرگرنگت هەیە؟

- نەخێر...تەنیا دەمەوێ بچم چای بێنم.

- دوونیا لەجیاتی تۆ ئەو کـارەی دەکا.واباشـترە کـەمێك لای نـەخۆش دانیشـی.دەمەوێ قسەت لەگەلّ بکەم.

فنیچکا بە هێمنی لەسەر کورسیەك دانیشت.پاڤێلێ پترۆڤیچ دەستێکی بەسمێلاّنـدا هێنـاو گوتی:

- باش سەرنجبدە، دەمێك بوو دەمویست پرسیارێکت لێبکەم...دەلّێی لێم دەترسی؟

- من؟

- بەڵێ، تۆ. تۆ هیچ کات سەیرم ناکەی...دەڵێی ویژدانت لە شتێك ئازارت دەدا.

فنیچکا ڕەنگی تێکچوو لەگەڵ ئەوەش لە پاڤێڵ پترۆڤیچەوە ڕاما.قەلاّفەتی سەیر هاتە بەرچاو هەرئەوە دڵی فنیچکای لەرزاند.

پاڤڵ پترۆڤیچ دووبارەی کردەوە:

- دەڵێی ویژدانت ئازارت دەد،وانییە؟

فنبچکا بە هێمنی وەلاّمی دایەوە:

- بەچ هۆیەك دەبێ ویژدانم ئازارم بدا؟

- زورباش نازانم...بەلاّم دەبێ بەڵگەی زۆرهەبن بۆنمونە تۆ لەبەرامبەر کەسێکدا خۆت بەخەتابار دەزانی.چ کەسێك؟ من؟پێموا نیەوابێ.لەبەرامبەر تێکڕای ئەندامانی خێزان ئەدی چی؟ ئەوانە لەگەڵ عەقڵ ناگونجێن.ڕەنگە لەبەرامبەر براکەم؟ بەلاّم تۆ کە عاشقی ئەوی، وانییە؟

- بەڵێ، خۆشمدەوێ.

- بەتەواوی وجودتەوە؟

- بەڵێ، من نیکۆلاّی پترۆڤیچم بە تەواوی وجودمەوە خۆشدەوێ.

- بەڕاستی؟ فنیچکا سەیرم کە.( ئەوە یەکەم جاربوو کە پاڤێڵ پترۆڤیچ خۆمانە قسەی لەگەڵ فنیچکادا دەکرد) تۆخۆت زۆرباش دەزانی درۆکردن گەورەترین گوناهە.

- درۆناکەم پاڤێڵ پترۆڤیچ.ئەگەر نیکۆلاّی پترۆڤیچم خۆشنەوێ ئیدی بۆچی باشم و بژیم؟

- هیچ کەسێکت پێ لەو باشتر نییە؟

- بۆنمونە کێم پێ لەوی باشتربێ؟

- زۆرکەس؟ بۆنمونە هەمان کابرای کە ماوەیەك لەمەوپێش...

فنیچکا لەشوێنی خۆی هەستاو گوتی:

- خوایەگیان...پاڤێڵ پترۆڤیچ تۆ بۆچی هێندەت پێخۆشە ئازارم بدەی؟ مەگەر من چ خراپەیەکم لەگەڵ کردووی؟ چۆن دەتوانی ئەو قسانەبکەی؟

ڕاوێژی پاڤێڵ پترۆڤیچ خەمناك بوو:

- ئاخر هەمووشتێکم دیت، فنیچکا.

- تۆ چیت دیت؟

- لەویّ...لەژێرکەپرەکە.

فنیچکا سوور هەڵگەڕاو بە دژواریەوە گوتی:

- خەتای من چی بوو؟

- من تەنیا نیکۆلای پترۆڤیچم خۆشدەویّ و هەتا هەتایە هەر ئەویشم خۆشدەویّ.

فنیچکا کاتێك ئەو قسەیەی کرد دەنگی دلێرانەبوو بەلاّم پاش کەمێك ڕقێك گەرووی گرت:

- بەلاّم ئەوەی کە تۆ دیتت...لە ڕۆژی ئاخیریشدا دەلێم کە گوناهێکم نەکردووە.پێمخۆشە بمرم بەلاّم گومانێکی وا لەمن نەکەی.من لەبەرامبەر ڕۆژی دەرەکەم نیکۆلای پترۆڤیچ...

فنیچکا قسەکەی تەواو نەکرد. هەستیکرد پاڤێل پترۆڤیچ دەستی لەناو دەستی خۆی گرتووەو دەیگوشیّ...فنیچکا بەسەر سوورمانەوە سەیریکرد.پاڤێل پترۆڤیچ ڕەنگی بەڕوانەوە نەمابوو.تیشکێك لە چاوەکانیدا دەبینراو لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو دلۆپە فرمێسکێك بە ڕووخساریدا هاتەخوار.

پاڤێل پترۆڤیچ بە دەنگێکی دلگیرەوە گوتی:

- فنیچکا، هەمیشە براکەمت خۆشبویّ.مرۆڤێکی باش و دلپاکە.بەخاتری هیچ شتێك و بەخاتری هیچ کەسێك خیانەتی پیّ مەکەو نەکەی هیچ کەسێك بەقسەکانی فریوت بدات.بیرکەوە خۆشەویستی یەك لایەنە چەندە ئازار بەخشە...هەرگیز نیکۆلای بێچارەم جیّ مەهێلە.

سەرسووڕمانی فنیچکا بە ڕادەیەك بوو کە لەگریان وەستاو ترسەکەی نەما.بەلاّم کاتێك پاڤێل پترۆڤیچ دەستی گرت و لە لێوەکانی نزیك جستەوە فنیچکا زۆری نەمابوو بێهۆش بیّ.لەبەر خۆیەوە بیریکردەوە:

- خوایەگیان سەکتە لێینەدابیّ؟

ئەو دەمە بیرەوەریەکی لەدلی پاڤێل پترۆڤیچدا زیندوو کردەوە.دەنگی پێیەك لەپیلیکانە دارەکە هاتەبەرگویّ.پاڤێل پترۆڤیچ چووەسەرجێگاکەی.دەرگا کرایەوەو نیکۆلای پترۆڤیچ بە ڕووخۆشی هاتە ژووریّ میتیا لەباوەشی باوکیدابوو پەلە قاژەی دەکرد.فنیچکاش بە ڕووخۆشییەوە بەرەولای نیکۆلای پترۆڤیچ ڕۆیشت و میتیای لێوەرگرت و سەری خستە

سەرشانی مێردەکەی.نیکۆلای پترۆڤیچ پێی سەیربوو.تا ئێستا نەیدیتبوو فنیچکا بەو هەموو شەرم و شکۆیەوە، نازوعیشوە بکا.نیکۆلای پترۆڤیچ میتیای وەدایکی داو پرسی:

- چی بووە فنیچکا؟

پاشان بەرەولای براکەی ڕۆیشت و ئەحوالپرسی لێکرد:

- خۆ خراپتر نەبووی؟

نەخۆش کە دەم و چاوی لەناو بالیفەکەدا دەشاردەوە گوتی:

- نەخێر...بەپێچەوانە حالم لەهەموو کاتێك باشترە.

- تۆ نابێ وازوو لەنێو جێوبانەکەت بێیتەدەرێ.

نیکۆلای پترۆڤیچ پاشان بەرەولای فنیچکا وەرسووڕاو پرسی:

- بۆ کوێ دەچی؟

بەلام فنیچکا ڕۆیشت و دەرگای لەگەل خۆی پێوەدا.نیکۆلای پترۆڤیچ پرسی:

- هاتبووم پالەوانەکەمت پێنیشان بدەم ئاخر زۆر بیری مامی کردبوو بەلام نازانم بۆ فنیچکا لەگەل خۆی بردی؟...دەلێی تۆ شتێکت هەیە؟ ئایا شتێك ڕوویداوە؟

پاڤێل پترۆڤیچ بە ڕووخۆشییەوە گوتی:

- برا بەلێنم پێدەدەی کە داوای شتێکت لێبکەم درێغی لێ ناکەی؟

- چ شتێك؟

- تکایەکی زۆر گرنگ پێموایە کە ئەو داوایە بنەمای ژیانی تۆ بنیات دەنێ.لە تەواوی ئەو ماوەیەدا هەمیشە بیرم دەکردەوە چۆن ئەو بابەتەت لەگەلدا باسبکەم...براگیان هەولبدە ئەو ئەرکەت زۆر بەباشی ئەنجام بدەی.شەیتانی بە لەعنەت کە تا تووشی وەس وەسە نەبی.

- پاڤێل، لەمەبەستت تێناگەم؟

- لەگەل فنیچکادا زەماوەند بکە...ئەو دایکی کوڕەکەتە.زۆریشی خۆشدەوێی.

نیکۆلای پترۆڤیچ هەنگاوێك بۆ دواوە گەڕایەوەو چەپلەی لێدا.

- پاڤێل ئەوە تۆ ی ئەو قسانەدەکەی؟ تۆ بەردەوام دژی ئەو زەماوەندەبووی.بۆچما نازانی تەنیا لەبەرخاتری تۆ تا ئێستا ئەوکارەم نەکردووە.

پاڤێل پترۆڤیچ بزەیەکی خەمناکی هاتێ و گوتی:

- پێویست نەبوو لەو بارەیەوە ڕێز لەمن بگری.بەرەبەرە بەو نەتیجە دەگەم کە هەندێك لە قسەکانی بازارۆف دەربارەی من ڕاستن.نا، براله. داب و دەستووری کۆن ئیدی بەسە.وەرەو ئەو کارەی کە حەزت لێیە ئەنجامی بدە بێگوێدانە ڕێوڕەسم.ڕەنگە خۆشبەختی ڕاستەقینەش هەرئەوەبێ.

نیکۆلای پترۆڤیچ براکەی لە باوەشگرت و گوتی:

- پاڤێل، تۆ چاوەکانت کردمەوە.لەخۆڕانییە کە دەڵێم براکەم ژیرترین و داناترین پیاوی دنیایە.ئێستاش کە سەیردەکەم بە هەمان ڕادە گەورەیی دەنوێنی و بەخەمی.

پاڤێل پترۆڤیچ گوتی:

- هەندێك لەسەرخۆبە کاکە.پێویست ناکا پێی براپەنجاساڵەکەت کە لە دووئێلدا بریندارببوو بشکێنی...کەوایە قبوڵدەکەی فنیچکا بەڕەسمی ببێتە هاوسەرت.

ئەگەرچی ئەو هێندە بڕوای بە هاوسەرگیری نەبوو بەلام هەستی یەکسانخوازانەی بۆئەو کارە خۆشحاڵی کرد.

- ئەدی ئارکادی دەڵێ چی؟

- ئەو حەتمەن شاگەشکەدەبێ...لەڕاستیدا لەسەدەی نۆزدەهەمدا کەس هەقی نییە خەڵك بەسەرچینی جۆراوجۆردا دابەش بکا.

دووبرا باوەشیان لێکدا.پاڤێل پترۆڤیچ گوتی:

- ئەرێ باشترنییە هەر ئێستا ئەو باسە بە فنیچکا بڵێی؟

- بۆ وا بەپەلە؟ بۆچما پێشتر ئێوە قسەیەکتان کردووە؟

- ئەوە باسی چی دەکەی؟ گفتوگۆ لەنێوان ئێمە؟!

- واباشە تا تۆ چاك دەبیەوە ڕاوەستین و دوای ئەوەش هەموان لەو بابەتە ئاگادار دەکەینەوە دەبێ تەواوی لایەنەکان لەبەرچاو بگرین.

- بەلام تۆ بڕیاری کۆتایت داوە؟

- بێگومان و بەوپەڕی دڵنیاییەوە زۆر سوپاسی تۆش دەکەم...واباشە بەتەنیا جێت بێڵم تا کەمێك بحەسێیتەوە.هەژان و هەڵچوون بۆتۆ باش نییە...ئێمە دووبارە لەو بارەیەوە قسەدەکەین.واباشە ئێستا بڕۆی بحەوی.خودای گەورە هەرچی زووتر چاکت کاتەوە.

دوای ڕۆیشتنی نیکۆلای پترۆڤیچ، پاڤێل کەوتە دەریای بیرکردنەوە:

- ئــەو هــەموو سوپاســە بۆچــی؟ دەڵێــی ئــەو کــارە تــەنیا بــە ڕەزامەنــدی منــەوە بەستراوەتەوە...دوای زەماوەندی ئەوان بۆ شوێنێکی دوور، بۆ دەرسیدن یان فلـۆرانس دەڕۆم و باقی تەمەنی خۆم لەوێ بەسەردەبەم.

پاڤێڵ پترۆڤیچ عەتری لەناو چەوانیداو چـاوی لێـك نان.ڕووخسـاری جـوان و کـزی لـەژێر تیشکی خۆردا وەکـو سـەری کابرایـەکی مـردوو کـەوتبووە سـەر سـەرینەکە...لە ڕاسـتیدا لەوەبەدوا مردبوو.

## (٢٥)

کاتیاو ئارکادی لەسەر نیوتەختێکی باخی نیکلسکۆی، دانیشتبوون.سەگەکەی ماڵێ لەژێر پێی ئەواندا چەمۆڵەی دادابوو.هەم کاتیاو هــەم ئارکـادی بـە بێـدەنگی دانیشـتبوون.ئارکادی کتێبێکی بە دەستەوەبوو کاتیاش بەرچنەیەکی بە دەستەوەبوو کە وردەنانی تێدابوو دەریـدێناو لە پێش ئەو چۆلەکە بەهەڵمەتانـەی ڕادەگـرت کـە وەدوای توێشـوو کەوتبوون.شـنەبایەك لـە تلۆفکی دەرەختەکانی دەدا تیشکی خۆر لەو دوانەی نەدەدا تەنیا جارجار تیشکێکی زێڕین لـە لاجانگی کاتیای دەدا.

هەردووکیان بێدەنگ بوون بەلاّم هەمان بێدەنگی و لە پەنایەك دانیشتن، نیشانەی ئەوەبوو کە لە نێوانیاندا لێکگەیشتن و بڕوا بوونێکی تەواوهەیە.ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا هیچیان لە بیری یـەکتر دانـەبوون بـەلاّم لـە ناخـدا هەریەکـەیان ئـەو لـەکن یەکبوونـەیان بـە دەسـتکەوتێك دەزانی.ڕواڵەتی ڕووخسارەکان هەروەك جاران بـوون، کـە ئـەو جیاوازیـەی ئارکـادی کـەمێك ئارامتر دەهاتە بەرچاو و کاتیاش کەمێك جەسووتربوو.

ئارکادی پرسی:

- ئەرێ بەڕای تۆ ناوی درەختی بناو بەڕووسی ( بامسما)[١] نییە.

کاتیا سەیرێکی ئاسمانی کردو گوتی:

- بەڵێ.

ئارکادی لەبەر خۆیەوە گوتی:

- ئەرێ ئەوەش ئەگەر وشەیەکی جوان بڵێم گاڵتەم پێ ناکا؟

کاتیا سەیرێکی ئەو کتێبەی کرد کە بەدەست ئارکادیە وەبوو گوتی:

- مـن ( هانیـە)[٢]م لـەکاتی گریـان، یـان لـەکاتی پێکـەنین دا خۆشـناوێ.لەکاتێکدا لـە ئەندێشەدایە هۆگری دەبم.

---

١- بەرووسی بەو درەختە دەڵێن (یاسن)، کە بەمانای ڕووناکی دێت.

٢- شاعیرێکی ئەڵمانیە.

ئارکادی گوتی:

- بەلاّم ئەو هەر کاتێك پێبکەنێ خۆشمدەوێ.

- ئەوەش بەهەمان هۆکارەوەیە کە هێشتاش لە ناخی تۆدا هەمان حالّەتی گالّتەپێکردن و پێکەنینی ڕابردوو هەرماوە.( ئارکادی لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: هەلّسوکەوتی ڕابردوو.ئەگەر بازارۆف گوێی لەوەدەبوو.) ئێمە بەتەواوی تۆ دەگۆڕین.

- کێ ئەو کارەی دەکا؟ تۆ؟

- من و خوشکم کە ئیدی دم بەدمەی لەگەلّدا ناکەی و پووریشم کە سێیەم ڕۆژ تا کلێسا بەڕێت کرد.

- ئەوەی ئاخری نەمدەتوانی ئەنجامی نەدەم.بەلاّم دەربارەی خوشکت دەبێ بلّێم ئەگەر لەبیریان مابێ لەزۆر بابەتدا هاوڕای یۆگینی ڤاسلیۆڤیچ بوون.

- خوشکیشم لەو کاتەدا وەکو تۆ کەوتبووە ژێرکاریگریەوە.

- وەکو من؟ بۆچما نابینی کەمن، خۆم لە کۆت و بەندی ئەو نەجاتداوە؟

کاتیا وەلاّمێکی نەدایەوە.ئارکادی گوتی:

- دەزانم تۆ خۆشتناوێ.

- دەربارەی ئەو هیچ نالّێم.

- کاترینا سرگیۆنا، ئەگەر ڕاستست دەوێ ناتوانم ئەو قسەیەت لێوەربگرم...چۆن دەکرێ کەسێك هەبێ و نەتوانێ لە بارەی ئەو ڕایەك دەربڕێ؟ ئەوە قبولّ ناکرێ.

- کەوایە ڕای خۆم دەلّێم...من ناخۆشم ناوێ تەنیا پێموایە من و ئەو زۆرلێك دوورین.تەنانەت تۆش لێی دووری.

- بۆچی من؟

- چۆن پێت بلّێم...لەبەر ئەوەی ئەو سەرکێشەو تۆ دەستەمۆی.

- منیش دەستەمۆم؟

کاتیا سەری نەویکرد.ئارکادی گوێی خوراند:

- کاترینا سرگیۆنا، باش سەرنجبدە...بەڕای تۆ ئەو دەربڕینەی دەستەمۆیە سووکایەتی پێکردن نییە.

- تۆ حەزدەکەی سەرکێش بی؟

- سەرکێش نەخێر بەڵام بەهێزو توانا بەڵێ.

- ناکرێ ئارەزووت ئەوەبێ...بۆنموونە هاورێکەت ئـەوەی نەدەویسـت بـەڵام لـە ناخیـدا هەبوو.

- ئاوا؟ کەوایە بڕوات وایە کە خوشکەکەت کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو؟

- بەڵێ، بەڵام هیچ کەس ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

- چۆن دەزانی؟

- چونکە ئەو زۆرلەخۆبایی و غرووره...نەمدەویست ئەو قسەیە بکەم...لەلای ئـەو هـیچ شتێك بەڕادەی ئازادی و سەربەخۆیی گرنگ نییە.

ئارکادی پرسی:

- کێ گرنگی بۆ ئازادی و سەربەخۆیی خۆی دانانی؟

لەخۆی پرسی:

- چ کەڵکێکی هەیە؟

هەمان بیر بەمێشکی کاتیاشدا تێپەڕی.ئەوانەی لێك نزیکن وەکویەك بیردەکەنەوە.

ئارکادی بزەیەکی هاتێ و لە کاتیا نزیك کەوتەوەو بە ئارامی پرسی:

- پێتوانییە کەمێك لێی دەترسی؟

- لە چ کەسێك؟

- لە خوشکت.

- ئەدی تۆ؟ تۆش لێی ناترسی؟

- منیش دەترسم.باش سەنجبدە کە گوتم: منیش.

کاتیا بەپەنجەڕاوەشاندنەوە گوتی:

- شتێك کە مایەی سەرسووڕمانی منە ئەوەیە کە خوشکم لەهەموو کاتێك زیاتر جێگـای سەنجی ئەوی تەنانەت زۆر لەو کاتەش کە بۆیەکەم جار هاتییە ئێرە.

- سەیرە.

- تۆ هەستت پێنەکردوو؟ ئایا پێخۆشحاڵ نی؟

ئارکادی دوای کەمێك بیرکردنەوە، وەڵامی دایەوە:

- تا ئەوجێگایەی وەبیرم بێ خزمەتێکی واگەورەم پێنەکردووە کە شایانی خۆشەویستی ئەوبم...ڕەنگە دەربڕینی خۆشەویستی خوشکت بۆ ئەوەبێ کە نامەکانی دایکتم بۆ هێناوەتەوە.

- ئەوە تەنیا بەڵگەیەکە.بەڵگەی دیکەش هەن کە پێتی نالێم.

- بۆچی؟

- پێتنالێم.

- ئاخ، دەزانم چەندە کەللەڕەقی.

- کەللەڕەق؟

- خۆپارێزیش.هەمووشتێکیش باش دەبینی.

کاتیا بەتیلە نیگایەك لە ئارکادیەوە ڕاماو گوتی:

- ڕەنگە تۆ ئەو تایبەت مەندیانەت بەدڵ نەبن؟ وانییە؟ بیرلەچی دەکەیەوە؟

- بیر دەکەمەوە کەئەو خۆ پارێزیە چۆن لەتۆدا پەیدابووەو بۆچی متمانە بەهیچ کەسێك ناکەی...

- چونکە زۆر بەتەنیا ژیاوم ئاساییە بنیادەمێك لە تەنیاییدا بکەوێتە بیرکردنەوە.بەلاّم بەرامبەر بە هەمووکەسێك بێ متمانەنیم.

ئارکادی بە ئەمەگدارییەوە سەیرێکی کاتیای کردو گوتی:

- ئەو تایبەت مەندیە زۆریش خراپ نیە.بەلاّم ئەو کەسانەی لەپێگەی تۆدان، یانی ئەو کەسانەی کە بەڕادەی تۆ دەوڵەمەندن کەمتر بەخشندەن.ئەوانە بەزەحمەت ڕاستی دەسەلمێنن هەروەکو پاشاکان ئامادەنین حەقیقەت بسەلمێنن.

- بەلاّم من دەوڵەمەند نیم.

ئارکادی پێی سەیربوو نەیتوانی لەمەبەستی کاتیا تێبگا.لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە کە ڕەنگە ئەو هەموو مڵکە ئی خوشکەکەی بێ.ئەو بیرکردنەوە ئازاریدا.بە هێمنی گوتی:

- زۆرباش قسەی خۆت کرد؟

- چۆن؟

- زۆر بەئاسانی قسەی خۆت کرد.نەشەرمت کردو نەخۆشت نواند.پێموایە ئەگەر کەسێك بڵێ من هەژارم ئەوا دەیەوێ بەخۆی هەڵبڵێ.

- من لەژێر سایەی خوشکمدا تا ئێستا هەژاری و دەست کورتیم نەدیوەو ئێستاش کە ئەوباسە هاتەگۆڕێ بۆیە باسیدەکەم.

- بەڵێ، ڕاستە.بەلاٌم ئەوەش بسەلمێنە کە لە تۆشدا ئەو لە خۆڕازیبوونە هەیە کە باسمانکرد.

- بۆنموونە؟

- بۆنموونەکە...لەوشتەی کە دەپرسم داوالی لێبووردن دەکەم: تۆش حەتمەن لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند زەماوەند دەکەی.وانییە؟

- ئەگەر ئەوم لەڕادەبەدەوریش خۆشبوێ...تەنانەت ئەو کاتیش زەماوەندی لەگەڵ ناکەم.

- دیتت چیم گوت؟

پاشان ئارکادی پرسیاریکردەوە:

- بۆچی زەماوندی لەگەڵ ناکەی؟

- لەبەر ئەوەی هاوشانی یەك نین.

- ڕەنگە بتەوێ بەسەریدا زاڵبی یان...

- نا، هەرگیز شتی وانییە.چی لە بالاٌدەست بوون بکەم؟ بەپێچەوانە ئامادەم گوێ ڕایەڵ بم ئەو بەرابەریەش ئازاردەرە.من پیمٌوایە مرۆڤ هەم دەتوانێ گوێ ڕایەڵبێ و هەم بەڕێزبێ.بەلاٌم ژێر دەستە بوون...ئەوەیان ئیدی قبوڵ ناکرێ.هەرچەندە تا ئێستاش بووە ئیدی بەسە.

ئارکادی دووبارەی کردەوە:

- ئەوەی تا ئێستا بووە بەسە...بەڕاستی تۆ خوشکی ئاناسرگیۆنای.تۆش تەنیا بەلاتەوە ئازادی و سەربەخۆیی گرنگە بەلاٌم تۆ لە بەردلاٌن تری.دلٌنیام تۆ هەستەکانت هەرچەندە پاك و پیرۆزیش بن سەرەتا دەریان ناخەی...

- بۆچما لەوە زیاتریش دەکرێ؟

- تۆش وەکو خوشکت زیرەکی.ئاکارو ڕەوشت لەتۆدا ئەگەر لەوی زیاترنەبێ کەمترنییە.

کاتیا قسەکەی پێ بڕی:

- تکات لێدەکەم پێکەوە بەراوردمان مەکە.من شایانی ئەوەنیم لەگەڵ ئەودا بەراورد بکرێم.دەڵێی لەبیرت چۆتەوە کە خوشکم هەم جوانەو هەم پارەدارەو هەم ژیرو...بەتایبەت لەڕوانگەی تۆوە.بەو پێودانگە ناکرێ بەراوردێکی لەوجۆرە بکەی.

- مەبەستت لەو دەربڕینەی (بەتایبەت لەڕوانگەی تۆ) چی یە؟ و بۆچی وابیر دەکەیەوە کەمن گاڵتەت لەگەڵ دەکەم؟

- چونکە گاڵتەدەکەی.

- بەڕاستی؟ بەلاّم ئەگەر بەجدی قسەم کردبێ و تەنیا عەیبم ئەوەبێ کە مەبەستەکەم باش نەگەیاندبێ، ئەو کات دەڵێی چی؟

- لەمەبەستت تێناگەم.

- بەڕاست وادەڵێی؟ دەڵێی کاتێك گوتم تۆ هەمووشتێك زۆرباش دەبینی کەمێك بەهەڵە چووم.

- چۆن؟

ئارکادی بێ ئەوەی وەلاّمێك بداتەوە ڕووی خۆی وەرگێڕا.کاتیا دووبارە لە بەرچنەکەی لەتکە نانی بەرەولای چۆلەکەکان هەڵدا بەلاّم جوڵەی دەستی هێندە خێرابوو کە چۆلەکەکان هەڵفڕین.سەرەنجام ئارکادی بێدەنگی شکاندو گوتی:

- کاترینا سرگێۆنا، هەرچەندە دەزانم بەلاتەوە گرنگ نییە بەلاّم دەمویست ئەوە بزانی کەمن نەك بەتەنیا بەخوشکت بەڵکو بەهیچ کەسێك لەدنیادا ناتگۆڕمەوە.

دەتگوت لەو دانپێدانانەی تووشی سەرسامی بووە لەشوێنی خۆی هەستاو بە پڕتاو بۆی دەچوو.بەلاّم کاتیا هەروا لەپەنا بەرچنەکەی و دەستی لەسەر ئەژنۆیان دانابوو.ماوەیەك لە دوور کەوتنەوەی ئارکادیەوە ڕاما.ڕەنگی تێکچوو بەلاّم بزەیەك نەکەوتە سەرلێوەکانی.لەقولاّیی چاوەکانیدا هەستێکی تایبەت و خەمێك دەخوێندرایەوە بەلاّم نەیدەتوانی بۆ ئەو هەستەی خۆی ناوێك وەبینێ.گوێی لە دەنگی ئاناسرگێۆنا بوو:

- لێرە بەتەنێی؟ بۆچما ئارکادی لەگەڵ تۆ نەبوو؟

کاتیا بە ئارامی ڕووی وەرگێڕا ( ئانا بەناسکی و جوانییەکی تایبەتەوە جلو بەرگی پۆشیبوو لە ناوەڕاستی ڕێگاکە ڕاوەستابوو) بە هێمنی گوتی:

- بەڵێ، بەتەنیام.

خوشکەکەی بە بزەیەکەوە وەلاّمی دایەوە:

- دەبینم بەتەنێی.ڕەنگە چووبێتە ژوورەکەی خۆی؟

- بەڵێ.

- پێکەوە کتێبتان دەخوێندەوە؟
- بەڵێ.
ئانا پەنجەیەکی بۆ چەناگەی کاتیا بردوو سەیرێکی چاوەکانی کرد.
- هیوادارم هەراتان نەبووبێ.
کاتیا بە ئارامی دەستی خوشکەکەی لاداو گوتی:
- نەخێر...
- چەندە کورت و پووخت وەڵام دەدەیتەوە! دەڵێم بەڵکو لێرە بیبینمەوەو پیاسەیەك بکەین.ئەو هەمیشە داوای ئەوەی لەمن دەکرد.جوتێك پێڵاویان لەشار بۆهێناوی، واباشە بچی تاقیان بکەیتەوە.دوێنێ تێگەیشتم کە پێڵاوەکانت بەکەڵك نەماون.قاچەکانت جوانن و دەستە کانیشت هەرجوانن...بەڵام کەمێك گەورەن.بۆیە دەبێ ئەستووری دەستەکانت بە ناسکی قاچەکانت تێهەڵێنیەوە.لە کاتێکدا دەبینم تۆ هیچ لەفکری ئەو شتانەدانی و گوێی نادەیەی.
ئاناسرگیۆنا لەوێ دوورکەوتەوە.خشەخشی جلکەکانیشی نەما.کاتیاش کتێبەکەی وێکناو لەسەر نیوتەختەکە هەستاو ڕۆیشت، بەڵام نەك بۆ تاقیکردنەوەی پێڵاوەکانی.
کاتیا کاتێك بەهێواشی لە پلیکانەکان سەردەکەوت لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:
- قاچی جوان...قاچی جوان...ئەو، ئەوپێیانە ماچ دەکات.
بەڵام لەو بیرکردنەوەیە شەرمی کردو تیژ تێپەڕی.ئارکادی بەپەلە بەرەو ژوورەکەی دەڕۆیشت کە خزمەتکارەکە وەدوای کەوت و پێی ڕاگەیاند کە جەنابی بازارۆف لە ژوورەکەی ئەودا چاوەڕوانی دەکات.ئارکادی بە سەر سووڕمانەوە گوتی:
- یۆگینی؟!...لەمێژە هاتۆتەوە؟
- نەخێر، هەرئێستا گەیشتۆوەو پێیگوتم کە دەربارەی هاتنی هیچ بە ئاناسرگیۆنا نەڵێم و پێیگوتم ڕاستەڕێ بیبەمە ژوورەکەی تۆ.
ئارکادی بیریکردەوە:
- دەبێ ڕووداوێکی خراپ ڕوویدابێ؟
بەپەلە لە پلیکانەکان سەرکەوت و یەك جێ دەرگای کردەوە.ڕووخسارە بەڕواڵەت ئارامەکەی بازارۆف هێوری کردەوە.بەڵام چاوی تیژبینی هەر کەسێك کە هاتبا ژوورێ دەیتوانی دڵەڕوکێ و شڵەژانی ناخی ئەو میوانە وەخوێنێ.بازارۆف وەك هەمیشە پڕجوڵەو کەمێك

شێواو بوو.تەنانەت کاتێك ئارکادی باوەشی پێداکرد لە شوێنی خۆی هەڵنەستا.ئارکادی پەرێشان هەوڵیدەدا تا خۆی لەهاتنی بازارۆفدا خۆشحاڵ نیشان بدا.بەردەوام لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو دەیگوت:

- هەرگیز چاوەڕوانت نەبووم! پێش هاتێکی سەیرە! هیوادارم لە ماڵێ هیچ شتێك ڕوونەدابێ.

بازارۆف بە هێمنی گوتی:

- بارودۆخی ماڵێ زۆر باشەو هەموویان ساغن.هێندە قسەمەکەو پێیان بڵێ خواردنەوەم بۆبێنن.بۆخۆشت لێرە دانیشەو گوێ بگرە.دەمەوێ زۆر بە ڕاشکاوی قسەت لەگەڵ بکەم و هیوادارم بتوانم مەبەستەکەم بگەیەنم.

ئارکادی ئارام بۆوە.بازارۆف بەسەرهاتی دووئێلی خۆی لەگەڵ پاڤێل پترۆڤیچدا گێڕایەوە.ئارکادی خەمگین بوو بەلاّم پێی باشبوو ئەو هەستەی خۆی دەر نەبڕێ.تەنیا بەوەندە لێگەڕا، کە بپرسێ حاڵی مامی چۆنە کاتێك بازارۆف پێیگوت کە باش بریندارببووە بەلاّم نەك لەڕووی پزیشکییەوە، ئارکادی بەزۆر بزەیەکی هاتێ.هەستی بەسام و خەجاڵەتی دەکرد.بازارۆف کە هەستی بە حاڵی ئەو کردبوو گوتی:

- بەڵێ براله، ئەوەیە دەرەنجامی ژیان لەپاڵ دەرەبەگەکاندا! مرۆڤ بێ ئەوەی دەرکی پێبکا دەبینێ بۆتە دەرەبەگێك و بەشداری لە شمشێرە هەڵکێشراوە کانیاندا دەکات.

لە کۆتایدا گوتی:

- لەکاتی گەڕانەوەمدا بۆماڵێ، لامدائێرە هاتم تا ئەوەی کە...ئەگەر ئەو درۆیەم بە گرنگ نەزانیبا نەمدەگێڕایەوە...بەلاّم خودا باشتردەزانێ کەمن بۆچی هاتوومە ئێرە.ئەگەر ڕاستیت دەوێ خراپ نییە کە مرۆڤ وەکو توور خۆی لەزەوی بێنێتەدەروو دۆستانە خۆی نیشان بدا. هەروەك ئەو کارەی کە ئێستاکردم.بەلاّم حەزم کرد جارێکی دیکەش ئەوشتەی کە لێی جیابوومەوەو ئەو مەڵبەندەی کەلێی گەورەبووم، سەیرێکی بکەمەوە.

ئارکادی بە شڵەژانەوە گوتی:

- هیوادارم مانای ئەوقسانە ئەوە نەبن کە بۆهەمیشە لێم جیادەبیەوە.

بازارۆف نیگای تیژوو کاریگەری خۆی تێگرت:

- بۆ مەگەر لەو بارەیەوە خەمباردەبی؟ من پێموایە دەمێکە من و تۆ لێك جیاین.تۆ ڕێك وەك گوڵەمروارییەك پاك و گەشی...ڕەنگە کارەکانیشت لەگەڵ ئاناسرگیۆنا دا لەوپەڕی خۆشەویستی دابن.

- چ کارێك؟

- بچکۆلە، بۆمەگەر لەبەرخاتری ئەو نەهاتوویە ئێرە؟ دەتەوێ بڵێی کە عاشقی ئەونی؟ یان ئەوەی کە شەرم و حەیا ڕێگای دەربڕینت پێنادا؟

- یۆگینی تۆ دەزانی کە هەمیشە لەگەڵت ڕاستگۆ بووم.دڵنیات دەکەم بەهەڵەچووی.

- بەڕاست! تا ئێستا ئەوەم نەزانیبوو.بەڵام پێویست ناکا نیگەران بی.ئێستا ئیدی ئەو بابەتە بەلای منەوە گرنگ نییە.ئەگەرمنیش کەسێکی هەست ناسك بام پێمدەگوتی کە هەستدەکەم کەلێن کەوتۆتە نێوان ئێمەوە بەلاّم دەڵێم ئێمە بەتەواوی لێك وەڕەزو بێزارین.

- یۆگینی...

- تازە ئەوە شتێك نییە.لەدنیادا شتگەلی زۆرهەن کە مرۆڤەکان لێك بێزارو وەڕەز دەکەن.ئێستا واباشە ماڵئاوایی لەیەك بکەین.ئەوچەند چرکەساتەش کەلێرەم هەست بەنیگەرانی دەکەم.وەك ئەوە وایە کە نامەیەکی گۆگۆل دەخوێنمەوە.جگەلەوەش پێمگوتون ئەسپەکان نەکەنەوە.

- چۆن؟ شتی وانابێ.

- بۆچی؟

- ئێستا لەمن گەڕێ.بەڵام ئاناسرگیۆنا ئەوەی بزانێ نیگەران دەبێ زۆرحەزدەکات بتبینێ و ئەو کردارەشت شتێکی نەشیاوە.

- بەهەڵەچوو وی.

- نا، بەهەڵەنەچووم.ئێستا تۆ بۆخۆت نەبان دەکەی؟ جگە لەوەش تۆ لەبەرخاتری ئەو نەهاتوویەئێرە؟

- ڕەنگە قسەی تۆبێ...بەلاّم بەهەرحاڵ تۆ هەڵەی.

بەلاّم قسەی ئارکادی بوو.ئاناسرگیۆنا دەیویست بازاڕۆف ببینێ.خزمەتکارەکەی بەدوادا نارد.بازارۆف پێش ڕۆیشتن جلکەکانی گۆڕین.وادەهاتە بەرچاو کەپێشتر جلکەکانی ئامادەکردبن.ئادینسۆڤا لە ژووری پێشوازیدا چاوی پێکەوت بەوپەڕی میهرەبانییەوە دەستی بۆ

درێژکرد.بەڵام ڕووخساری دەریدەخست کە لەدەروونیدا ڕای دژبەیەك هەن.بازارۆف دەستی خۆی پێشخست و گوتی:

- ئاناسرگیۆنا، منی بێ کەڵك دڵنیـات دەکـەم کـە کارەگەمـژەکانی ڕابـردووم دووبـارە ناکەمـەوەو هیـوادارم تـۆش ئەوانـەت لـەبیر کـردبن.من لێـرەدەڕۆم و ئـیتر گەڕانەوەیـەك لەگۆڕێدانییە.ئەگەرچی من مرۆڤێکی هەستیارو دڵناسك نـیم سـەرەڕای ئـەوەش نەمـدەتوانی لێرەبڕۆم کە هێشتا نەفرەت کردن لەڕابردوو لە ناخی تۆدا هەرمابێ.

ئاناسـرگیۆنا وەکـو شـاخەوانێك کـە دوای هـەوڵێکی زۆر تـوانیبی بگاتـە سـەر لوتکـە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا.ڕووخساری کرایەوەو دووبارە دەستی بـۆلای بـازارۆف ڕاداشـت و گوتی:

- دەبێ چاوی ئەو کەسەی کە ڕابردوو وەبیرخـۆی دێنێتـەوە لەکالانـەی بێنیەدەرێ.ئەگـەر لەوەش بگوزەرێین دەبێ بڵێم کە منیش هێندە بـێ گونـاه نەبووم.ڕەنگـە بـەنازو عیشـوەوە هاتبم.قسەیەکی دیکەش دەکەم...وەرە با ڕابردوو لەبیربکەین و ببینە دووهاوڕێی باش.ڕابردوو دەبێتەخەون، وانییە؟ کێ گرنگی بە خەون و خەیاڵدەدا؟

- کێ گرنگی پێدەدات؟ جگە لەوە عەشقیش هەستێکی درووستکراوە.

- بەڕاست؟ ئەوقسەیە خۆشحاڵم دەکات.

لەو گفتوگۆیەدا بازارۆف و ئاناسرگیۆنا خۆشحاڵی خۆیان دەردەبـڕی و هـەردووکیان پێیـان وابـوو ڕاسـت دەکەن.بـەڵام ئایـا حەقیقـەت وابـوو؟ خوداباشـتر دەزانـێ! بۆخۆیـان نەیاندەزانی.بەهـەرحاڵ وتوویـژی ئەوانـە نیشـاندەری نێـوان خۆشـیان بوو.لـەنێو قسـەکاندا ئاناسرگیۆنا لە بازارۆفی پرسی لە ماڵی کیرسانۆفەکان چـی دەکـرد؟ زۆری نـەمابوو بـازارۆف تەواوی ڕووداوەکە وەگێڕێ بەڵام بیری کردەوە کە لەوانەیە ئاناسرگیۆنا پێیوابێ لە گێڕانـەوەی ئەوبابەتەدا مەبەستی خۆهەڵکێشان بێ.هەربۆیە تەنیا وەڵامی دایەوە کە تەواوی ئەو ماوەیـە خەریکی کاری خۆی بووە.ئاناسرگیۆنا گوتی:

- سەرەتا زۆر دڵتەنگ بووم هەتا نیازم وابوو بچـمە دەرەوە،بـیری لێبکەوە...پاشـان ئـەو ڕووداوە تێپەڕی و هاوڕێکەت ئارکادی نیکۆلای پترۆڤیچ هاتەئێرەو دووبارە دۆخەکە گەڕایـەوە باری ئاسایی خۆی و منیش ئەرکی خۆم دەست پێکردەوە.

- ئیزن دەدەن پرسیارێك بکەم چ ئەرکێك؟

- ئەركی پوورێك، مامۆستایەك، دایك یان هەرشتێكی دیكە كەوای دانێی.لە ڕاستیدا هاوڕێكەت ئاركادی نەمدەتوانی باش لێی حاڵی بم.ئەو دۆستایەتیەم بەتەواوی بەبێ مانا دەزانی بەلاّم ئێستا ئەوم باشترناسیوە.بە بڕوای من گەنجێكی تێگەیشتوویە...لەهەمووشی گەنگتر ئەوەیە كەگەنجە...زۆرگەنج نەك وەك من و تۆ...

بازارۆف پرسی:

- ئێستاش كە دەتبینێ دەستەپاچەدەبێ و دەترسێ؟

ئاناسرگیۆنا پرسی:

- ئیدی...

كەمێك ڕاوەستاو پاشان درێژەیدایە:

- ئێستا ئەو بە دڵنیاییەكی زیاترەوە قسەدەكا.پێشتر لە قسەكردن لەگەڵ مندا ڕایدەكرد.ئەگەرچی من هێندە گوێم نەدەدایە.ئێستا لەگەڵ كاتیا بوونەتە دووهاوڕێی باش.

بازارۆف كەمێك نیگەران ببوو لەبەرخۆیەوە گوتی:

- مەكروحیلەی ژنان قەت تەواونابن.

پاشان بزەیەكی هاتێ و گوتی:

- گوتت ئاركادی لە دیتنی تۆ ڕادەكا بەلاّم لەبیرت نەچێ كە ڕۆژێك عاشقت بووە؟

ئاناسرگیۆنا لە شوێنی خۆی دەپەڕی و بەسەر سووڕمانەوە پرسی:

- چۆن؟ ئاركادیش!

بازارۆف ئیكلامێكی كێشاو گوتی:

- ئاركادیش! دەتەوێ بڵێی بەر لەوەی باسی بكەم لەو بارەیەوە هیچت نەدەزانی؟

ئاناسرگیۆنا سەری بەردایەوەو گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ تۆ بەهەڵەچووی.

- پێموایە ئەگەرچی دەشكرا.ڕەنگە باشتروابوایە هیچم نەگوتبا.

پاشان لەبەر خۆیەوە گوتی:

- لەوەزیاتر درۆمەكە خانمی بەڕێز.

- بۆچی باشتروابوو كە هیچ نەڵێی؟ پێموایە تۆش لە گەورەكردنی هەندێك لە شتەبچووكەكان كەیفت پێدێ.

- ئاناسرگیۆنا واباشترە  واز لەوباسە بێنین.
ئاناسرگیۆنا گوتی:
- بۆچی؟
بەلاّم دوای ئەوە  بۆخۆی باسەکەی گۆڕی.لەگەلّ ئەوەی کەهەم بازارۆف  گوتبووی دەبێ ڕابردوو لەبیرکەین و هەم خۆیشی بەشتێکی لەوجۆرە  ڕازیببوو سەرەڕای ئەوانەش  هەستی بە نیگەرانی دەکرد.هەرچەندە وتووێژە کەیان ئاسایی و هەندێجار گالّتەشی تێدەکەوت لەگەلّ ئەوانەشدا ئاناسرگیۆنا لەناخی خۆیدا هەستی بە دلّەخورپە دەکرد.ڕێك  وەك ئەو کەسانەی کە لەکەشتی دانیشتوون و بەهەمان ئاسوودەیی ژیانی وشکانی دەدوێن و پێدەکەنن بەلاّم هەرکە کەشتییەکە ڕاوەستا  هەموو دووچاری ترس  دەبن.
گفتوگۆی ئاناسرگیۆناو بازارۆف  زۆری نەکێشاو بەرەبەرە خاوەن مالّ دەگژفکران ڕاچوو.ئەوپرسیارانەی کە دەکران وەلاّمی سەرپێی دەدایەوە سەرەنجام داوای لە بازارۆف کرد لەگەلّی بێتەسالّۆن.پووری و کاتیا لەوێ بوون.ئاناسرگیۆنا پرسی:
- ئەدی ئارکادی نیکۆلاێۆڤیچ لەکوێیە؟
کاتێك زانی نزیکەی کاتژمێرێکە کەس خەبەری لێ نییە، بەدوایدا نارد.دیتیانەوە.چووبوە گۆشەیەکی باخەکە.دەستی خستبووە  ژێر چەناگەی و لەفکرەوەچووبوو.بیرێکی گەورەی لە مێشکیدابوو بەلاّم ئەوبیرانە خەمناك نەبوون.هەرچەندە دەیزانی کە بازارۆف و ئاناسرگیۆنا بەتەنێ  دانیشتوون بەلاّم حەسوودی پێیان نەدەهات و بەپێچەوانە ڕووخساری دەکرایەوە.وادەهاتە بەرچاو کە هەم پێی سەیرەو هەم خۆشحالّیشە.بەهەرحالّ ئەو بڕیاری خۆیدابوو.

ئادینسۆڤای کۆچکردوو هیچ کات حەزی لە تازەگەری و نوێبوونەوە نەبوو بەلاّم تەنیا جارێك دەستی دابووە کارێکی تازە هەربۆیە لەسەردەمی ژیانیدا دەستوویدابوو لە باخەکەیداو لە نێوان گوڵخانەکەو مەلەوانگەکەدا، باڵەخانەیەك بە بیناسازی یۆنانی بەلاّم بەنەخشەی ڕوسی دروستبکەن.لە دیواری کۆتایی ئەو باڵەخانەیە شەش تاقچە دروستکرابوون کە ئەو پەیکەرانەی لە دەرەوە بۆی دەهاتن لەوێی دادەنان.پەیکەرەکان بەشێوەیەکی ئاسایی سەمبولەکان یان خودای گۆشەگیری ، بێدەنگی، خەم، بوون.کاتێك پەیکەری خودای بێدەنگیان بۆ هەڵواسین هێنابوو، هەر ئەوێ ڕۆژێ منداڵە ڕەعیەتەکان لوتی ئەوپەیکەرەی کە پەنجەی خستبووە سەرلێوی، شکاندیان.لەگەڵ ئەوەی وەستا گەچکارەکەی هاوسێیان قەولیدابوو ئەوپەیکەرە بە شێوەیەکی واچاکبکاتەوە کە لە ڕۆژی هەوەڵێ باشتربێ، ئادینسۆڤا فەرمانیدا لە گۆشەیەکی عەمبارەکەی دانێن.هەمان پەیکەر ساڵەهای ساڵ لەوێدا مایەوەو ببووە مایەی ترس و دڵەڕاوکێی ژنە ڕەعیەتەکان.بەشی پێشەوەی باڵەخانەکە دەوەن و گیا تەنیبوویان، بەشێوەیەك کە تەنیا سەری ئەستووندە کەکان لەناو ئەو گژوگیایەدا دەبینرا.ناو باڵەخانەکە تەنانەت لەڕۆژیشدا فێنك بوو.لەو ڕۆژەی کە ئاناسرگیۆنا چاوی بەمارێکی بچوك کەوت ئیدی ڕووی لە وێ نەکردەوە بەلاّم کاتیا زۆرجار دەهاتە ئەوێ و لەسەر نیوتەختێك دادەنیشت.لەو بێدەنگیە ڕەهایەدا، کاتیا یان دەیخوێندەوە یان کارێکی دیکەی دەکرد زۆرجاریش سەرتاپا خۆی دەدایە دەست بێدەنگی و هەمان هەستی ناسك و ئارام بەخشی دەست دەکەوت کە زۆرکەس لە حاڵەتێکی لەوچەشنەدا دەستیان دەکەوێت.هەمان خۆشی دەست دەکەوت کە هەرمرۆڤێك لە دنیای بێدەنگی و چاوەڕوانیدا پێیدەگات ئەویش هەمان هەستە کە بەزەحمەت هەستیپێدەکرێ و دەناسرێ.بەیانی ئەو ڕۆژەی بازارۆف هات، دووبارە کاتیا لە سەر نیوتەختە خۆشەویستەکەی دانیشتبوو وەك دوێنێ ئارکادیش لەپەنای دانیشتبوو.ئارکادی داوای لێکردبوو تا بیهێنێتە ئەوێ لەبەر ئەوەی هێشتا زۆری مابوو بۆ نانخواردنی قاوەڵتی.ئێستا هەوای فێنکی بەیانی

دەڕۆیی تا شوێنی خۆی بداتە هەوای گەرمی ڕۆژێ.حاڵەتی ڕووخساری ئارکادی وەکو دوێنێ وابوو بەلاّم کاتیا وادەهاتە بەرچاو لەبیرکردنەوە دابێ.

ئاناسرگیۆنا دوای چای خواردنەوە بردیە ژوورەکەی خۆی و دوای دلّدانەوە هەمیشەییەکەی،ئاگاداری کردوە دەربارەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئارکادی و چوونە شوێنی چۆڵ بەیەکەوە کە ئەوانی دیکەو بەتایبەتیش پووری هەستیان پێکردبوو، داوایلێکرد خۆی لەو کارانە بپارێزێ.جگەلەوەش لە شەوی ڕابردووەوە تا ئێستا ئاناسرگیۆنا کەمێك تووڕە دەهاتە بەرچاو کاتیاش دەتگوت خەتایەکی گەورەی کردووە نیگران بوو.کاتێك کاتیاش داواکەی ئارکادی قبوڵ کرد، بەڵێنی بەخۆیدابوو کە ئەوە دواجارە.

دەنگی دلّنشینی ئارکادی لە گوێیدا زرنگایەوە:

- کاترینا سرگیۆنا، لەو کاتەی خۆشبەختی ژیانم لە ماڵی ئێوەدا پێبڕاوە لەبارەی زۆرشتەوە قسەم لەگەڵ کردووی، بەلاّم هێشتا بابەتێك ماوە.بابەتێك کە لەبارەیەوە هیچم باس نەکردووە.تۆ گوتت من لێرە گۆڕاوم.

ئارکادی هەم سەیری نیگا سەر سووڕمانەکانی کاتیای دەکردو هەم ڕاشیدەکرد.

- بەڵێ من گۆڕانی زۆرم بەسەردا هاتووەو هەمووشی بە ئی تۆ دەزانم.

- من؟...قەرداری من؟

ئارکادی درێژەی بەقسەکانی خۆیدا:

- من ئەو کوڕە لەخۆباییەنیم کە ڕۆژی هەوەڵێ دیتتم.بیست و سێ ساڵ لە تەمەنم تێدەپەڕێ.هێشتاش دەمەوێ سوودمەندبم.دەمەوێ هەموو وجودم تەرخانی لێکۆڵینەوە بکەم.بەلاّم ئێستا ڕێگاکەم گۆڕیوە.ئێستا ئامانجەکەم نزیکتر دەبینمەوە...تا ئێستا نەمدەزانی کێم و کێشەم بۆخۆم درووستدەکرد کە چارەسەرکردنی ئەوانیشم بەلاوە ئەستەم بوو...دەزانم کە ناتوانم مەبەستەکەم باش دەرببڕم بەلاّم هیوادارم تێیان بگەی.

کاتیا قسەیەکی نەکرد.سەیری ئارکادیشی نەکرد.سەیرە باڵسوورێك لەسەر سپیدارێك دەیخوێند.دەنگی ئارکادی ئاڵۆزتر بوو:

- پێموایە...ئەرکی هەرمرۆڤێکی پاك ئەوەیە لەگەڵ کەسانی...لەگەڵ خەڵکانی...بەکورتی لەگەڵ نزیکەکانی خۆی ڕاستگۆبێ و بەهەمان هۆکاریشەوە من...بڕیارمداوە...

بـەلاّم ئارکـادی نـەیتوانی لـەوە زیـاتر هـیچ بلّـیّ و بێـدەنگ بوو.کاتیـا هەرواسـەری بەردابۆوە.دەتگوت هیچ لەمەبەستی ئارکادی تێنە گەیشتووەو چاوەڕوانی ئەوەیە بەبیّ پـێچ و پەنا مەبەستی خۆی دەربڕیّ.

ئارکادی تەواوی هێزی خۆی کۆکردەوەو گوتی:

- پێموانییە ئەو قسەیەی کە دەمەویّ بیکەم ببێتە هۆی سەرسـامی تۆ.بـە تایبـەتی ئـەو قسەیەی کە هەستی من تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی...پەیوەندی بەتۆوە هەیە.لەبیرمە دوێنـیّ لەبەر خاتری جدی نەبوونم سەرزەنشتت کردم.( ئارکادی وەکو ئەو کەسەدەچوو کـە ڕۆچـووبێتە زەلێکەوە کە هەر هەنگاوێکی دەیهـاویّ زیـاتر ڕۆدەچـیّ بـەلاّم بەئومێـدی ڕزگـاربوون هـەر دەچێتەپێش.) ئەو سەرزەنشتە دووچاری زۆربەی گەنجـەکان دەبـیّ تەنانـەت ئەگـەر بەڕاسـتی شیاوی ئەوەش نەبن.ئەگەر من زیاتر بڕوام بەخۆم بایە( ئارکادی چاوەڕوانی یارمـەتی کاتیـای دەکرد بەلاّم ئەو هەروا بە بێدەنگی سەری نەویکردبوو) ئەگەر دەمتوانی هیوایەکم هەبیّ...

گوێی لەدەنگی ئاناسرگیۆنا بوو:

- ئەگەر دەمتوانی باوەڕبکەم کە لەقسەکانتدا ڕاستگۆی...

کاتیا ڕەنگی پەڕی.ئارکادیش بێدەنگ بوو.ئاناسرگیۆنا و بازارۆف بەسـەرجادەکەو بـەلای دەوەنەکاندا تێدەپەڕین.ئارکادی و کاتیا ئـەوانیان نـەدەدیت بـەلاّم تـەواوی قسـەکان و هـەتا خشەخشـی جلکەکانیشـیان دەبیست.ئاناسـرگیۆناو بـازارۆف ڕێـك لەبـەردەم بالّەخانەکـە ڕاوەستان.ئاناسرگیۆنا گوتی:

- دیتت هەردووکمان بەهەلّەچووین.ئیدی تەمەنی ئێمـە تێپـەڕیوە، بەتایبـەتی من.ئێمـە ژیانی خۆمان کردوو ماندووبووین.پێویستیش بەوە ناکا بەلاّم دەبیّ بلّێن ئێمە ژیرترین.سەرەتا ئێمە بۆلای یەك کێشراین چونکە کونجکاوی هانی دەداین، بەلاّم دواتر...

بازارف بەپەلە گوتی:

- منیش کۆن بووم.

- بۆخۆت باشدەزانی کە هۆکـاری جیابوونـەوەمان ئـەوە نـەبووە.هۆکاری سـەرەکی ئێمـە ئەوەبوو کە ئیدی پێویستیمان بە یەکترنییە.ئێمە، چۆن بلّێم...وەکو یەك دەچـووین و لـەکاتی خۆیدا نەمانتوانی دەرك بەو بابەتەبکەین.ڕێك بەپێچەوانەی ئارکادی...

بازارۆف پرسی:

- تۆ پێویستیت بە ئەوهەیە؟

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ کۆتایی پێبێنە.تۆ دەڵێی کە سەرنجێکی تایبەتی بەرامبەرمن هەبووە...ئەگەر ڕاستیت دەوێ منیش پێموابوو کە خۆشیدەوێم.دەزانم من لەجێگای پووری ئەوم بەلاّم چت لێوەشێرم لەو دواییانەدا بیرم زیاتر لەلای ئەوە.لەو گەنجەدا هەستی لاوەتی و نەرم و نیانییەکی تایبەت...

بازارۆف بە دەنگێکی ئارام و لە هەمان کاتدا زبر قسەکانی پێبڕی و گوتی:

- لەکاتێکی وادا دەبێ دەستەواژەی هەڵخەڵەتێنەر بەکار بێنی...ئارکادی دوێ شەو نەباسێکی تۆ و نەباسی خوشکەکەتی نە هێناگۆڕێ ئەوەش نیشانەیەکی گرنگە.

- ئەو و کاتیا پەیوەندیەکی خوشك و برایانەیان هەیە ئەوەش هەمان شتە کە لەودا پەسەندی دەکەم.ئەگەرچی دەبوایە ڕێگام بەوان نەدابا هێندە لێك نزیك ببنەوە.

بازارۆف کەمێك وەستاو گوتی:

- ئەوە هەستی خوشکانەی تۆیە وادەڵێ.

- بێگومان...بەلاّم ئێمە بۆ لێرە وەستاوین؟ واباشە بڕۆین.باسی چ شتێکی سەیردەکەین؟ قەت بیرت لەوە دەکردەوە ئەو جۆرە قسانە بکەین؟ بۆخۆت ئەوە باشتردەزانی من لەتۆ دەترسم...لەهەمان کاتیشدا بڕوام بەتۆیە چونکە تۆ کەسێکی زۆر میهرەبانی.

- یەکەم من هەرگیز میهرەبان نیم دووەمیش ئەوەیە کە هیچ گرنگیەکم بۆتۆ نییە...ئەو میهرەبانیەی تۆ دەیلێی وەك ئەوە وایە تا جەگوڵێك بخەیتە سەری مردوویەك.

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ ئێمە هێزی ئەوەمان نییە کە...

بەلاّم وژەوژی باو خشەخشی گەلاّکان نەیهێشت لەیەك بگەن.دوای کەمێك دەنگی بازارف هات کە دەیگوت:

- تۆ بە تەواوی ئازادی.

دوای ئەوە هیچی دیکە نەبیسترا.هەنگاوەکان دوور کەوتنەوەو دووبارە بێدەنگی باڵی کێشا.

ئارکادی گەڕایەوە لای کاتیاو کاتیاش سەری نەویکردبوو.ئارکادی دەستەکانی ڕێککگوشین و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- کاترینا سرگیۆنا، مـن تـا هەتایـە تـەنیا تـۆم خۆشدەوێ.دەمویسـت ئـەوەت پێبڵـێم، وەڵامەکەت ببیستم و خوازبێنیـت بکـەم.هیچ سـامانێکم نییـە بـەڵام ئامـادەم بـۆ هـەموو فیداکاریەك.جوابم نا دەیتەوە؟ براوام پێناکەی؟ پێتوایە قسەکانی مـن تـەنیا لـە ڕووی هـەواو هەوەسەوەیە؟ هەڵسوکوتی ئەوچەند ڕۆژەی من بێنەوە بەرچاوی خۆت.باوەڕبکـە ڕابـردووم بـە تەواوی لەیاد کردووە.تکات لێدەکەم سەیرم کەو وەڵامم بدەوە.خۆشمدەوێی، بەخودا خۆشمدەوێی باوەڕبکە...

کاتیا نیگایەکی پڕمانای لە ئارکادی کردوو گوتی:

- بەڵێ.

ئارکادی لەسەر نیوتەختەکە تەکانێکی داو هاواریکرد:

- کاترینا سرگیۆنا، گوتت بەڵێ.مانای ئەو قسـەیە چـییە؟...باوەڕ بـە قسـەکانم دەکـەی یان...یان...زۆر دەترسم قسەکەم تەواوبکەم.

کاتیا دووبارەی کردەوە:

- بەڵێ.

ئەو جار ئارکادی لە مانای ئەو وشەیە گەیشت.دەسـتە خەپەتۆڵـەو جوانـەکانی لەدەسـت گرتن.لەخۆشیان خەریکبوو بێهۆش بێ.دەستەکانی کاتیای لەسەردڵی خۆیداناو گوشی.ئارکادی بەزۆر خۆی بەپێوە ڕادەگرت و لێکدا لێکدا دەیگوت:

- کاتیا...کاتیا...

فرمێسکی ڕوون و پاك لە چاوەکانی کاتیاوە هەڵڕژان.تەنانەت بۆ خۆیشی پێکـەنینی بـەو گریانە دەهات.کەسێك ئەو فرمێسکانەی لە چـاوی خۆشەویسـتەکەیدا نـەدیبێ نـاتوانێ دەرك بەوە بکا کە تاچ ئەندازەیەك دووچاری شڵەژان دەبێ و تا چ ڕادەیـەك خـۆی بـە خۆشـبەخت دەزانێ.

❊ ❊ ❊

بەیانیەکەی، ئاناسرگیۆنا فەرمانیدا تا بازارۆف بانگ بکەنە ژوورەکەی بە خەندەیەکی زۆر لەخۆکردن کاغەزێکی نووشتاوەی نیشاندا کە ئارکادی داوای خوازبێنی کاتیای کردبوو.بازارۆف بەپەلە کاغەزەکەی خوێندەوە بۆئەوەی ڕقەکەی بشارێتەوە گوتی:

- ئاوا! هەر دوێنیٚ دەتگوت ئەوانە وەك خوشك و بران.ئێستا دەتەویٚ چی بکەی؟

ئاناسرگیۆنا کە هێشتا خەندەکەی لەسەرلێوان بوو گوتی:

- تۆ دەتوانی چ پێشنیارێك بکەی؟

بازارۆفیش خەندەیەکی وەك ئانای هاتیٚ و وەلاٚمی دایەوە:

- پێموایە...بەلٚیٚ، پێموایە دەبیٚ داخوازیەکەیان قبولٚ بکەی و پیرۆزباییان لێبکەی.ئەو هاوسەرگیریە لە هەرلایەك سەیری بکەی گونجاوە.کیرسانۆف دەولٚەمەندەو ئارکادیش تاقە کوڕیەتی.جگەلەوەش پیرەمێردیش دژی ئەو زەماوەندە نابیٚ.

- تۆ پێتوایە؟ منیش هیچ بەلٚگەیەك بۆ دژایەتی ئەو کارە نابینمەوە.بۆ کاتیاش داوای سەرکەوتن و بەختەوەری دەکەم...هەروا بۆ ئارکادیش.بێگومان چاوەڕوانی وەلاٚمی باوکی ئارکادی دەکەم.ئارکادیش دەنێرم وەلاٚمەکەم بۆ بێنێتەوە.سەیرکە کاتێك دەلٚێم ئێمە گەنج نین قسەی منە.چۆن شتێکی لەو جۆرەم نەدەدیت؟ پێم سەیرە.

ئاناسرگیۆنا پێکەنی بەلاٚم دەستبەجیٚ ڕووی وەرگێڕا.بازارۆفیش بزەیەکی هاتیٚ و گوتی:

- گەنجەکانی ئەمڕۆ زۆر فێلٚبازن!

پاش وەستانێك درێژەیدایە:

- زۆرباشە، خوداحافیز. من دەڕۆم و لە دوورەوە هیوای بەختەوەریان بۆ دەخوازم.

ئادینسۆڤا بەپەلە وەلاٚمی بازارۆفی دایەوەو گوتی:

- تۆ دەڕۆی؟ بۆچی...ئێستا حەزدەکەم وەمێنی...گفتوگۆکردن لەگەلٚ تۆدا خۆشە...ڕێك وەك ئەوەی مرۆڤ لەپەنا هەلٚدێرێکدا پیاسەبکا .سەرەتا دەترسیٚ بەلاٚم بەرەبەرە بەغیرەت دەبیٚ.وەمێنە.

- ئاناسرگیۆنا سوپاسی داوەتەکەتان دەکەم.لەوەش کە منت بە شیاوی هاودەمی خۆت دەزانی دووبارە سوپاست دەکەم.بەلاٚم پێموایە لە ژینگەیەکدا کە بۆم نامۆیە زۆر ماومەتەوە.ماسیەبالٚدارەکان ئەگەرچی دەشفڕن بەلاٚم ناچارن بۆ درێژەدان بەژیان بگەڕێنەوە ناو ئاو.ئیزن بفەرموون تا بگەڕێمەوە ژینگەی سروشتی خۆم.

ئادینسۆڤا سەیرێکی بازارۆفی کردو لە کاتێکدا بزەیەکی تاڵی هاتێ لەبەرخۆیەوە بیریکردەوە:

- ئەوەش منی خۆشدەویست.

دڵی بەحاڵی بازارۆف سووتا دەستی بۆلای درێژکرد.بەڵام بازارۆف نەیتوانی لە مەبەستی بگات.هەنگاوێك کشایەوەو گوتی:

- نا، من هەژارنیم کە سەدەقە قبوڵ بکەم.خودا ئاگادارت بێ و سەرکەوتووبی.

ئاناسرگیۆنا لەخۆڕا جوڵەیەکی کردو گوتی:

- بەڵام ئەوە بۆ دواجارنییە ئێمە یەکتری دەبینینەوە.

- لە دنیا زۆرشت ڕوودەدەن.

بازارۆف ئەو قسەی کرد، ئیکلامێکی کێشاو وەدەرکەوت.

* * *

هەمان ڕۆژ کە بازارۆف خەریکی بەستنی جانتاکەی بوو بە ئارکادی گوت:

- تۆ بڕیارتداوە ماڵێك پێکەوەنێی؟ نەك تەنیا خراپ نییە بەڵکو کارێکی زۆرباشە.بەڵام پێویستی بەو هەموو ڕۆڵ گێڕانە نەبوو.من چاوەڕوانیم لەتۆ هەبوو ڕەنگە تۆش سەرەتا فکرێکی وات نەبووبێ؟

- بەڵێ، کاتێك لەتۆ جیابوومەوە هیچ بیرم لەوشتانە نەدەکردەوە.بەڵام تۆش بۆچی ڕۆڵ دەگێڕی و دەڵێی کارێکی زۆرباشت کرد.بۆچما من بڕوای تۆ دەربارەی هاوسەرگیری نازانم؟

- ئەوەچ قسەیەکە دەیکەی ئەزیزم؟ سەیرکە چی دەکەم: لە جانتاکەمدا شوێنێکی بەتاڵی تێدابوو بە کا پڕمکردۆتەوە.هەتا جانتای مرۆڤیش دەبێ پڕبکرێتەوە تا بەتاڵایی تێدا نەمێنێتەوە.تکات لێدەکەم نیگەران مەبە.خۆت زۆر باشدەزانی ڕای من دەبارەی کاترینا سرگیۆنا چۆن بووە.زۆر لەکیژان تەنیا لەبەرخاتری بزەیەك کە لەسەر لێویانە بە زیرەکی بەناوبانگ دەبن.بەڵام ئەوەی تۆ بۆ دەست کەوتنی مافی خۆی ڕادەوەستێ و خەبات دەکات.وا ڕادەوەستێ کە دەتوانێ یارمەتی تۆش بدات.لەوەش زیاتر چاوەڕوانی لێ ناکرێ.

بازارۆف دوای داخستنی جانتاکەی لەجێی خۆی هەستاو درێژەیدایە:

- ئێستاماڵئاوایی دەکەین...چ پێویست دەکا یەکتری فریوبدەین، چونکە بۆخۆشت دەزانی کە ئەوە دوا ماڵئاواییە.تۆ کارێکی ژیرانەتکرد.تۆ بۆ ژیانی تاڵ و خەمناك یانی ژیانی تەنیایی درووست نەکراوی.لە ناخی تۆدا نە ئەو شەهامەتەی پێویست هەیەو نە ئەو ڕقەش.لە تۆدا ئەگەر بوێرییەك هەبێ بوێری گەنجێتییەو ئەوەش هیچ بەکەڵکی ئێمەنایە.ئێوەی خانەدانان پیاوانە تەسلیم دەبن و پیاوانەش وەکلۆکۆ دێن بەلاّم کارێکی هێندە گرنگ تان لەدەست نایە...ئەوەش بەهایەکی ئەوتۆی نییە.بۆنمونە تۆ لەشەڕکردن ڕادەکەی بەلاّم لەهەمان کاتدا هیچ کەسێك لەخۆت بە ئازاتر نازانی.بەلاّم بەپێچەوانە ویستمان شەڕبکەین.ڕەنگە بزانی و لەوە تێبگەی کە مانەوەت لەگەڵ ئێمە لە جەنگێکدا کە دەیکەین تەنیا چاوەکانی تۆ لە ئەنجامی تەپوتۆزەکەدا کوێر دەکا...لەنێوان ئێمەو تۆدا مەودایەکی زۆرهەیە.تۆ بێئەوەی بزانی خۆت خۆشدەوێ.تۆ لە جنێودان بەخۆت چێژوەردەگری بەلاّم ئێمە لەو کارە بێزارین.ئێمە پێویستمان بەکەسانی دیکەهەیە.کەسانێك کە بتوانن بشکێنن.تۆ توانای شکاندنت نییە.تۆ تەنیا مرۆڤێکی باشی،ئەوەندەوبەس.

ئارکادی بە ڕاوێژێکی خەمناك گوتی:

- تۆ بۆ هەتایە ماڵئاوایی دەکەی؟ئایا قسەیەکی دیکەت نییە پێم بڵێی؟

بازارۆف سەری خوراندو گوتی:

- قسەیەکم هەیە بەلاّم نایلێم.چونکە ئەویش قسەیەکی هەستیاریە...بەهەرحاڵ با لەوەگەڕێین.تۆ هەرچی زووترە ماڵەکەت پێکەوە بنێ و تا دەتوانی منداڵ درووستبکە.هەرچۆنێك بێ ئەوان باشترو ئاقڵتردەبن لە ئێمە چونکە لە دەورانێکی باشتردا دەژین...دەڵێی ئەسپەکان ئامادەن.دەبێ وەڕێکەوین.ماڵئاوایم لە هەموان کردووە...باشە،چۆنە یەکتری ماچ بکەین؟

ئارکادی دەستی لەملی هاوڕێ و مامۆستای پێشووی خۆی وەرێناو گریا.بازارۆف لەسەرخۆ گوتی:

- ئەوەش هەستێکی گەنجانەیە.بەلاّم ئومێدم بە کاترینا سرگیۆنایە ئەو دڵت دەداتەوە.ماڵئاوا براله.

بازارۆف ئەو قسەیەی کردو سواری گالیسکەکەی بوو.دوای ئەوە ئاماژەی بۆ ئەو دوو قەلەڕەشەیەکرد کە لەسەربانی تەویلەکە هەڵنستبوون و گوتی:

- لەوانە فێربە.

ئارکادی پرسی:

- مەبەستت چییە؟

- چۆن؟ بۆچما تۆ مێژووی سرووشتت نەخوێندۆتەوە یان لەبیرت چۆتەوە؟ بۆ مەگەر نازانی کــە قەلەڕەشــەکان نــەجیب تــرین و ڕەســەنترین خێــزان درووســتدەکەن.فێربە هــاوڕێی ئازیز...ماڵئاوا..

گالیسکە دەنگێکی لێهات و ڕۆیشت.

*　*　*

بازارۆف هەقی بوو.شەوێ کاتێك ئارکادی قسەی لەگەڵ کاتیا دەکرد ئیدی بازارۆفی لــەبیر چووبۆوە ئارکادی بەشێوەیەکی واهەڵسوکەوتی دەکرد کە کاتیا حەزی لێبوو کاتیــاش ئــەوەی دەزانی و پێی سەیرنەبوو.قەرار وابوو کە ئارکادی بەیانی بگەڕێتەوە گوندەکەی باوکی.

ئەگەرچی ئانا نیازی ئازاردانی ئەو دوو دەستگیرانەی نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەر بۆ ڕواڵەت ئەوانەی زیاد بەجێ نەدەهێشت.ئانا بەگەورەیی خۆی کە شازادەخانم لە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر خەمگین و نیگەان ببوو لێی دوورخستبوونەوە.سەرەتا ئاناسرگیۆنا لەوە دەترسا کە لەبینینی خۆشبەختی و کامەرانی گەنجەکان نیگران بێ بەلاّم بەپێچــەوانەی بۆچوونەکەی،تەماشــاکردنی ئەو دیمەنە نەك ئازاردەر نەبوو بەڵکو خۆشحاڵیشی کرد.ئاناسرگیۆنا هــەم خــەمگین بــوو هــەم دڵشاد.لەبەرخۆیەوە گوتی:

- بازارۆف هەقی بوو کە دەیگوت کونجکاوی و عەشق بە هێمنــی و خۆپەرســتی تــەواوی وجودی منی پڕکردووە.

پاشان بەدەنگێکی بەرز پرسی:

- گەنجەکان بەڕای ئێوە عەشق سرووشتیە یان دەستکردە؟

نە ئارکادی و نە کاتیا، هیچیان لە مەبەستەکەی نەگەیشتن.ئەوان لە ئاناسرگیۆنا دەترسان و ئەو قسانەی لەویان دەبیست نەیاندەتوانی سەری لێدەربکەن.ئاناسرگیۆنا بــەجێی هێشــتن و ئەو کارەشی بەوپەڕی ئارەزووەوە ئەنجامدا.

## (٢٧)

بازارۆفەپیرەکان لە هاتنەوەی گەنجەکەیان کە هیچ چاوەڕوانیان نەدەکرد لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوون.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ هاوسەرەپیرەکەی کە بەپەلە وا دەهات و وا دەچوو بە کەوی دەچواند لە ڕاستیشدا شاقەلی چاکەتە کورتەکەی پیرێژن ئەوی بەو باڵندەیە دەچواند.پیرەمێردیش تەنیا ئاخی هەڵدەکێشاو لێوی سەبیلە نەخشێنراوەکەی بە ددان گرتبوو بەپەنجەکانی گەردنی خۆی دەگرت و سەری ڕادەوەشاند.دەتگوت دەیەوێ بزانێ سەری هێشتا لەجێی خۆی ماوە یان نا.هەندێجاریش لەناکاو دەمی قژ دەکردو پێدەکەنی.

بازارۆف پێیگوت:

- ئاغا، من بۆ ماوەی شەش هەفتە هاتوومەوە ئێرەو نیازم وایە بەردەوام کاربکەم و تکام وایە سەرقاڵم نەکەی.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ خێرا دڵنیای کردەوە:

- کارێکی وادەکەم کە وابزانی هەرنیم.

پیرەمێرد قسەی خۆی بەجێ کەیاند.وەکوپێشوو ژوورەکەی خۆی بۆ کوڕەکەی بە جێهێشت و تا ئەوەندەی دەیتوانی نەدەچوە لای و داواشی لە پیرەژن کرد تاخۆی لە هەستەکانی بە دوور بگرێ و پاشان گوتی:

- لە سەفەری پێشوودا، کەمێك نارەحەتمان کرد ئێستا دەبێ زیاتر ئاگاداربین.

ئاریناڤلاسۆنا قسەکانی مێردەکەی قبوڵ کرد بەلاّم دیتنی جگەرگۆشە تەنیا لە سەرسفرە نیگەرانی دەکرد.هەندێجار کە حەزی دەکرد لەگەڵ کوڕەکەی قسەبکا بانگی دەکرد بەلاّم هەرکە بازارۆف ڕووی وەردەگێڕا، پیرەژن یاری بە ڕیشووی کیسەباخەڵەکەی دەکرو بە هەراسانییەوە دەیگوت:

- هیچ، هیچم نەدەویست.

هەر کاتێکیش لەگەڵ مێردەکەی بەتەنێ دەمانەوە وەقسە دەهات و دەیگوت:

- چۆن بزانم کە کوڕەکەم ئەوڕۆ بۆ نیوەڕۆیە حەزی لەچییە؟

- بۆ لەخۆیت نەپرسی؟

- ترسام نیگەرانی بکەم.

بازارۆف هەرزوو لەو گۆشەگیریە هاتەدەر. عەشقی کارکردن لە دڵی هاتەدەرو لـە جێگـای ئەو پەرێشانی دایگرت.هەموو جوڵەیەکی نیشانەی ماندوێتی بوو.تەنانەت هەنگاوە کانیشـی ئازایانەوپتەو هەڵنەدە هێناوە.لەو گەڕانە دوورو درێژانەی بەتەنیٚ وازی هێنابوو لەگـەڵ ئـەم و ئەو دەکەوتە گفتوگۆکردن.چای ئێوارانی لە هۆڵی پێشوازیدا دەخواردەوەو لەگەڵ بـابی دەچـوە مەرەزە جاڕەکەو بە بێدەنگی سەبیلەی دەکێشـاو تەنانـەت جـارێکیش لـە ئـەحواڵی قەشـەی پرسی.

سەرەتا ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەو گۆڕانەی کوڕەکەی خۆشحاڵ بوو بەلاٌم ئـەو خۆشـحاڵیە زۆر درێژەی نەکێشا.ڕۆژێك لەلای ژنەکەی ڕازی خۆی بەیان کرد:

- کوڕەکەم شێواو و پەرێشانە.ناڵێم تووڕەیە ئەگـەروابا گـرنگ نـەبوو بـەلاٌم بەداخـەوە نیگەرانە...زۆربـــەی کاتـــەکان بێدەنگە.خۆزگـــە جارێـــك لـــە جـــاران هەرایـــەکی لەگـــەڵ دەکردین...ئێستا ڕۆژ بە ڕۆژ کزتر دەبیٚ.ڕەنگی ڕووخساری زۆر تێکچووە.

پیرەژنیش گوتی:

- ڕەنگە واباشبیٚ دووعایەکی بەملیەوە هەڵواسین...بەلاٌم ئەو ڕێگای ئەو شتانە نادا.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ چەندجارێك ویستی لە کارەکەی بازارۆف و لە هاوڕێیەتی ئەو و ئارکادی و ...سەر لەشتێك دەربکا بـەلاٌم هـەمووجاریٚ ڕووبـەوڕووی بـیٚ مـەیلی کوڕەکـەی دەبـۆوە تەنانەت جارێك کە لە مەبەستی باوکی تێگەیشت گوتی:

- بۆچی هێندە بەبیٚ هەستی بە دەوروو بەری مندا دێی و دەچی؟ ئەوە لـە هەڵسـووکەوتی جارانت خراپترە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچی بێچارە دەستبەجیٚ خۆی کۆکردەوەو گوتی:

- ببوورە...لەوە بەدوا ئەزیەتت نادەم.

تەنانـەت بۆچـوونەکانی ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ سـەبارەت بـە بابـەتی سیاسـی بەهەنـد وەرنـەدەگیران.ڕۆژێك بـەهیوای ڕاکێشـانی سـەرنج و هاوخـەمی بـازارۆف باسـی ئـازادی ڕەعیەتەکانی کرد،کوڕەکەشی بەوپەڕی بیٚ مووبالاتیەوە گوتی:

- دویٚ شەو بەتەنیشت  دیواری باخەکەدا تێدەپەڕیم گوێم لێبوو کوڕگەلی ئاوایی لەجیاتی خوێندنەوەی شیعری کۆن شیعری تـازە دەخوێننـەوە: ( دەورو زەمـانێکی سـەیرە.دڵم هەسـت بەعەشق دەکات) ئەوەش پێشکەوتنێك کە تۆ دەتگوت؟

هەندێجار بازارۆف  دەچووە ئاوایی و لەگەڵ جوتیارەکان دەدواو قسەی خۆشی دەکرد:

- باشـەبرالە، تـۆ دەربـارەی ژیـان ڕات چـییە؟ دەڵـێن بنیـات نـەرانی ڕووسـیەی نـویٚ جوتیارەکانن.تەواوی هێزی ئەو ولاٚتەش ئێوەن.دەڵێن ئێوە بۆ ئێمە یاساو زمانێکی پاراو دێنن.

جوتیارەکان  یان وەلاٚمیان نەدەدایەوە  یان بەوەندە لێدەگەڕان.

- بەلٚیٚ،...ئێمە لە تواناماندا هەیە ئەو کارەبکەین...ئایندەی جێگر...

بەلاٚم بازارۆف  قسەکانی پێدەبڕین و دەیگوت:

- تۆ بەڕاست پێمبلٚیٚ دنیا یانی چی؟...دنیا لەسەرچ شـتێك ڕاوەستاوە؟...لەسـەر پشـتی سیٚ ماسی؟

کابرای جوتیار بەڕاوێژێکی باوکانەوە  دەیگوت:

- بەلٚیٚ، کوڕم دنیا لەسەرپشتی سیٚ ماسی ڕاوەستاوە بەلاٚم  لەسەرووی  هەمـوو شـتێکەوە خودایە...تۆ لەجێگای باوکی ئێمەی...هەرچـەندە ئاغـا تونـدوو تیـژتربیٚ  ڕەعیـەت  زیـاتر خۆشیدەوێت.

ڕۆژێك بازارۆف لە بیستنی ئەو قسانە هەستی بـە بێزاریکرد.شـانێکی هەڵتەکانـدو ڕووی وەرگێڕا.کابرای دێهاتیش بەڕێی خۆیداڕۆیشت.کابرایەکی دێهاتی کە ئاگاداری ئـەو گفتوگۆیـە بوو لە کابرای ڕەعیەتی پرسی:

- چییە سەرانەت دواکەوتووە؟نا، ئەو تەنیا شتێکی گوت تا بلٚێن قسەی کردووە.ئاغاکـان هەروان.هیچ وەرناگرن.

کابرای دێهاتی پیر قسەکانی پەسەندکرد:

- بەلٚیٚ، ئاغاکان لەهیچ  تێناگەن.

پاشان هەردووکیان کلاٚوەکانیان ڕاوەشاند، پشتێنە کانیـان توونـدکردوو دەربـارەی بـاس و خواسی ڕۆژ دوان.ئەفسوس کە بازارۆف،هەرکە بە تووڕەیی شانی هەڵتەکانـد ئەگەرچـی خـۆی بڕوای وابوو کە لەگەڵ جوتیارەکاندا دەتوانیٚ  وتووێژبکا، بەلاٚم لەڕوانگەی ئەوانەوە لە داوەلٚێك زیاتر نەبوو بۆ خۆیشی ئەوەی نەدەزانی.

بەکورتی بازارۆف سەرگەرمییەکی بۆخۆی پەیداکردبوو.ڕۆژێك باوکی خەریکی تیمارکردنی برینی پێی پیاوێك بوو بەلاّم دەستی دەلەرزین و نەیدەتوانی کارەکەی باش ئەنجام بدات بازارۆف یارمەتیداو لەهەمان ڕۆژەوە بووەهاوکاری.بەلاّم لەهەمان کاتدا هەم ئەو دەرمانانەی بۆخۆی دەیدانێ و هەم ئەو دەرمانانەی کە باوکی دەیدان بە نەخۆشەکان گاڵتەی پێدەکردن بەلاّم باوکی لەو گاڵتە پێکردنە نەدەڕەنجا.ڕەنگە ئەو پێکەنینەی کوڕەکەی تەسکینێك بووبێ بۆ باوکی.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەزۆری ئەو کاتانەی سەبیلەی دەکێشا بە شەوق و زەوقەوە گوێی لە قسەکانی بازارۆف ڕادەگرت.هەر کاتێك کوڕەکەی زیاتر بە تیروتوانج قسەی دەکرد باوکە زیاتر چێژی وەردەگرت و پێدەکەنی، وا پێدەکەنی کە تەواوی ددانە ڕەشەکانی دەردەکەوتن.لە هەرجێگایەك دادەنیشت تانەو تەشەرەکانی بازارۆفی دووپات دەکردنەوە بۆنمونە دەیگوت:

- ئەو کارە لەپلەی نۆیەم دایە.

ڕۆژێك کە باوکی دەچوو بۆنوێژ کوڕەکەی ئەو قسەیەی کردبوو.بازارۆفی پیر خۆشحاڵ لە تانەکانی کوڕەکەی بە گوێی هاوسەرەکەیدا دەچرپاند:

- هەزارجار شوکر بۆخوا کە لەوخەمۆکییەی پێشێ هاتۆتەدەر.ئەمڕۆ یارمەتییەکی گەورەی لەگەڵ کردم.

لەدەست کەوتنی یارمەتی دەرێکی وا خۆشحاڵ و غرووربوو.کاتێك ئاوی کانزایی کە لە قووتوویەکی سپیدابوو دەیدایە دەستی پیرەژنێك کە کۆنەچاکەتێکی مێردەکەی لەبەر دابوو گوتی:

- دەبێ شوکری خودای بکەی کە کوڕەکەم میوانمە.ئەو بەپێشکەوتووترین شێوازەکانی زانستی چارەسەرت دەکا.تەنانەت ناپلیۆن ئیمپراتۆری فەرەنسەش دکتۆرێکی واباشی نەبووە.

پیرەژن کە نەیدەتوانی وشەی مالاریا بەباشی دەربڕێ چەند جارێك ئیکلامی کێشاو هەوڵیدا تا پرێسکەکەی بن هەنگڵی دەربێنێ کە چەند دانەهێلکە مریشکی تێدابوون.

ڕۆژێك بازارۆف ددانی وردەواڵە فرۆشێکی کێشا لەگەڵ ئەوەی ئەو ددانەجیاوازی لەگەڵ ددانەکانی دیکەدا نەبوو ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ ئەوی وەکو یادگارێك هەڵگرت و نیشانی باوکی ئالکسی داو گوتی:

- ڕیشەی ئەو ددانەی دەبینی.یۆگینی بۆ هەڵکێشانی زۆری پێوە ماندووبوو.زۆرقایم بوو.وردەواڵە فرۆش دەرپەڕی...پێموایە کابرا ئەگەر کێویش با هەڵدەقەنا.

باوکی ئالکسی کە نەیدەزانی چۆن خۆی لەدەست ئەوپیرەمێردە سەرمەستە نەجاتبدا گوتی:
- هەی ئافەرین...بەڕاستی شایانی باسکردنە.

*　　*　　*

ڕۆژێك دێهاتییەکی گوندێکی نزیکیان براکەی کە نەخۆشی گرانەتای بوو هێنای بۆلای ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ.لەشی نەخۆشەکە پڕبوو لەپەڵەی ڕەش ماوەیەك لەسەر گیا ڕاکشاو چاوەڕوانی مردنی دەکرد.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەداخبوو کە بۆچی زووتر نەیان بردۆتە لای دکتۆرو ئێستاش کارلەکار ترازاوەو هیچ ئومێدێك نییە.ڕاستیدەکرد چونکە کابرای دێهاتی نەیتوانی براکەی بگەیەنێتەوە ماڵێ و نەخۆشەکە لە ڕێگامرد.دوای سێ ڕۆژان بازارۆف چووەلای باوکی و پرسی:
- دەرمانی نۆشاترت هەیە؟
- بەڵێ، هەمە بۆچیتە؟
- پێویستمە...برینێکی بچوکە دەبێ بیسووتێنم.
- برینی کێ؟
- برینی خۆم.
- خۆت؟ چ برینێك؟ کوا؟
- ئێرە.برینی ئەنگوستم.ئەمڕۆ چوومە گوندێکی نزیکمان.بۆ هەمان شوێنی کە نەخۆشەکەیان بردێ.بەوپێیەی کە دەیانویست نەخۆشەکە توێکاری بکەن و منیش ماوەیەکبوو تاقیکردنەوەم نەکردبوو.
- دەی؟
- ئەوکاتە داوام لە پزیشکەکەی ئەوان کرد ڕێگابدەن ئەو کارەمن ئەنجامی بدەم...لەو کاتەدا دەستی خۆم بڕی.
ڕووخساری ئیڤانۆڤیچ سپی هەڵگەڕا.بەپڕتاو بەرەو ژووری کارەکەی ڕۆیشت.نۆشاتری هێنا.بازارۆف ویستی نۆشاترەکە وەربگرێ بەڵام باوکی گوتی:
- توخوا لێمگەڕێ بامن ئەو کارەبکەم.
بازارۆف بزەیەکی هاتێ و گوتی:

- دەڵێی سووتاندنی خەڵکت پێخۆشە.

- تکات لێدەکەم گاڵتەمەکە.پەنجەکەتم نیشانبدە.برینێکی زۆرنییە.دێشێ؟

- مەترسە.زیاتر ڕایگوشە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کەمێك خۆی گنخاندو پاشان گوتی:

- یۆگینی، بەڕای تۆ ئەگەر بەئاسن بیسووتێنین باشترنییە؟

- دەبوایە زووتر ئەو کارەم کردبایە.ئێستا ئەگەر ڕاستیت دەوێ نۆشاتریش بەکەڵك نایە.ئەگەر تووش بووبم کارلەکارترازاوە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەزەحمەت دەیتوانی قسەبکا:

- چۆن؟...کارلەکار ترازاوە؟..

- لەو کاتەوە تا ئێستا چوار کاتژمێر تێپەڕیوە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ دووبارە برینەکەی داخکردوو پرسی:

- بۆچما پزیشکی ئەوێ دەرمانی نۆشاتری پێنەبوو؟

- نا.

- خوایەگیان چۆندەکرێ دکتۆربی و دەرمانی نۆشاترت پێ نەبێ.

بازارۆف گوتی:

- خۆزگە کەل و پەلی کارەکەت دەدی.

لەژووری چۆدەرەوە.

ئەو ڕۆژەو ڕۆژانی دواتریش ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەبیانووی جۆراوجۆر دەهاتە ژووری کوڕەکەی هەرچەندە باسی برینەکەی نەدەکرد لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی واسەیری دەکردو بەجۆرێك چاودێری دەکرد کە سەرەنجام بازارۆف حەوسەلەی نەماو هەڕەشەی لێکرد ناهێڵێ بێتە ژوورەکەی.

لەلایەکی دیکەشەوە ئارینافلاسۆنا بەردەوام لەمێردەکەی دەپرسی کەبۆ نان ناخوات و بۆ ناخەوێ.پیرەمێرد لەو بارەیەوە هیچی پێنەگوتبوو.دووڕۆژان پیرەمێرد دانی بەخۆیداگرت و هیچی لێ نەپرسی.هەرچەندە ڕووخساری بازارۆف ببووە مایەی خەم و پەژارەی...سەرەنجام ڕۆژی سێیەم پیرەمێرد توانای نەما.بازارۆف سەری بەردابۆوەو هیچی نەدەخوارد.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لە کاتێکدا هەوڵیدەداخۆی وانیشانبدا کە ئاساییە گوتی:

- یۆگینی، بۆ هیچ ناخۆی؟ دەڵێی خواردنەکە باش نەکولاوە؟
- ئیشتیام نییە؟
پاشان بەدەنگێکی لەرزۆك گوتی:
- سەریشت دێشێ؟
- بەڵێ، لەبەرچی وادەڵێی؟
ئاریناڤلاسۆنا خۆی ڕاستکردەوەو گوێ قولاخ بوو.پیرەمێرد گوتی:
- یۆگینی تکات لێدەکەم تووڕەمەبە.دەکرێ نەبزی دەستت بگرم؟
بازارۆف هەستاو گوتی:
- پێویست بە نەبزگرتن نییە.بێئەوە دەتوانم بڵێم تام لێیە.
- تا و لەرز؟
- بەڵێ، تا و لەرز.من دەڕۆم دەنووم.تۆش هەندێ گوڵی گاوزمانم بۆ بێنە.ڕەنگە سەرمام بووبێ.
دایکە سەری ڕاوەشاندو گوتی:
- لەخۆڕانەبوو کە دوێ شەو دەکۆکی.
- بەڵێ، حەتمەن سەرمام بووە.
بازارۆف دوای ئەو قسانە لە ژوور هاتە دەرەوە.ئاریناڤلاسۆنا خەریکی ئامادەکردنی گوڵی گاوزمان بوو بەلاّم ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ چوەژوورێکی دیکەو سەری لەناو دەستەکانی گرت.بازارۆف ئەو ڕۆژە لەناو جێگاکەی نەهاتەدەرو هەرنووستبوو.بازارۆف کاتژمێر یەکی بەیانی بەدژواری چاوی هەڵێناو لە تاریك و بوولێڵدا باوکی بەسەر سەری خۆیەوەبینی.فەرمانی پێدا بڕواو پیرەمێردیش مل کەچ بوو.بەلاّم دوای ماوەیەك بەلاژەلاژ گەڕایەوەو لەودیو گەنجینەکەوە سەیری کوڕەکەی دەکرد.ئاریناڤلاسۆناش نەخەوتبوو ناوەناوە لەلای دەرگای مێردەکەیەوە دەیڕوانی و هەناسەکانی کوڕەکەی دەژمارد.نەیدەدیت کە مێردەکەی خەریکی چ کارێکە بەلاّم پشتەچەماوەکەی ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بۆوی نیشانەی سێبووری بوو.
بازارۆف بەیانی زوو لەخەوهەستاو هەوڵیدا لەناو جێگاکەی بێتەدەر بەلاّم سەری لە گێژەوەهات و خوێنی لوتی ڕاسا ناچاربوو دووبارە درێژبێتەوە.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ چوکترین

سەروسـەدای نـەدەهات و چـاودێری دەکرد.ئاریناڤلاسـۆنا هاتـە ژووری کوڕەکـەی و ئـەحواڵ پرسیکرد.بازارۆف بەکورتی گوتی:

- باشترم.

ڕووی بەرەو لای دیواری وەرگێڕا.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەدەست ئیشارەی بۆ ژنەکـەی کـردو ئاریناڤلاسۆناش لەحاڵێکدا لێوی دەکرۆشت تا دەنگی گریانەکـەی نەبیستێ،چـووەدەر.ماڵەکە کپ و بێدەنگ بوو.ڕووخسارەکان خەمناك بوون.بێدەنگی هەمووجێگایەکی داگرتبوو.تەنانـەت ئەو کەڵەشێرەی کەدایم دەیخوێندو بەحەوشەکەدا دەگەڕا بردبوویانە ناودێ.کەڵەشـێری بێچـارە نەیدەزانی چ تاوانێکی کردووە.

بازارۆف هـەروا ڕووی لەدیواربوو.ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ پرسـیاری جۆراوجـۆری کـرد بـەڵام بازارۆف لەوپرسیارانە مانـدووبوو.پیرەمێرد لەسـەر کورسـییەك دانیشـت و تـەنیا هەنـدێجار پەنجەکانی دەتەقاندن.چەند جارێك چووە ناوباخ و وەکو پەیکەرێك لـەوێ ڕاوەستا.بەشـێوەیەك کەپیرەژن نەیبینێ دەچووە ژووری کوڕەکەی.بەڵام سەرەنجام ئاریناڤلاسـۆنا دەسـتیگرت و لێـی پرسی:

- ئاخر کوڕەکەم چ نەخۆشییەکی هەیە؟

پیرەمێرد وەخۆهاتەوەو ناچاربوو وەڵامێکی بداتەوەو بزەیەکی بێتێ بـەڵام یـەکجێ وەئاگـا هاتەوە کە لەجیاتی بزە، قاقاپێکەنی.

لە بەیانییەوە ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەدوای پزیشـکیدانارد‌بوو بـە پێویستیشـی دەزانـی ئـەو بابەتە لەگەڵ کوڕەکەی باسبکا تا نەکا پاشان نیگەران بێ.بازارۆف دوای کەمێك ماتـڵ بـوون بەرەولای باوکی وەرسووڕاو داوای ئاوی کرد ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ ئـاوی دایـەو دەستێکیشـی بەناوچەوانیدا هێنا.بازارۆف تای زۆربوو.دوای کەمێك بازارۆف بەدەنگێکی نووساو گوتی:

- باوکە، حاڵم زۆرخراپە.من ئەو نەخۆشـییەم گرتۆتـەوە، چـەند ڕۆژێکـی دیکـە بـەخاکم دەسپێری.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کە دەتگوت تێکڕابووە هاتەوە سەرخۆو گوتی:

- یۆگینی، ئەوەچ قسەیەکە دەیکەی؟ تۆ تەنیا سەرمات بووە.

- وازبێنە.پزیشکێکی وەك تۆ نابێ درۆبکا.هەموو نیشانەکان دیارو ڕوونن.تۆ خۆت ئـەوە باشتردەزانی.

- چ نیشانەیەك؟...یۆگینی گاڵتەمەكە.

بازارۆف قۆڵی هەڵكردو پەڵە سوورەكانی نیشانداو گوتی:

- ئەدی ئەوەچییە؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەرزی و گوتی:

- باوای دانێین...باوای دانێین...ئاوەدزكردن...

- پیسی خوێن.

- ڕەنگە نەخۆشی پەتایەك...

بازارۆف بەتووڕەییەوە قسەكەی باوكی بڕی و گوتی:

- خوێنی پیس.بۆچما ڕیشاڵەكانت لەبیر كردوون؟

- بەڵێ، هەرچی تۆ بیلێی.بەڵام بەهەرحاڵ چارەسەردەكرێی.

- ئەوە قسەی پووچە.بەڵام نیگەرانی من لە شتێكی دیكەیە.چاوەڕوانم نەدەكرد وازوو بمرم.ڕاستی پێشهاتێكی چاوەڕوان نەكراوبوو.تۆو دایكم دەست لە دووعاكردن هەڵبگرن و داوای یارمەتی بكەن...باشترین كات بۆ تاقیكردنەوە ئەوەیە.

دوای ئەوەی هەندێك ئاوی خواردەوە گوتی:

- تا ئێستا عەقڵم كاردەكا دەمەوێ تكایەكت لێبكەم...تا یەك دوو ڕۆژی دیكە عەقڵم لەكار دەكەوێ.ئێستاش باش نازانم ڕێك و ڕەوان قسەدەكەم یان قسە دەبزڕكێنم.كاتێك درێژببووم سەگەلی سوورم دەدیتن بەرەولام دەهاتن و تۆش ئاگاداریت دەكردم دەتگوت كەڵەشێری كێوی...وەك ئەوەی گێژبم...لە قسەكانم دەگەی؟

- یۆگینی دەتەوێ بلێی چی؟ لە قسەكانت دەگەم.

- گوتت بەدوای دكتۆرتدا ناردووە...ئەوە لەبەرخاتری دڵی خۆتە...ئێستاش لەبەر دڵی من پەیكێك بنێرە.

پیرەمێرد پرسی:

- بۆلای ئاركادی نیكۆلایۆڤیچ.

بازارۆف بەتێڕامانەوە پرسی:

- ئاركادی نیكۆلایۆڤیچ؟...نا كارم بەو كوڕیژگەیە نییە.ئەو ئێستا لەگەڵ مریشكان تێكەڵ بووە...نا، هێشتا دووچاری وڕێنەكردن نەبووم.كەسێك بۆلای ئادینسۆڤا

بنێره...دەیناسی ( بەئاماژەی سەر تێیگەیاند بەڵێ ) بلێ یۆگینی بازارۆف سلاوی لێدەکردی و گوتوویوتی لە سەرەمەرگدایە.ئایا ئەو چاکەیەم لەگەڵ دەکەی؟

- بێگومان ئەو کارەت بۆدەکەم...بەلاّم نابێ تۆ...بمری.یۆگینی ئەو کات من چی بکەم؟

- ئەوەیان نازانم...پەیکەکە بنێره.

- هەرئێستا دەینێرم.نامەکەش بۆخۆم دەینووسم.

- نامـــــە پێویســـــت ناکا.تــــەنیا بلـــــێ ســــــلاوی پێگەیانـــــدووی...دووبارە سەگەکان...زۆرسەیرە.دەمەوێ بیرم لەمەرگ چڕکەمەوە بەلاّم تەنیا پەڵەیەك دەبینم.

بازارۆف دووبارە ڕووی لەدیوارکردەوە.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لـە ژوورەکـە دەرکـەوت و چـووە ژووری هاوسەرەکەی و لەبەرامبەر وێنەی پیرۆز بەچۆکداهات و گوتی:

- دووعابکە، ئارینا.کوڕەکەمان لەسەرەمەرگدایە.دووعابکە.

*　　*　　*

هەمان دکتۆری کە دەرمانی نۆشاتری پێنەبوو هات و گوتی ئێستا واباشە لە چـاوەڕوانیدا بمێنێتەوەو گوتی هیوادارە نەخۆشەکە چاکبکاتەوە.

بازارۆف پرسی:

- ئایا تا ئێستا کەسێکت دیتووە لە حاڵی مندابووبێ و نەچووبێتە ئەودنیا؟

لەناکاو پێچکەی مێزێك کە لەتەنیشـت نیوتەختەکـەبوو بـە دەسـتییەوە گـرت و مێـزە قورسەکەی بەرزکردەوەو گوتی:

- هێزببینە! تەواوی هێزلێرەدایە بەلاّم مـەرگ چـاوەڕوانە...لانیکەم ئـەو پیرەمێـردە زۆر لەژیان ماندووببوو پاشان مردبوو، بەلاّم ئەدی من؟...مردن لەبیر بەرەوە.بەلاّم بەکەڵکی چـی دێ؟ مردن تۆ لەبیر ناباتەوە.

دوای کەمێك پرسی:

- دەنگی گریانی کێیە؟ دایکم؟ بێچارە ئێستا ئەوخواردنـە بەتامـە بداتـەکێ؟ بـەلاّم تـۆ ڤاسـیلی ئیڤـانۆڤیچ، دەڵێـی خـەمباری؟ بـۆ ئاسـوودەبوونت باشـترە فەیلەسـووف بـی.وەك فەیلەسووفە ڕەواقییەکان بە.بۆچما تۆ بەخۆت نانازی کە فەیلەسووفی؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەناڵینەوە هاواریکرد:

- من چ فەیلەسووفێکم؟
فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتنەخوار.

* * *

سات لەدوای سات حالّی بازارۆف خراپتردەبوو.نەخۆشییەکە بەخێرایی تەشەنەی دەکرد.بازارۆف هێشتا هۆشی لەسەرخۆی بوو دەیزانی دەورووبەری دەلّێن چی.هێشتا بەرەنگاری دەکرد...دەستەکانی خڕکردبوونەوەو لەبن لێوانەوە دەیگوت:
- نامەوێ وڕێنان بکەم، ئەوەچ قسەیەکی بێ مانایە.
دەستبەجێ لێی زیادکرد:
- دە لەهەشتان دەکاتە...
ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ وەك شێتان دەهات و دەچوو دەمنا دەمێك پێشنیارێکی تازەی بۆ چارەسەرکردنی دەکرد.لێکدا لێکدا قاچی کوڕەکەی دادەپۆشی و بەدژوارییەوە فەرماتیدەدا:
- دەبێ لەمەلافەیەکی خاوی وەربگرین...دەبێ بچینەسەرێ...بای لەزگی کەن...خوێنی بگرن.
دکتۆریش کە بەتکا کانی پیرەمێردەوە تێمابوو قسەکانی پەسەنددەکرد.بۆ نەخۆشەکە داوای ئاولیمۆی دەکردو بۆخۆیشی هەندێجار سەبیلەو هەندێجاریش داوای ڤۆدکای دەکرد.
ئاریناڤلاسۆنا لەسەر کورسییەکی بچوك لە پەنا دەرگا دانیشتبوو تەنیا جارجار بۆ دووعاکردن دەڕۆیشت و زۆر زووش دەگەڕایەوە. ڕۆژی پێشێ ئاوێنە لەدەستی بەربۆوەو شکا ئەوەشی وەکو هەمیشە بەنیشانەی بەدبەختی لێك دایەوەو کەسیش نەیتوانیبوو دلّی بداتەوە.تیمۆڤیچ یان نادربوو بۆ مالّی ئادینسۆڤا.
بازارۆف شەوێکی سەخت و دژواری تێپەڕاند...تا یەکی زۆر ئازاری دەدا.بەیانی کەمێك باشتربوو داوای لە دایکی کرد سەری بۆ شانەبکات.دوای دەست ماچکردنی دووقوم چای خواردەوە.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کەمێك ورەی هاتەوەبەرو گوتی:
- خودایە هەزارجار شوکر، تەنگژەکە تێپەڕی.
بازارۆف بزەیەکی تالّی هاتێ و گوتی:

- بنیادەم بوونەوەرێکی سەیرە.وشەیەك پەیدادەکاو دڵــی خــۆی پێخــۆش دەکا.مرۆڤــەکان چەندە گرنگی بە وشەدەدەن.ئەگەر بەکەسێك بڵێی گێل و لێشــی نــەدەی  واش لێــت نیگــەران دەبیّ.بەلاّم ئەگەر بڵێی تۆ ئاقڵی و پارەشی نەدەیەی واش لێت مەمنوونە.

ئــەو وتەکورتــە، ڤاســیلی ئیڤانۆڤیچــی بــەیادی تانــەو تەشــەرەکانی ڕابــردوو هێنایــەوەو خۆشحاڵی کرد لەکاتێکدا چەپڵەی لێدەدا هاواریکرد:

- ئافەرین! ئافەرین! هەربژی!

بازارۆف بزەیەکی خەمناکی هاتیّ و پرسی:

- بەڕای تۆ تەنگژنکە تێپەڕیوە یان تازە  دەستپێدەکات؟

- ئەوەی دەیبینم و مایەی خۆشحاڵیە، باشبوونی تۆیە.

- زۆرباشە، خۆشحالّ بوون زیان بەکەس ناگەیەنیّ.بەلاّم بابزانم قاسیدت ناردووە یان نا؟

- دیارە کەناردوومە.؟

*          *          *

باشبوونی بازارۆف کاتی و کەم بوو.دووبارە نەخۆشییەکە تینی هێنایەوە.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لە خوارپێی کوڕەکەی دانیشت.ئازاری گیان کێشان پیرەمێردی ئازاردەدا.چەند جارێك ویســتی قسە بکا بەلاّم نەیتوانی، سەرەنجام گوتی:

- یۆگینی، کوڕم، ئازیزەکەم.

ئەو بانگ کردنە کاری خۆیانکرد...یۆگینی بەرەولای باوکی وەرسووڕا.وەك ئــەوەی بیــەویّ خۆی لەژێر پاڵەپەستۆیەکی گران ئاسوودە بکات:

- دەڵیّ چی باوکە؟

- یۆگینی!...

ڤاسیلی ئیڤــانۆڤیچ لەســەر زەوی چــۆکی دادا.بــازارۆف چــاوەکانی لێــك نــابوون و ئــەوی نەدەدیت.

- کوڕەکەم، ئیشاڵلاّ حاڵت باشترە.تۆ چاك دەبیەوە.لەبەرخاتری دڵی مــن و دایکــت وەرەو ئەرکی ئاینیت بەجیّ بگەیەنە...خوایەگیان چۆن بتوانم قســەیەکی وابکەم...ترســناکە...بەلاّم یۆگینی بۆ ئەودنیا...بیری لێبکەوە...

پیرەمێرد لە درێژەوی قسەکانی وەستا ڕووخساری بازارۆف ئەگەرچی تا ئێستا چاوی لێك نابوو، حاڵەتێکی سەیری بەخۆوەگرت و گوتی:

- ئەگەر ئەوە دڵخۆشت دەکا قسەیەکم نییە.بەلاّم هێشتا زوویە.بۆخۆت نەتگوت کە حاڵی من ڕوولەچاکبوونە.

- بەڵێ، یۆگینی.بەلاّم ئەو کارە بۆ ڕەزای خودایەو ئەگەر ئەرکەکەت ئەنجامبدەی...

بازارۆف هاتە ناو قسەکانی باوکی و گوتی:

- نا، چاوەڕوان دەکەم.ئەگەرچی دەشزانم تەنگژەکە تازە دەستی پێکردووە.ئەگەر من و تۆش بەهەڵەچووبین...بۆ بێهۆشەکان داوای لێخۆشبوون بکەین.

- یۆگینی، ئاخرشتی وا چۆندەکرێ؟

- من چاوەڕن دەبم.ئێستاش دەمەوێ بنووم کاتم مەگرە.

دوای ئەوە ڕووی بەرەودیوار وەرگێڕا.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەسەر کورسییەکەی دانیشتەوە.دەستی خستە ژێرچەناگەی و دەستیکرد بەکرۆشتنی پەنجەکانی...لەناکاو لەو بێدەنگییەی ئاواییدا گوێی لەدەنگی چەرخی گالیسکەیەك بوو...ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ غاریدایە لای پەنجەرەکە.گالیسکەیەکی دووکەسی کە چوارئەسپ ڕایان دەکێشا گەیشتە بەردەرگا.پیرەمێرد بێئەوەی بزانێ چی دەکات بەخۆشحاڵییەوە دەرپەڕی.خزمەتکارێك بەجلو بەرگی تایبەتیەوە دەرگاکەی کردەوە.ژنێك کە پەچەیەکی ڕەشی بەردابۆوە و پاڵتۆیەکی تەنکی لەبەردابوو لە گالیسکەکە هاتەخوارو گوتی:

- من ئادینسۆڤام.یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ زیندوویە؟ تۆ باوکی ئەوی؟ دکتۆرێکم لەگەڵ خۆم هێناوە.

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ لەخۆڕا هاوریکرد:

- فرشتە...فریشتە!

دەستیگرت و لە کاتێکدا کە دەلەرزی ماچی کرد.لەو بەینەدا ئەو دکتۆرەی کە لەگەڵ ئاناسرگیۆنا هاتبوو بە هێواشی لە گالیسکەکە دابەزی.

- بەڵێ، یۆگینی هێشتا زیندوویەو ئێستا نەجاتی دەبێ.ئارینا، ئارینا، فریشتەیەك لە ئاسمانەوە هاتۆتە لای ئێمە...

پیرەژنیش غاریداو گوتی:

- چی بووە؟

بێئەوەی هیچ شتێك تێبگا لەبەرپێی ئاناسرگیۆنا چۆکی داداو دەستیکرد بە ماچکردنی کراسەکەی.ئاناسرگیۆنا بەپەلە گوتی:

- چیدەکەی؟ تکادەکەم هەستەوە...

بەلاّم ئاریناڤلاسۆنا گوێی لەو قسانە نەبوو و ئیشی خۆیدەکرد ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچیش لێکدا لێکدا هاواریدەکرد:

- فریشتە...فریشتە.

سەرەنجام دکتۆری تازەهاتوو کە تووڕە دەهاتە بەرچاو سەرەتا بەئەلّمانی و پاشانیش بەڕووسییەکی شەق و شڕپرسی:

- نەخۆش لەکوێیە؟

ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ هاتەوەسەرخۆ و گوتی:

- لێرەیە، بەدوامداوەرە.

پاشان بەئەلّمانی لێی زیادکرد:

- لێرەیە هاوکاری خۆشەویست.

دکتۆری ئەلّمانی پێی سەیربوو بزەیەکی هاتێ.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بردیەلای نەخۆش و پاشان سەری بەگوێی بازارۆفەوەناو گوتی:

- ئاناسرگیۆناو دکتۆرەکەی لێرەن.

بازارۆف چاوی هەلّێنان و گوتی:

- لێرەیە...دەمەوێ بیبینم.

- یۆگینی، دەیبینی بەلاّم باشتروایە پێشتر دکتۆر بتبینێ.باسی نەخۆشیەکەتم بۆ کردووە چونکە سیدرۆ سیدرۆڤیچ (دکتۆری خۆمالّی) ڕۆیشتووە.پاشان لەگەلّ ئەویش ڕاوێژدەکەم.

بازارۆف سەیرێکی دکتۆرە ئەلّمانەکەی کردو گوتی:

- زۆرباشە قسەی خۆت بکە بەلاّم بەلاتینی نا، چونکە مانای خەریکەدەمرێ بەلاتینی تێدەگەم.

دکتۆر ڕووی لە ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ کردو بەئەلّمانی لێی پرسی:

- زمانی ئەلّمانیش دەزانێ؟...

پیرەمێرد هاتە ناو قسەکانی و سەرەتا بەئەڵمانی و پاشان بەڕووسی گوتی:

- واباشە بەڕووسی قسەبکەین.

دکتۆری ئەڵمانی کەمێك ماتڵ بوو دواتر بەڕووسیەکی شەق و شڕگوتی:

- ئاوا...زۆرباشە.

پرس و ڕاوێژی پزیشکی دەستپێکرد.

*   *   *

نیو کاتژمێر دواتر ئاناسرگیۆنا لەگەڵ ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ هاتنە ژوور.دکتۆری ئەڵمانی لەسەرخۆ پێیگوت کە ئومێدێکی بە چاکبوونەوەی نەخۆشەکە نییە.ئانا سەیرێکی بازارۆفی کردو لەهەمان شوێن وشکبوو.ڕووخسارە نیوە گیانەکەی بازارۆف بەو چاوانەی کە لێیدەڕوانی هێزی جوڵەی لەئانا بریڕیبوو.ئانا بەسەر سامییەوە بیریکردەوە:

- ئەگەر بەڕاستی بازارۆفم خۆشویستبا حەتمەن ئێستا هەستێکی دیکەم دەبوو.

بازارۆف بەدژواریەوە گوتی:

- زۆرسوپاست دەکەم...هەرگیز چاوەڕوانی شتێکی وام لێنەدەکردی، کارێکی زۆرباشتکرد...ئەوەش قەول و قەرارەکەی کە پێکەوە دابوومان تا جارێکی دیکەش یەکتری وەبینین.

- ئاناسرگیۆنا میهرەبانەکە...

بازارۆف ڕێگەی نەدا باوکی قسەکەی تەواوبکا.

- بەجێمانبێڵە باوکە...ئاناسرگیۆنا ئیزن دەدەن؟ وەك ئەوەی کە....

ئاماژەیکی بۆ لەشە نیوەگیانەکەی خۆیکرد.کاتێك ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ چووەدەر،بازارۆف درێژەیدایە:

- زۆرلێت مەمنوونم...کارێکی شاهانەتکرد.بیستوومە شاکانیش دەچنەسەردانی ئەو نەخۆشانەی لەسەرەمەرگدان.

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ هیوادارم کە...

- ئاناسرگیۆنا، خولڤوخۆ وەلانێ و وەرە ڕەکوڕاست قسەبکەین.هەتاوی تەمەنی من لەسەرگوێی سوانەیەو هیواداربوون کەڵکێکی نییە...هەرچەندە مەرگ گەمەیەکی کۆنە بەلاّم

بچێتەلای هەر کەسێك پێی تازەیە.تا ئێستا لێی نە ترساوم...دوای ئەوەش بێهۆشــی دێتــەلام و...دەمویست بڵێم...خۆشمدەویستی.هەرچەندە ئەو بابەتە لــەڕابردوودا بــێ مانابوو.ئێســتاش هەگیز ناتوانێ مانایەکی هەبێ.عەشق دەبێ وێنەو لەشــێکی هەبێ...لەشــی منــیش لــەحاڵی توانەوەدایە.باشترە بڵێم...تۆ زۆرباشی.ئێستاش کە ڕاوەستاوی زۆرجوانی...

ئاناسرگیۆنا لەرزی.بازارۆف گوتی:

- نــا، خــۆت نیگــەران مەکە.لێرەدانیشــە...لێم نزیــك مەکەوە...نەخۆشــییەکەم دەگوازرێتەوە.ئاناســرگیۆنا، لەســەر کورســییەك لــە تەنیشــت بــازارۆف دانیشــت.بازارۆف بەورتەورت گوتی:

- چــەندە گــەورەو بەخشندەی...چــەندە زووهاتی...بــەو هــەموو جوانییەوە...لــەو ژوورە نەفرەتییــە...خودا تەمــەن درێــژتان بکات...ئــەوە باشــترین نیعمەتــە...تا دەتــوانی بــژی و چێژوەربگرە...تەماشاکە ئەو کرمەپڵیشاوە هێشتاش دەیــەوێ بژیت.ئــەویش ئــاواتی هــەبوون وەکومن بیری دەکردەوە کە ڕۆژێك ئیشی گەورەدەکات و هەرگیزمەرگیش بەدوایدا نایەت.بەڵام ئێستا تــەواوی ئاواتــەکانی ئــەو پاڵەوانــە بــەمردن کۆتــایی دێت.ئەگەرچــی ئــەوە بابــەتێکی تایبەتییەو پەیوەندی بە کەسەوەنییە...لەگەڵ ئەوەشدا دادو پاڕانەوەناکەم.

بازارۆف بێدەنگ بوو دەســتی بــەدوای پەرداخــە ئاوەکــەدا دەگێڕا.ئاناســرگیۆنا بێئــەوەی دەستکێشەکەی لەدەست دەربێنێ،ئاوی دایە.بازارۆف درێژەیدایە:

- من لەبیر دەبەیتەوە...مردوو نــاتوانێ هــیچ هاوڕێیەتیــەك و دۆســتایەتییەکی لەگــەڵ زیندوودا هەبێ.باوکم پێتدەڵێ ڕووسیا پیاوێکی گەورەی لەدەســتداوە بــەڵام ئەوانــە هــەمووی قسەی پووچن..بەڵام پیرەمێرد با بە هەمان بڕوابمێنێتەوە...نابێ فرمێسکی پــێ بڕێــژی...دڵی دایکیشم بدەوە.مرۆڤی وا لەو دنیایە زۆرکەم دەستدەکەون...ڕووســیا چ پێویســتییەکی بــەمن هەیــە؟...نا هــەرگیز پێویســتی بــەمن نییە...کەواتــە پێویســتی بەکێیــە؟ بــە پــێڵاو دروو، بەخەیات...بەقەســـــاب...کە گۆشـــــت دەفرۆشێ...قەســـــاب...دەڵێی وڕێنـــــان دەکەم...ئێرەدارستانە...

بازارۆف دەستی لەسەر ناوچەوانیدانا.ئاناسرگیۆنا شۆڕبۆوە سەری و گوتی:

- یۆگینی ڤاسیلیۆڤیچ.لێرەم.

بازارۆف دەستیگرت، کەمێك ڕاست بۆوەو هاوایکرد:

- خوداحافیز.

تیشکێك لە چاوەکانیدا دەرکەوت:

- خوداحافیز...ئەوجارە ماچم نەکردی...چرایەکە فولێبکە باوەکوژێ.

ئاناسرگیۆنا ناوچەوانی ماچ کرد.بازارۆف سەری خستەوە سەر سەرینەکەو گوتی:

- ئەوەندەم بەسە...ئێستاش تاریکی ئەنگوستەچاو...

ئاناسرگیۆنا بێ هەست و چرپە چووەدەر.ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ پرسی:

- حاڵی چۆنە؟

ئانا بە دژواریەوە گوتی:

- خەوت.

تەقدیر چۆن بوو کە ئیدی بازارۆف هەڵنەستێتەوە.شەوێ بە تەواوی بێهۆشبوو بەیانیش مرد.باوکە ئەلەکسی قەشەی ئاوایی ڕێورەسمی کفن و دفنی بەجێهێنا.کاتێك کە ڕۆنی پیرۆزیان بەسەرداکرد بازارۆف چاوێکی هەڵێناو دەتگوت لە دیتنی قەشەو ئەو مەشخەڵە پڕلە دووکەڵ و ئەومۆمانەی بەردەم وێنەکە، حاڵەتێکی نەفرەتی و بێزاری کەوتۆتە سەر ڕووخساری.

کاتێك بازارۆف مرد دەنگی شیوەن و ناڵەی دانیشتوانی ماڵێ بەرزبۆوە، ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ بەمشتەکۆڵەو ڕووخساری شێواو یەوە هاواریکرد:

- کفردەکەم...بەڵێ، کفردەکەم.

ئاریناڤلاسۆنا بەچاوی پڕلە فرمێسکەوە دەستی لەملی مێردەکەی کردوو هەردووکیان هاتنە سووجدە.دواتر ئانفیسیا بۆ خەڵکی گێڕایەوە کە:

- ئەوان لە ناوەڕاستی ژوورەکەو لەپەنایەك ڕاوەستان و وەکو مەڕان لەگەرمای نیوەڕۆدا، سەریان بەیەکەوە نابوو.

* * *

بەڵام گەرمای تاقەت پروکێنی نیوەڕۆ تێدەپەڕی و خۆر لە دوورەوە ئاوادەبێ و دواتریش شەودادێ کپ و بێدەنگ.ئەویش هەمان کاتە کە ئەوانەی ماندوون بخەون تا بەیانی ببێتەوە.

## (٢٨)

**شەش مانگ تێپەڕی:**

زستانی سپی بە بێدەنگیەکی تەواو، هەمووشوێنێکی بە بەفرو هەوای ساردوە داگرتبوو.دارەکان توێژاڵێکی تەنکی بەفریان لەسەر کەوتبوو.لەسەر لولەسۆپاکان هەودای دووکەڵ دەبینرا.هالاوێکی گەرم لەو دەرگایانەی کە دەکرانەوە دەهاتنەدەر ئەسپەکان توونتر دەڕۆیشتن تاخۆیان گەرم کەنەوە.ئێوارەیەکی مانگی کانوونی دووەم کە هەواساردتر دەبوو زەردەی خۆر بەرەوئاوادەبوون دەچوو.لە پەنجەرەی ماڵەکانی مارینۆ ڕووناکاییەك دیاربوو.پڕاکفیچ جلێکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو دەستکێشێکی سپی لە دەستکردبوو،مێزێکی حەوت کەسی دەڕازاندەوە.

هەفتەی ڕابردوو دوو زەماوەندی بێ هەڵلاو هەنگامە لەنێوان فنیچکاو نیگۆلای پترۆڤیچ لەلایەك و ئارکادی و کاتیا لەلایەکی دیکەوە لە کڵێسایەکی بچووکی گوندەکەیان بەڕێوەچووبوو.ئەمڕۆش نیکۆلای پترۆڤیچ بەشانازی براکەیەوە پاڤێل کە دەچوو بۆ مۆسکۆ بۆ ئەنجامدانی هەندێك لە کارەکانی میوانییەکی کەم و پووختی ڕێکخست.ئاناسرگیۆناش دوای زەماوەندەکە،چەند دیاریەکی گرانبەهای دایە بوك و زاواو چووە مۆسکۆ.لە کاتژمێرسێدا هەموان لە دەوری مێزەکە کۆبوونەوە.میتیاشیان هێنابوو.ماوەیەکبوو پەرستارێکی تایبەتیان بۆگرتبوو کە دەسماڵێکی سپی لەسەردەنا.

پاڤێل پترۆڤیچ لەنێوان فنیچکاو کاتیا دانیشتبوو هەریەك لە هاوسەرە کانیش لەپەنایەك دانیشتبوون.دۆستە کانمان لەو بەینەدا زۆر گۆڕابوون.دەتگوت هەمووجوانترو گەنجتربوونەوە.لەو نێوەشدا تەنیا پاڤێل پترۆڤیچ بوو کە لەجاران کزولاوازتر دەهاتە بەرچاو کە ئەوەش حاڵەتێکی بەشان و شکۆی دەدایە.

...فنیچکاش گۆڕابوو...جلو بەرگێگی ئاوریشمی جوانی لەبەر کردبوو و تیتوە پەرۆیەکی مەخمەری لە کەزیەکانی بەستبوو زنجیرێکی زێڕی لەملدابوو بەهەمان حاڵەت ئەو شکۆیەی کە

دەبێ خـانمێکی وەکـو ئـەو هـەیبێ تێیـدا بەدیدەکرا.هەرئـەوەش بینـەری والێـدەکرد تـا لـە بەرامبەریدا ڕێزبنوێنێ.خەندەکەی وابوو کە دەتگوت بە ئەدەبێکی تایبەتەوە داوای لێبـووردن دەکات.نەك هەرئەو حازریانیش بەخەنـدەکانیان وایاندەگوت.ئەگەرچـی خـەمگین بـوون بـەلاّم خۆشبەختی و کامـەرانیان بەتـەواوی وجـودەوە هەسـت پێدەکرد.هـەر کەسـەو لەبەرخۆیـەوە خزمەتیدەکردو دەتگوت هەموو دەیانەوێ لەوشانۆیە بەباشی ڕۆڵی خۆیان بگێڕن.کاتیا ئارامتر لە ئامادەبوان لە دەورووبەری خۆیدەڕوانی.نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەو ماوە کورتەدا دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵکەوتبوو تا بووکەکەی لە دڵەوەخۆشبوێ.دوای نیوەڕۆ، نیکۆلاّی پترۆڤیچ لەشوێنی خۆی هەستاو لە کاتێکدا پەرداخە شەرابەکەی بۆ پاڤێڵ پترۆڤیچ ڕادەداشت گوتی:

- برای بەڕێزم، تۆ بەجێماندێڵی...هیوادارم ئەوجیابوونـەوەت زۆر درێـژە نەکێشـێ.بەلاّم نازانم لەو ساتەدا...عەیبەکە لەوەدایە کە ئێمـە زۆر شـارەزانین وتاربخوێنینـەوە.ئارکادی تـۆ شتێك بڵێ.

- باوکە، بمبوورە.من هیچم بۆ ناگوترێ.

- زۆرباشە، بۆخۆم دەیڵێم ،کاکەگیان، ئیزن بفـەرموو لەباوەشـت بگـرم و لـەناخی دڵـەوە داوای سەرکەوتنت بۆبکەم.هیوادارم هەرچی زووترە بگەڕێتەوە.

پاڤێڵ پترۆڤیچ لەگەڵ هەموان تەنانەت لەگەڵ میتیاش یەکتریان ماچـکرد.لەگەڵ فنیچـکا جگەلەوەی ماچیکرد، دەستیشی لەناو دەستگرت و ماچیکردو لەحاڵێکدا پەرداخە شەرابەکەی لە لێوی نزیك دەکردەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

- بەخۆشی هەمووتان، هاوڕێیانی ئازیز.

بە هێمنی و بەشێوەیەك دەورووبەر گوێیان لێنەبێ بە ئینگلیزی گوتی:

- خوداحافیز.

هەمووومات بوون.کاتیا بەگوێی هاوسەرەکەیدا چپاند:

- بە یادی بازارۆف.

پەرداخەکەی خۆی لەپەرداخەکەی ئـەودا.ئارکادی لـەوەلاّمی کاتیـادا دەسـتەکانی لـەناو دەستگرتن بەلاّم زاتی نەکرد ڕستەکەی ئەو بەدەنگی بەرز دووپات کاتەوە.

* * *

ئیدی بابـەتێکی گـرنگ نەماوەتەوە...بـەلاّم ڕەنگـە خوێنــەرەکانمان بیانــەوێ بـزانن کـە چارەنووسی هەریەك لە پاڵەوانەکانی چیرۆکەکەمان چ کۆتاییــەکیان هەبوو.ئێمــە دەمانــەوێ هەســتی وردبینــی ئــەوان ڕازی بکەین.ئاناسـرگیۆنا بــەو دووربینیــەی خــۆی لەگــەڵ یــەکێك لەوپیاوانەی کە لەئایندەدا ڕۆڵێکی گرنگیان لە ڕووسیادا هــەبوو زەماوەنـدی کرد.مێردەکـەی یاساناســــێکی گــــەورەبوو خــــاوەنی ئەندێشــــەیەکی قوڵبوو،ئیرادەیــــەکی پتــــەوو ڕاوێژخۆشبوو.مێردەکەی گەنج و جوان بوو کە لە ئارامی و هێمنیدا هیچـی لـە هاوسـەرەکەی کەمترنەبوو ئەوەش بووە هۆی ئـەوەی لـە کێشـەی ژیـانی هاوبەشـیاندا بگەنەشـتێك بـەناوی عـەشق.

پووری ئاناسرگیۆنا یانی شازادەخانم...کۆچی دواییکردو هەر لە ڕۆژی مردنیشیدا تـەواوی ئەوانەی دەیانناسی، شازادەیان لەبیرچۆوە.کیرسانۆفەکانیش لە مارینۆ مانەوەو ئیش و کاریـان بەرەوپێش دەچوو.ئارکادی وەك ئاغایەکی گەورەو ملّکـدار دەرکـەوت و قـازانجێکی زۆری لـە زەویــەکانی دەکرد.نیکـۆلای پترۆڤیچـیش بــووە ئەنجوومــەنی گونـدو لــەوێ ئــەرکی خـۆی بەجێدەگەیاند.بەردەوام سەری لەشوێنەکان دەدا، هەرجوتیارێکی دەستکەوتبا بە درێژی قسەی لەگەڵ دەکرد، چونکە باوەڕی وابوو دەبێ جوتیارەکان حاڵی بکـرێن، یـانی ئـەو بابەتـە دەبـێ چەندینجار بۆیان باسبکەی تا باش وەریدەگرن.بـەلاّم بەشـێوەیەکی گشـتی هـیچ دەسـتە لـەو خانەدانانە چ ئەوانەی باوەڕیان بە ئـاڵوگۆڕو پێشـکەوتن هــەبوو و چ ئەوانــەش کـە باوەڕیـان بەسیستەمی ئێسـتا هــەبوو لێـی ناڕازیبوون.چـونکە لەڕوانگـەی هــەردوو دەسـتەوە لەگـەڵ جوتیارەکان زیاد لەپێویست نەرمی دەنوێنێ.

کاتیاش کوڕێکی بوو ناوی لێنا کولیا.میتیاش فێـرە ڕۆیشـتن و قسـەکردن ببوو.فنیچـکا دوای کوڕەکـەی و مێردەکـەی، هـیچ کەسـێکی بـە ئەنـدازەی بووکەکـەی خۆشنەدەویسـت و کاتێکیش کاتیا لە پشتی پیانۆ دادەنیشت، ئامادەبوو تەواوی ڕۆژ لەپەنای دانیشێ و بەچـرکە لێی جیانەبێتەوە.پیووتەریش: بەتەواوی خۆی لەبیرچووبۆوەو هەوڵیدەدا وەك خانەدانێك بـژی و وەك ئەوان قسەبکا بــەلاّم هێنـدە لــەو کـارەدا ســەرکەوتوو نەبوو.ئــەویش زەماوەنـدی کـردو هاوسەرەکەی کە کچی کابرایەکی باخەوانی شاربوو باروبارخانەیەکی باشی بۆ ماڵەمێردەکـەی هێنا.ژنەکەی بەر لەشووکردنی بە پیووتــەر دووخــوازبێنی ڕەتکردبوونــەوە لەبەرئــەوەی ئــەوان

کاتژمێری دەستیان نەبوو.بەڵام پیووتـەر سـەرەڕای سـەعاتی دەسـتی، پـێلاوی بریقەداریشـی هەبوو.

لە سەیرانگای ( تراس برۆڵ) یەکێك لە سەیرانگاکانی دەرسەدن، لـە نێـوان کاتـژمێر دوو تاچواری نیوەڕۆ، یانی لە باشترین کاتی گەڕان و سەیراندا، ئێوە بەردەوام تووشی پیرەمێردێکی قژسپی دەبن کەتووشی نەخۆشی دەردەشا (نقرس) بووە.ئـەو هێشـتا هەرجوانـەو هـەروا جلـو بەرگی جوان لەبـەر دەکا.ڕەفتـارو هەڵسـوکەوتی لـەو کاتەشـدا خانـەدانی و گـەورەیی ئـەو دەنوێنێ.ئەو کەسەش کێیە پاڤێڵ پترۆڤیچ بەهۆی تووشبوونی بەو نەخۆشـیەوە ناچـاربوو لـە مۆشکۆوە بچێتەئەڵمانیاو لـەو شـارە نیشـتەجێبێت.هاودەمەکانی یـا هـاووڵاتی ڕووسـین یـا خەڵکانی ئینگلیز.هەرچەندە ئینگلیزەکـان لـە پاشـەملەدەڵێن ڕەفتارەکـانی بێزارکەرە،بـەڵام هەموویێیان وایە جوامێرێکی ڕاستەقینەیە.هەڵسوکەوتی پاڤێڵ پترۆڤیچ لەگەڵ هاووڵاتییـە ڕووسەکان خۆمانەترە.هەتا هەندێجار قسـەی خۆشیشـیان لەگـەڵ دەکات.بـەڵام تـەواوی ئـەو هەڵسوکەوتانەی بەنەرم و نیانی و شێوازی تایبەتی خۆیەوە دەیکات.لایەنگیری ئیسلاو فیلییـە وا دەردەخا کە: هەروا پابەندی داب و ڕەسمی خانەدانییەتی ڕووسیایە.لەکاتی خوێندنەوە هـیچ بابەتێك کە بەڕووسی نووسرابێ نایخوێنێتەوە .لەسەرمێزەکەی ژێرجگەرەیەکی زیوی لەشـێوەی پێلاوی جوتیارێکی ڕوسی دانراوە.ئەوانەی لە ڕووسیاوە دێنە ئەوشارە، زۆر بـە دەورووی بەریـدا دێن و دەچن.ماتۆی ئیلیچ کولیازین کە یەکێك لە نـەیارانی دەوڵـەتی ڕوسـیایە کـە گەیشـتە دەرسدن بەڕێزەوە سەردانیکرد.خەڵکی شاری لەگەڵ ئەوەی هاموو شۆیەکی ئـەو تۆیـان لەگـەڵ پاڤێڵ پترۆڤیچ نەبوو، ڕێزێکی تایبەتیان لێدەنا.لە شـاری کـەس نـاتوانێ بـە خێرایـی ڕێـزدار کیرسانۆف بلیتی شانۆی کلیسای دەربار وەربگرێ...تا ئەوجێگایەی بۆی دەلوێ لە خێروچـاکە خۆنابوێرێ.بەو تەمەنەوە هێشتاش سەربەگێچەڵە.لەخۆڕانییە کـە نازنـاوی (شـێری نێـر) یـان لێنابوو.بـەڵام واش ژیـان هێنـدە بۆئـەو ئاسـان نـەبوو...ژیانی لـەوە سـەختتربوو کـە بـیری لێدەکردەوە...ئەو بابەتە کاتێك دەتتوانی بیزانی کە لـە گۆشـەی کلیسـایەکی ڕووسـی پـاڵی وەدیواریـداوەو لەگـژفکران ڕاچـووە.لەوحاڵەتەدا بـێ هەسـت و خووسـت دەبـوو لێـوی خـۆی دەکرۆشت.کاتێکیش وەخۆ دەهاتەوە نیشانەی خاچێکی لەسەرسینەی خۆی دەکێشا.

کوکشیناش لە هایدلبێرگەو زەمانێك کە دەیویست سرووشـت بخـوێنێ لـە حـاڵی حـازردا خەریکی خوێندنی بیناسازییەو وەکـو بۆخـۆی باسـیدەکا تـا ئێسـتا چـەند یاسـایەکی نـوێی

دۆزیوەتەوە.وەك هەمیشــە لەگــەڵ قوتابیــانی زانکــۆ ی ڕووس زۆر تێکەڵــە.قوتابیانی زانکــۆ لەوشارەدا کە ژمارەیان یەکجار زۆرەو ئەوان لە ڕۆژانــی یەکــەمی چــوونیان بــۆ پۆلــەکان لــەو ئامادەکاریەی کــە هەیانــە مامۆســتا کانیــان سەرســام دەکەن.بــەڵام دوای ماوەیــەك هــەمان مامۆستاکان لە بێ توانایی و سستیان لە دەرسەکانیان دووچاری واق وڕمان دەکەن.

سیتنیکۆفیش لەگەڵ دووسێ کەسی کیمیــازان بۆتــە هاودەم.کیمــازانێکی وا کــە نــاتوانن ئۆکسیجن لە هایدرۆجین جیاکەنەوەو لەگــەڵ ئەوەشــدا بەزانســتی خۆیــان زۆر دەنازن.ئــەویش هیــوادارە ڕۆژێــك لــە دەســتەی زانایــانی کیمــایی حســاب بکرێ.لــە پترۆســبۆرگەو پێیوایــە درێژەپێدەری ڕێگای بازارۆفە.دەڵێن چەند ڕۆژ لەمەوبەر لەگەڵ کەسێك بەشەڕ هاتووە، دواتر لە گۆڤــارێکی بێنــاو لــە وتارێکــدا نوســیبووی بەرامبەرەکــەی کەســێکی ترســنۆك بــوو و ئــەو ڕووداوەشی بە ( یەك گەمە) نــاو هێنابوو.بــاوکی هێشــتاش بەســەریدا زاڵــە هاوسەرەکەشــی وەکوجاران بە گێل و ئەدیبی دەزانێ.

لە یەکێك لە ناوچە دوورە دەستەکانی ڕووسیە گۆڕستانێك هەیە کە جیاوازیــەکی ئــەوتۆی لەگەڵ باقی گۆڕستانەکانی دیکەدا نییە.قوڵکــەکانی دەوروبــەری گۆڕســتانەخەمگینەکە زۆر لەمێژە بەگژوگیا پڕبوونەوە.خاچــە دارینــەکان ڕزیــون و کڵاوەکــانی کــە ڕۆژگارێــك ڕەنــگ و ڕوویەکیان هەبوو لارببوونەوە.تاتە بەردەکانی سەرگۆڕەکان هەموویان جوڵابوون.چەند دارێکــی بێ گەڵا سێبەرێکی کەمیان هەیە و مێگەلە مەڕەکانی ئەو دەوروبەرە کردوویانەتە لەوەڕگای خۆیان.

لە نێوئەو گۆڕانەدا گۆڕێك هەیە کە تا ئێستا وەکوخۆی ماوە.مێگەلەکان نــای پەســتنەوە تەنیا باڵندەکان لە سەری دەنیشنەوەو ســپێدان لێــی دەجریوێنن.نەردەیــەکی ئاســن بــەدەوری گۆڕەکەدا کێشراوەو دوو نەمامی سنەوبەریش لە پەنای چێنراون.لەو گوندەی کە لە دەوروبەری گۆڕستانەکەبوو جار ناجارێك، پیرەمێردێك و پیرەژنێکــی پەککەوتــە دێنەســەر ئەوگۆڕە.ژنــەو مێردە پیرە لە حاڵێکدا دەستیان لە ناودەســتی یەکتردایــە تــا نزیــك نــەردەکان دێــن و لــەوێ بەچۆکدادێن و فرمێسك هەڵــدەوەرێنن و هەنــدێجار لــەو بــەردەوە ڕادەمێــنن کــە کوڕەکــەیان لەژێرویدا ڕاکشاوە.دواتر چەند قسەیەك پێکەوەدەکەن، تــەپوتۆزی ســەرگۆڕەکە پاکدەکەنــەوە، نەمامە سنەوبەرەکان ڕاستدەکەنەوەو دەستدەکەن بــە دووعاخوێنــدن...دەڵێی ئەوانــە توانــای

جیابوونەوەیان لەو شوێنەدا نییە.ئـەرێ بەڕاسـتی ئەوهـەموو ئەشـك و ئەوهـەموو دووعایـە بەرهەمێکیان هەیە؟ یان عەشق، عەشقی پیرۆزو بەردەوام، هێزو وزەنین؟

نا، هەرچەندە کە دڵی شاردراوە لەژێرخاکدابن، ئەگـەر تاوانبـارو هەوەسـبازیش بـن واش گوڵی جوانیان لەسەر دەڕوێن بەنیگای خۆیان نەك تەنیا بۆ ئارامی سرووشت دەڕوانن قسەش لە خۆ بەدەستەوەدان و ئاشتی ئەبەدی و ژیانی بەردەوام دەکەن.